پرۆفیسۆر مستەفا زەلمی

دوو کتێب لە بەرگێکدا

# مافی ئازادی
## لەقورئانی پیرۆزدا

# مافی مرۆڤ و گەرەنتییەکانی
## لە ئیسلامدا



وەرگێڕانی: رێدار رەئوف ئەحمەد - عومەر عەلی غەفور

# مافی ئازادی
# لەقورئانی پیرۆزدا

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَـٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَـٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ﴾

سورة البقرة/٢٢٩

**(كلكم من ادم وادم من تراب لا فضل لعربي على اعجمي ولا لابيض على اسود إلا بالتقوى)**

المعجم الكبير للطبراني : ١٢\١٨ (برقم ١٦)

# ناوەرۆك

# پێشەكی

هەركەسێك لەئايەتەكانی قورئانی پـیرۆز رابمێنێت دەبينێـت كـەقورئانی پـیرۆز– لەسـەرەتايەوە تـا كۆتاييەكـەی– گيـانی چـاكەو خۆشەويسـتی لـەخۆ گرتـووەو پێگەيشـتوانەيەو داوای زانسـتو كـارو ئـازادیو يەكسـانیو دادپـەروەریو سـۆزو رێنمايیو راستیو چاكەويستیو لەخۆبردوويیو بەخشينو ئەو باشێتيانەی تـر دەكـات كە لە مافە مرۆييەكانەو پێويستە لەمرۆڤدا رەنگ بداتەوەو پەيوەست بێت پێيانـەوە، هـەروەها ئايەتـەكانی قورئـان رێگـری لەنـەزانیو نـەمافیو تەمبـەڵیو قـۆرغكردنو بەبەندەكردنو بەرەلايیو ستەمو لوت بەرزیو جياكاریو خۆبەگەورە گرتنو رەزيلیو ئەو خراپەكاريانەی تر دەكات كەمرۆڤ خۆی دوور بگرێت لێيان.

خوای گەورە مرۆڤەكانی لەيەك جۆر قوڕ دروست كـردووەو، بـۆ ئـەوەی دروسـت نەكردوون پێرێكيان بێ رێز بكاتو پێرەكەی تريان رێـز لێبگرێـت، بـەڵكو هـەموويانی بەتێكڕايی رێز لێ گرتووە، لەو رێزلێگرتنەدا میللەتێكی بەسەر میللەتێكی تردا، يـاخود رەگەزێكی بەسەر رەگەزێكی تردا، يان تاكێكی بەسەر تاكێكی تردا رێزلێگیراو تايبەت نـەكردووە، مەگـەر بەتـەقواو سـوودمەندی بێـت، لەمبارەيەشـەوە خـوای گـەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێت: ﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَـاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ...﴾[1] ، پەيوەنديیـە مرۆييـەكانيش

---

[1] سورة الحجرات \ ١٣.

هەموویان مافو پابەند بوونی بەرانبەر یەکە، هەر تاکێك مافێکی هەیە لەسەر بەرانبەر، لەهەمان کاتدا پابەندبوونێکی لەسەرە لەئاست بەرانبەرەکەیدا، هەر بۆیە بەیەکگەیشتنی مرۆڤەکان مافو پابەندی بەرانبەر یەکەو، مافی هەر کەسێکیش سپاردەیە لەئەستۆی پابەندکراودا، پێویستە لەسەری بەجێی بگەیەنێت بۆ خاوەن پابەندییەکە وەك بەجێهێنانی فەرمانی خوای گەورە: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا﴾[١].

## ماف (الحق):

وشەی ماف (الحق) بەچەندین واتا هاتووە، لەوانە: داد، راستگۆیی، پێویست (واجب)، چەسپاو، بەزۆریش وەك دژ بەواتای پوچەڵ (باطل) [٢] بەکاردێت، بەم واتایەش لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە: ﴿وَلاَ تَلْبِسُوا الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ﴾[٣].

لەفیقهی ئیسلامیو یاساشدا ماف بەزۆری وەك هاوشێوەی پابەند (التزام) بەکاردێت، وەك زاراوەش چەند پێناسەیەکی[٤] بۆکراوە کەئەمانەش بەدەرنین لەکەمو کورتیو ناڕۆشنی، پێشنیاردەکەم کەبەمجۆرە پێناسە بکرێت کەپلەیەکی شەرعییە کەخاوەنەکەی یاخود کەسێك لەبری لێی سوود مەند بێت، لەقورئانی پیرۆزیشدا (١٩٤)جار هاتووە، واتاکەشی بەپێی شوێنو مەبەست جیاوازە[٥]، یەکێك لەو واتایانە بەمانای قورئان هاتووە.

---

[١] سورة النساء \ ٥٨.

[٢] لسان العرب فصل الحاء حرف القاف.

[٣] سورة البقرة \٤٢ .

[٤] لەوانە: فەرمانێکە دەسەلمێنرێت، لەوانە پسپۆڕێتیە، یاخود بەرژەوەندییەکە کەبەپێی شەرع شایستەیە.

[٥] هەروەك لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿...وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلْحَقِّ لَمَّا جَاءَهُمْ...﴾(سبأ:٤٣) مەبەست لەحەق لەم ئایەتەدا قورئانە.

## ئازادی (الحریه):

وشەی ئازادی (الحریە) لەقورئانی پیرۆزدا نەهاتووە، بەڵکو بەم دەربڕینانە هاتووە:

أ. ئازاد (حر): ئەمەش پێچەوانەی کۆیلە (عبد)ە[1].

ب. ئازادکردن (تحریر): بریتیە لە ئازادکردنی کۆیلە[2].

ج. ئازادبوو (محرر): هەروەك خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿رَبِّ إِنِّي نَذَرْتُ لَكَ مَا فِي بَطْنِي مُحَرَّرًا...﴾[3].

(الحُرة) ئافرەتی ئازاد پێچەوانەی ئافرەتی کۆیلە (کەنیزەك)ەو کۆیەکەشی (حرائر)ەو، (الحریة) چاوگە، لەزاراوەشدا: بریتیە لەسەرپشك بوونی مرۆڤ لەئەنجامدانی کارێکدا ویستی لەسەر بوو بیکات ویستی لەسەر نەبوو ئەنجامی نەدات، بەڵام ئەو ئازادیەی کەخوای گەورە بەمرۆڤی بەخشیوە ئازادیەکی رەها نیە هەروەك لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە، بەڵکو لەزۆربەی مافو ئازادییەکاندا لایەنی پابەندبوون زاڵترە، ئازادی هەر تاکێك لەسەرەتای ئازادی بەرانبەرەکەیدا کۆتایی دێت، بگرە ناونیشانی هەندێك لەئازادییەکان بەماف لەروانگەی رێگەپێدانەوەیە، وەك ئازادی بیروڕا دەربڕینو ئازادی بیرکردنەوەو ئازادی کارکردنو ئازادی فێربوونو هاوشێوەی ئەوانە کەتێیاندا بەرژەوەندی گشتی باڵاتر بێت بەسەر بەرژەوەندی تایبەتیداو، سروشت (طابع)ی پابەندی تێیدا زاڵتر بێت.

---

[1] هەروەك لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالأُنثَى بِالأُنثَى...﴾(البقرة:١٧٨).

[2] هەروەك لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿...وَمَنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَأً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ...﴾ (النساء:٩٢).

[3] هەروەك لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿إِذْ قَالَتِ امْرَأَةُ عِمْرَانَ رَبِّ إِنِّي نَذَرْتُ لَكَ مَا فِي بَطْنِي مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّي إِنَّكَ أَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ (ال عمران:٣٥).

وەك پێشتر باسمان کرد هەموو ئەوەی لەقورئاندا هاتووەو خوای گەورە بڕیاری لەسەر داوە مافەکانو ئازادییەکانی تێدایە، لەبەر ئەوە تەنها ئەوانەیان باس دەکەین کەزیاتر پەیوەندارن بەژیانی کرداریی ڕۆژانەوە وەك مافی ئازادی کەسیو مافی ئازادی شوێنیو، مافی ئازادی مەعنەویو، مافی ئازادی دادگایکرانو، بێدادی (تظلم) و، مافی ئازادی داراییو، مافی ئازادی خێزانیو، مافی ئازادی بەرگری لەخۆکردن.

ئەم مافو ئازادییانە لەم هەشت بەشەدا دەخەینە ڕوو.

# بەشی یەکەم

# مافی ئازادی کەسی

# (کەسێتی یاسایی)

## حق الحرية الذاتية
## ( الشخصية القانونية )

لێکۆڵینەوەی بابەتەکە بۆ سێ دەروازە دابەش دەکەین:

یەکەمیان تایبەت دەکەین بەپێناسەی ئازادی کەسی.

دووەمیشیان بۆ هۆکارەکانی کۆیەلەبوون.

سێیەمیش ڕێگاکانی قەڵاچۆکردنی.

# دەروازەی یەکەم:
# پێناسەی ئازادی کەسیی

## (التعريف بالحرية الذاتية)

مەبەست لە مافی ئازادی کەسیی (کەسێتی یاسایی) دوورخستنەوەی بەکۆیلەکردنی مرۆڤە لەلایەن مرۆڤی برایەوە، ئازادی کەسی کەبەکەسێتی یاسایی ناودەبرێت لەگەڵ لەدایکبوونی مرۆڤدا دەست پێدەکاتو تا ئەو کاتەی لەژیاندایە لەگەڵیدا بەردەوام دەبێت، بۆ هیچ کەس نیە لێی وەربگرێتەوەو بۆ هیچ سیستەم یاخود یاسایەك نیە ئەو ئازادیە لەهیچ تاکێك وەربگرێتەوە کەلەگەڵ لەدایکبوونیدا پێی بەخشراوەو بیگۆرێت بۆ بەندەو کۆیلە یان کەنیزەك، قورئانی پیرۆز بڕیاری لەسەر ئەمە داوە، پاش ئەو دوای چواردە سەدە جاڕنامە جیهانیەکانی مافی مرۆڤ هاتووەو لەمادەی چوارەمیدا دەڵێت: (ڕێگە بەکۆیلەکردنو بەندکردنی هیچ کەس نادرێتو، بەکۆیلەکردنو بازرگانی کۆیلە بەهەموو شێوەیەکانی قەدەغە کراوە).

قورئانی پیرۆز بۆ یەك مەبەست هاتووە بۆ گەورەمان محمد (ﷺ) ئەویش پاراستنی بەرژەوەندی مرۆڤە، خوای گەورە روو لەپێغەمبەر دەکاتو دەفەرمووێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ﴾[1]، لەم ئایەتەدا رەتکردنەوە (نفی)ی رەتکراوە (المنفی) بۆ چەسپاندنی دابڕین (حصر)ە، بەو مانایەی مەبەست لەپەیامی موحەمەد

---

[1] سورة الانبياء : ١٠٧.

بەدیهێنانی بەرژەوەندی مرۆڤە چونکە مەبەست لە (رەحمەت) بەرژەوەنـدی گونجـاو (سوودمەندی باش)ە(المصلحه المستجلبه)و، نەگونجاویش (خراپەی دوورخراوەیـە)، ئیدی ئەو بەرژەوەندییە مادی بێت یاخود مەعنەوی، دونیایی بێت یان قیامەتی.

هەرکـەس لەئایەتـەکانی قورئـانی پـیرۆز رابمێنێـت ئـەوا یـەك ئایـەتیش نابینێـت کەبەکۆیلـەکردنی مـرۆڤ بـەرەوا دابنێـت، بەکۆیلـەکردنی مـرۆڤ لەلایـەن مرۆڤـەوە و بەبەندەکردنی ئیدی نێر بێت یان مێ، موسڵمان بێن یـان ناموسـڵمان، دیـل بێـت یـان دیـل نـەبێت، بـەڵکو قورئـان سیسـتەمی رزگـارکردنی مرۆڤـی لـەرژێمی کۆیلـەکردنو حـەرامکردنی پەرستشـی جگـە لەپـەروەردگاری هێنـا، قورئـان کردوویـە بەئـەرك لەسەرشانی مرۆڤ کەرۆژانە دەیان جار لەنوێژەکانیدا: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ [1] دووبار بکاتەوە جەختی لەسـەر ئـەم راسـتیە کردۆتـەوە، بـەپێی بنـەماکانی زانسـتی رەوانبێژی ئەگەر بەرکار (مفعول به) پێش کـارو کـارا (فعلو فاعـل) کـەوت ئـەوا بـۆ دابڕین (حصـره)ە، بـەو واتایـەی کەبەندایـەتیکردن تـەنها بـۆ خـوای گەورەیـەو هانـا بردنیش تەنها بۆلای خوایە، ئەمـەش بـۆ پاراسـتنی ئـازادی مرۆڤـە لەکەسـی خـۆیی‌و کەسێتی‌و پاراستنی ئەو رێزەی کەخوای گـەورە لـەنێوان زینـدەوەرەکانی تـردا پێـی بەخشیوە، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً﴾ [2].

لەبەر رۆشنایی ئەو دەقانەی لـەقورئانی پـیرۆزدا سـەبارەت بـە پاراسـتنی ئـازادی مرۆڤ لەبەکۆیلەکردن لەسەر هەموو دەوڵەتێكو هـەر لایـەنێك کـەدیلی گـرت پێویسـتە دیلەکـە بپارێزێـت لەبەکۆیلـەکردنو ژیـانی لەکوشـتن بپارێزێـتو جەسـتەی لەئەشکەنجەدان بپارێزێتو رێزی لەسوکایەتی پێکردن بپارێزێت [3].

---

[1] سورة الفاتحة: ٥.

[2] سورة الاسراء: ٧٠.

[3] بۆ زیاتر ئاگاداربوون بڕوانە کتێبی "لا رق فی القران"ی مامۆستا ابراهیم هاشم قلالی، ل٢٠٢ ودواتر.

بەڵام لێرەدا پرسیارێك دێتە ئارا: بۆچی ئیسلام کۆیلایەتیو بەبەندیکردنی حەرام نەکرد؟ بۆچی ئایەتێکی تایبەت بەرزگارکردنی کۆیلەو کەنیزەك نەهات تا ئازادیی کەسییان بۆ بگێڕێتەوە کەبەناڕەوا لێیان زەوت کرابوو؟

وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەیە: قورئانی پیرۆز نەخۆشینە کۆمەڵایەتیە درێژخایەنە بەربڵاوەکانی بۆ چەند هەنگاوو قۆناغێك بەپلەبەند چارەسەر کردووە تا خۆی دوور بگرێت لەکاردانەوەی نەگونجاو، بۆ نمونە: حەرامکردنی خواردنەوەی عەرەقو سوو (ربا)و کۆیلە.

ئەوکاتەی قورئان هات رێژەی کۆیلەو بەندە زیاتر بوو لەرێژەی ئازادەکان، ئەگەر بڕیاری نەهێشتنی کۆیلایەتیو گەڕاندنەوەی ئازادی بۆ بەندەکان بەیەکجار بدایە ئەوا ئەم دەرئەنجامە خراپانەی لێدەکەوتەوە:

١. بازرگانیکردنی بەکۆیلەکان بڕبڕەی پشتی ژیانی ئابووری ئەوکاتە بوو، لەبەر ئەوە رزگارکردنیان بەیەکجار تائازادی لێ زەوتکراویان بۆ بگەڕایەتەوە دەبووە هۆی ئەوەی ستەمکارانو خاوەن کۆیلەکان هەر لەسەرەتاوە لەدژی ئیسلام بووەستن.

٢. توانای دارایی گەنجینەی گشتی (بیت المال) هێندە نەبوو ژیانی ئەو ملیۆنەها کۆیلەو کەنیزەکانە لەئەستۆ بگرێت، جگە لەوەی کەلەگەورەکانیانەوە وەریان دەگرت سەرچاوەیەکی دیکەی بژێوی ژیانیان نەبوو، لەبەر ئەوە بەیەکجار ئازادکردنیان تا سەربەستیان بۆ بگەڕێتەوە دەبووە هۆی هەڵگەڕانەوەیان لەدژی ئیسلام.

٣. بەندەکان لەسەر کۆیلایەتی راهاتبوونو رزگارکردنیان ئەگەری ئەوەی هەبوو رەتی بکەنەوە، وەك ئەوەی لەئەمریکا روویدا کاتێ یاسای نەهێشتنی کۆیلە لەلایەن ئەبراهام لینکۆلنەوە دەرچوو.

لەبەر ئەم هۆکارانەو هۆکاری دیکە ئیسلام قۆناغێکی گواستنەوەی دانا کەلە سەردەمی ئەوەیەك تێنەدەپەڕی کەئەویش سەردەمی ئەوانە بوو لەکاتی هاتنە

خوارەوەی پەیامی ئیسلامدا دەژیان‌و بەکۆتایی ئەو نەوەیەش کۆتایی هات‌و هیچ بەڵگەیەك لەشەریعەتی ئیسلامیدا نەماوە بکرێتە پاساوی زەوتکردنی ئازادی مرۆڤ‌و بەکۆیلەکردنی، ئەوەی لەهەندێك ئایەتی قورئانی پیرۆزدا دەیبینین سەبارەت بەبەندەو کۆیلە تایبەتە بەو ماوەی گواستنەوەیە، پاش کۆتایهاتنی ئەو نەوەیە کارکردن بەو ئایەتانەش راوەستا، ئەمەش بەسڕینەوە (نسخ) ناونابرێت، بەڵکو لەروانگەی کۆتایهاتنی کارکردن بەو دەقە دێت بەهۆی کۆتایهاتنی هۆکارەکانی دانانی ئەو یاسایەوە، لەدەروازەی ئازادی مرۆڤدا بەدرێژی لەم بابەتە دەدوێین، لەبەر هەبوونی کەسانێکی زۆری عەقڵ بەستوو کەوا گومان دەبەن سیستەمی بەندایەتی‌و کەنیزەك تا ئەو کاتەی ژیان مابێت‌و شەریعەتی ئیسلام جێبەجێ بکرێت درێژەی هەیە، لەبەر ئەوە لەسەر بنەمای مامەڵەی هاوشێوە بەکۆیلەکردن‌و بەبەندە کردنی دیلیان رەوایی پێداوە‌و ئاگاداری ئەوە نین یان خۆیانی لێ بێ ئاگا دەکەن کەمامەڵەی هاوشێوە لەبەکۆیلەکردنی دیلدا لەیاسای هەموو وڵاتانی جیهاندا قەدەغەکراوە، یاساکانی هەموو وڵاتانی جیهان نەیانهێشتووە‌و ئەم پرۆسەیە بەپێی یاسا بەتاوان دانراوە، بەهەمان شێوە ئاگاداری ئەوە نین کەدوژمنانی ئیسلام تانە لەئیسلام دەدەن‌و بەوە تۆمەتباری دەکەن کەبڕیاری لەسەر سیستەمی بەندەو کەنیزەك داوە‌و بەکۆیلەکردنی مرۆڤی لەلایەن برای مرۆڤیەوە دانپێداناوە.

# دەروازەی دووەم:
# گرنگترین هۆکارەکانی کۆیلایەتی
# لەسەدە کۆنەکانی پێش ئیسلامدا

دەتوانین بەمجۆرە کورتی بکەینەوە:

١- دیل: لەپێشەوەی هۆکارەکانی کۆیلەکردن بووە لای نەتەوە کۆنەکانو، قورئان هاتو ئایندەی دیلی لەئازادکردن بەبێ بەرانبەر یاخود ئازادکردنی بەبەرانبەردا کورت کردەوە، لەمبارەیەشەوە لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە: ﴿فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ﴾، واتە: ئوەك رێزێكو بەبێ بەرانبەر، یاخود: ﴿وَإِمَّا فِدَاءً﴾ [1] واتە: بەفیدیە لەلایەن دیلەکەوە بدرێتە ئەوەی گرتوویەتی یان بەسامان؛ ئاشکرایە کەپێغەمبەر (ﷺ) فیدیەی ئازادکردنی دیلەکانی جەنگی بەدری بەوە دانا هەر دیلێك چەند منالێکی موسڵمان فێری خوێندنەوەو نووسین بکات، ئەم دەربڕینە لەزانستی رەوانبێژیدا بۆ کورتکردنەوە (حصر)ەو هیچ واتایەکی تری نیە جگە لەئازادکردنی دیل بەبێ بەرانبەر یاخود بەفیدیە.

پێغەمبەریش (ﷺ) هیچ گیراوێکی جەنگی نەکردۆتە کۆیلەو، هەستانی بەکوشتنی هەندێك گیراوی جەنگ لەبەر هۆکاری تر بووە کەلێرەدا بواری باس کردنیان نیە لەبەر سنووورداری ئەم باسە، کاتێ مەککەی رزگارکرد بەخەڵکەکەی فەرموو: (کلکم طلقاء[2]) واتە: هەمووتان ئازادن.

---

[1] سورة محمد : ٤ .

[2] سنن البيهقي الكبرى: ٩\١١٨ ، الجامع الصغير للسيوطي: ص٢٢٠ .

سەرکردەی ئیسلامی سەلاحەدینی ئەیوبیش (٢٥) هەزار دیلی جەنگی گاورەکانی بەبێ بەرانبەر ئازاد کرد.

١. چەتەگەری دەریایی‌و رفاندن‌و هاوشێوەکانی، قوربانیانی ئەو دەستدرێژیانە وەك دیلی جەنگ مامەڵەیان لەگەڵدا دەکراو کۆیلایەتیان بەسەردا دەسەپاندن، ئیسلام ئەم شێوازەی حەرام کردو سزای توندی بۆ ئەنجامدەرانی بڕیاردا.
٢. ئەنجامدانی هەندێك تاوانی مەترسیدار، وەك کوشتن‌و دزی‌و زینا، سزای تاوانباری ئەنجامدەر کۆیلەکردنی بوو بۆ بەرژەوەندی دەوڵەت یاخود بۆ کەسی زیان لێکەوتوو یان بۆ میراتگرەکانی، قورئانی پیرۆز هات سزای تایبەتی بۆ ئەو تاوانانە دیاری کرد.
٣. ئەو هەژاریە بەربڵاوەی هەبوو وای دەکرد کەسە هەژارەکە بەناچاری رووبەکردە قەرز کردن، کاتێ دەستەوسان بوو لەدانەوەی قەرزەکە چەند قات سووی دەخرایە سەر، ئەمە لەکۆمەڵگایەکی هەژاردا کەپێوەرەکانی دادپەروەری تێدا نەمابوو، ئەو سووەش بوو بووە هۆی زیادبوونی رادەی هەژاری کەقەرزارەکەی ناچار دەکردبەرەو زەلکاوی کۆیلەکردن بچێت‌و خاوەن قەرزەکە بۆی هەبوو وەك بەندە مرۆڤە قەرزارەکە بفرۆشێت، ئاینی ئیسلام چەند هۆکارێکی بۆ زاڵبوون بەسەر کێشەی هەژاریدا بڕیارداو سوویشی حەرام کرد.
٤. دەستەڵاتی کەس بەسەر خۆیدا، لەکاتی پێویستی ئابووریدا لەپێناوی بەدەستهێنانی بژێوی ژیانیدا خۆی بەکەسێکی تر دەفرۆشت، ئیسلام ئەو پێویستیەی بەچەند رێگایەکی جۆراوجۆر نەهێشت، لەوانە: بژێوی‌و زەکات.
٥. باوك سالاری، باوك مافی ئەوەی هەبوو هەر منداڵێکی وەك کۆیلە بفرۆشێت، ئیسلام ئەوەشی حەرام کرد.
٦. وەچە خستنەوەی کۆیلەکان، منداڵی کەنیزەك بەرەچەڵەك بەکۆیلە دادەنرا، ئیسلام بەئازادی دانا.

٧. هۆكاری تریش هەیە كەلێرەدا بواری باسكردنیان نیە[1]، دەكرێت هۆكاری تەقینەوەی ئەو سەرچاوانە بۆ ئەمانە بگەڕێتەوە:

١. هۆكارە رەگەزپەرستیو هۆزایەتیو ئاینیەكان.
٢. گەندەڵی سیستەمی ئابووری.
٣. نەمانی گیانی بەزەییو هاوسۆزی لەنێو خەڵكیدا.
٤. نەبوونی شەرعو یاسا.
٥. تەنها سزا بەس نەبوو بۆ سزادانی ئەو تاوانەی تاوانبارەكە پێی هەستابوو.

# دەروازەی سێیەم:
# رێگاكانی نەهێشتنی سیستەمی كۆیلایەتی لەقورئاندا

## ( طرق القضاء على نظام الرق في القرآن )

كاتێ ئیسلام هات سیستەمی كۆیلایەتیو بەبەندەكردنی مرۆڤ لەلایەن برای مرۆڤیەوە لەو دەمەدا وەك زەلكاوێكی بۆگەن وەها بوو، ئیسلام بەدانایی خۆی ئەو جۆگەلانەی نەهێشت كەئاویان دەگەیاندە ئەو زەلكاوەو بۆ هەتا هەتایە وشكی كرد، قورئانی پیرۆز چەند رێگەیەكی بۆ وشككردنی ئەو جۆگەلانەو نەهێشتنی ئەو سیستەمە بێزراوە هێنا، لەوانە:

---

[1] بڕوانە: مدخل تاريخي لدراسة حقوق الانسان للدكتور محمود سلام زناني .

١. حەرامكردنی بەكۆیلەكردنی دیلو چارەنووسی لەوەدا كورت كردەوە كەدەبێت ئازاد بكرێت، لەمبارەیەوە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً حَتَّى تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا﴾[1]، دانایی ئەم كورتكردنەوە (حصر)ەش ئەمانەیە:

أ. دیل بەویستی خۆی نەهاتووە بۆ گۆرەپانی جەنگ، ئیتر لەسەر چ بنەمایەك دەكرێتە كۆیلەو ئازادیەكەی زەوت دەكرێت كەبەنرخترین شتە لەژیانیدا.

ب. شەڕ لەئیسلامدا بۆ بەرگری رەوا (الدفاع الشرعی)یەو سەبارەت بەدیلەكە كۆتایی هاتووە، بەكۆتایهاتنیشی دوژمنكاریو راوەستانی جەنگ بەرگری رەواش كۆتایی دێت.

ج. ناچاركردنی لەژێر هەڕەشەی بەكۆیلەكردنیدا ئەگەر موسڵمان نەبێت پێچەوانەی زۆر ئایەتی قورئانە، لەوانە: ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ...﴾[2].

د. مامەڵەی هاوشێوە كەزۆركەس پەنای بۆ دەبات بۆ رەوا بینینی بەكۆیلەكردنی دیل رەت كراوەیە لەزۆر لاوە، لەوانە:

یەكەم: سیستەمی بەكۆیلەكردنی دیل لەهەموو وڵاتانی جیهاندا بەكۆدەنگی كۆتایی هاتووە ئیدی مامەڵەی هاوشێوە لەكوێدایە.

دووەم: بەكۆیلەكردنی دیل و زەوتكردنی ئازادیەكەی وەك تۆڵەكردنەوە لەدوژمن پێچەوانەی فەرمایشتی خوای گەورەیە: ﴿...وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى...﴾[3].

٢. قورئان ئازادكردنی كۆیلەی كردۆتە كەفارەتی زۆر گوناه وەك لە (ظهار)و كوشتنی هەڵەدا هەیە.

---

[1] سورة محمد : ٤.
[2] سورة البقرة: ٢٥٦.
[3] سورة لنعام : ١٦٤ .

٣. قورئان بەهای (١\٨)ی داهاتی زەکاتی تایبەت کردووە بەئازادکردنی کۆیلە، بەپێدانی ئەو بڕە پارەیە کەلەزەکات وەریدەگرێتو دەیدات بەگەورەکەی لەبەرانبەر ئازادکردنیدا.

٤. قورئان بڕیاری داوە منالّی هەموو کەنیزەکێك کەلە چوونەلای مێرد بەهاوسەرگیری یاخود بەخاوەنداریێتی ئەوا دایکەکەی (دایکی منالّەکە) راستەوخۆ پاش مردنی مێردەکەی یان خاوەنەکەی ئازاد دەبێت، بەمەش ئیسلام قەلاّچۆی رەچەلّەکی وەك هۆکارێك لەهۆکارەکانی بەکۆیلەکردن کردووە.

٥. ئیسلام بەشێوەی فەرمانکردنی پێویستکار فەرمانی کردووە لەسەر هەر تاکێك کەتوانای دارایی هەبێت پێویستە بەسامانەکەی هاریکار بێت لەرزگارکردنی کۆیلەدا لەرێگەی کڕینو ئازادکردنیانەوە، یاخود لەرێگەی پێدانی سامانەوە پێی تابیداتە گەورەکەی لەبەرانبەر ئازادکردنیدا، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَّيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ﴾[1]. مەبەست لە (رقاب) لێرەدا بریتیە لە ئازادکردنی بەندەو کەنیزەك لەرێی خواداو بەمەبەستی بەدەستهێنانەوەی ئازادیە بەناڕەوا زەوتکراوەکەیان.

٦. خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا فەرمانی بەگەورەی کۆیلەکان کردووە بەخۆڕاییو بەبێ بەرانبەر ئازادیان بکەن، یان بەبەرانبەرێك ئازادیان بکەن کەدواتر پێیان بدەن، وەك دەفەرمووێت: ﴿..فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا..﴾[2].

[1] سورة البقرة : ١٧٧ .

[2] سورة النور: ٣٣ .

٧. قورئانی پیرۆز هەموو ئەو مرۆڤانە هاندەدات کەتوانای ئازادکردنی کۆیلەیان هەیە لەبەرانبەر پاداشتی لای خوای گەورە ئازادیان بکەن، وەك دەفەرمووێت: ﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ، فَكُّ رَقَبَةٍ﴾[1].
٨. ئیسلام بڕیاریداوە باوو باپیر (اصول) کەکۆیلەن ئەگەر لقەکانیان بوونە خاوەنیان ئەوا دەستبەجێ ئازاد دەکرێن.
٩. هەرکەس لەپشکی خۆی خۆش ببێت لەو کۆیلەیەی کەخاوەندارێتیەکەی هاوبەشە ئەوا بەشەکەی تریشی بۆ ئازاد دەبێت، ئەگەر لەرووی داراییەوە توانای هەبوو ئەوا لەسەریەتی قەرەبوویەك بداتە هاوبەشەکەی تری لەبەرانبەر پشکەکەیدا.

بەمجۆرە قورئان بۆ لەناوبردنی ئەم نەخۆشینە کۆمەڵایەتیە خەباتی کرد کەسوکایەتیە بەشکۆی مرۆڤو کەسایەتی دەشکێنێت‌و، ئازادیەکەی کەبەبەهاترین شتە هەیبێت لەژیانیدا ناهێڵێت، ئیدی چۆن بیرۆکەیەکی وەحشیگەرانە بڕیار لێدەدات کەلەکۆمەڵگا جیاوازەکاندا هاتۆتە ئارا، لەوانە کۆمەڵگای وڵاتی نێوان دووڕووبارەکە (بلاد مابين الرافدين) لەسەردەمی دەوڵەتی ئوری سێیەمدا (نزیکەی ساڵ ٢١٠٠پ ن)و نەتەوە کۆنەکانی تریش، بەهۆیەوە زۆرێك لەئازادەکان بوونە کۆیلە لەبەرئەوەی بەهۆی برسێتیەوە یان هەژاریەوە لەبەر هەژاری خۆیان یاخود منداڵەکانیان فرۆشت، یان لەبەر ئەوەی خاوەن قەرزەکان دەستیان بەسەردا گرتوون‌و بەهۆی نەتوانینی دانەوەی قەرزەکانەوە کردونیانەتە کۆیلە، لەکۆمەڵگای ئیغریقیشدا سەرچاوەی بەکۆیلەکردن ئەم سێیە بوو: لەدایکبوون‌و، جەنگو، حوکمی یاسا[2].

---

[1] سورة البلد : ١٢- ١٣ .
[2] بڕوانە: مدخل تاريخي لدراسه حقوق الانسان ، سەرچاوەی پێشوو، ل١١٣ وبولتر.

# بەشی دووەم

## مافی ئازادی شوێن

## (نیشتەجێبوون و هاتوچۆ)

### حق الحرية المكانية
### (المسكن والتنقل)

لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتە لەرووی شێوازەوە بۆ دوو دەروازە دابەش دەکەین:

یەکەمیان بۆ روونکردنەوەی مافی ئازادی نیشتەجێ بوون.

دووەمیشیان بۆ مافی ئازادی هاتوچۆ.

# دەروازەی یەکەم:
# مافی ئازادی شوێنی نیشتەجێبوون

## ( حق حرية المسكن )

شوێنی نیشتەجێبوون بریتیە لەو جێگایەی کەمرۆڤ بەشێوەیەکی ئاسایی ئیدی هەمیشەیی بێت یان کاتی تێیدا ژیان بەسەر دەبات، شوێنی نیشتەجێبوون لەئیسلامدا حورمەتێکی زۆری هەیەو، لەکاتی زۆر پێویستدا نەبێت چوونە ناوی دروست نیە، مافی حورمەتی شوێنی نیشتەجێبوون لەراستیدا تەواوکاری حورمەتی ئازادی کەسیی یاخود دەرئەنجامیەتی، بەپاراستنی ئەم مافە هێمنایەتی لەنیشتەجێبوون بۆ تاك دابین دەکرێتو هیچ کەس نارەحەتی ناکات بەتایبەت لەشەودا کەنارەحەتکردن کاریگەری خراپتری دەبێت.

قورئان بە دەق حورمەتی شوێنی نیشتەجێ بوونی راگەیاندووە و نادروستی پێشێلکاری حورمەتی ئەوماڵەی بەیان کردووە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ(٢٧)فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فِيهَا أَحَدًا فَلاَ تَدْخُلُوهَا حَتَّى يُؤْذَنَ لَكُمْ وَإِنْ قِيلَ لَكُمْ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا هُوَ أَزْكَى لَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾[(١)].

---

[(١)] سورة النور –الأيتان: ٢٧–٢٨.

بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە خوای گەورە ماڵی کردۆتە شوێنی حەوانەوەو مرۆڤ تێیدا ڕۆحی هەست بەئارامی دەکاتو دەروونیان ئاسوودە دەبێتو لەحورمەتو ڕێزیان دڵنیا دەبن.

ماڵەکان ناتوانن ئەم ئامانجانە بێننە دی تا نەبنە مەنزڵگایەکی ئارام کە کەس بەبێ زانیاری و مۆڵەتی خاوەنەکەی خۆی بەسەردا نەدات، شکاندنی حورمەتی ماڵ لەلایەن ئەوانەی بەبێ مۆڵەت دەچنە ناویەوە، چاویان بەڕووی عەورەتی خەڵکدا هەڵدەتەقێنێ.

قورئان بە (استئناس) گوزارشتی لە مۆڵەت وەرگرتن کردوە، کە دەربڕینێکە ئاماژەیە بۆ نەرمی مۆڵەت وەرگرتن و نەرمیی شێوەی هاتنی لەدەرگادەر، کە گوشادی لە دڵی خاوەن ماڵ و ئامادەیی بۆ پێشوازیکردنی دروست دەکا. پاش مۆڵەتخواستن دەردەکەوێ کەسێك لە خاوەن ماڵەکە لە ماڵە یان کەس لە ماڵ نیە. ئەگەر ماڵ چۆڵ و کەسی تێدا نەبوو نابێ پاش مۆڵەخواستن مل بنێت و بچێتە ژوورەوە، لەبەرئەوەی بەبێ مۆڵەتدان چوونەژوورەوە دروست نیە. خوا دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فِيهَا أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّى يُؤْذَنَ لَكُمْ﴾[1]. ئەگەر کەسیشی تێدا بوو ئەوا تەنها مۆڵەتخواستن بەس نیە بۆ چوونە ژوورەوە، بەڵکو ئەوە تەنها داوای ڕێپێدانە، ئەگەر خاوەن ماڵ مۆڵەتی بەچوونەژوورەوە نەدا، نابێتە بچێتە ژوور و پێویستە بەبێ سرتەسرت و چاوەڕوانی شوێنەکە بەجێبێڵێ: ﴿وَإِنْ قِيلَ لَكُمُ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا هُوَ أَزْكَى لَكُمْ﴾[2]. بگەڕێنەوە بەبێ ئەوەی دڵتان گەرد بگرێ و بەبێ ئەوەی هەست بەوە بکەن خاوەن ماڵ سووکایەتی پێکردوون یان لێتان بێزارە، چونکە خەڵك نهێنی و عوزری خۆیان هەیە و پێویستە هەڵسەنگاندنی هەڵوێستەکە بۆ خۆیان بەجێ

---

[1] النور: ٢٨.

[2] النور: ٢٨.

بهێڵرێ. ئەم ڕێنوێنییانە بریتیەلەڕێزگرتنی شوێنی نیشتەجێبوون کەئەمەش لەمافی ئازادی مرۆڤ لەنیشتەجێبوونی سەرچاوەی گرتووە.

لێرەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە قورئان بەرنامەی ژیانە، بۆیە بەو رادەیە بایەخ بەم شتە بچوکانەی ژیانی کۆمەڵایەتی دەدا، لەبەرئەوەی مۆڵەتخواستن حورمەت بۆ ماڵەکان مسۆگەر دەکات و بەهۆیەوە دەبنە شوێنی ئارامی و ئۆقرەیی و خاوەنەکانیان لە شەرم و تەریقبوونەوە و نارەحەتبوون دەپارێزێ، کە دەشێ بەهۆی لەپڕ خۆبەماڵدا کردن و دەرکەوتنی ئابڕوویان، ئابڕوی خواردن بێ یان ئابڕوی پۆشاك و کەلوپەل دووچاریان ببێ، لەوانەیە ئەو ماڵە حەز نەکەن بەبێ ئامادەکاری و خۆکۆکردنەوە و جوانکاری خەڵك لەپڕ بەو شێوەیە بیانبینن.

پێشەوا غەزالی (رەحمەتی خوای لێبێت) سەبارەت بەئازادی شوێنی نیشتەجێبوون لە(باب الحسبة (الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر)) باسی لەمەرجەکان کردووەو دەڵێت: مەرجە رێگری لێکراو (منکر) کە فەرمانکار (محتسب) دەیەوێت لایبداتو قەلاچۆی بکات دەرکەوتوو دیار بێت بەبێ سیخوڕیکردن، چونکە هەرکەسێك کاری خراپەی خۆی لەماڵەکەیدا شاردبووەو دەرگای داخستبوو نابێت سیخوڕی لەسەر بکرێت، خوای گەورە فەرمانی کردووەو دەفەرموێت: ﴿وَلاَ تَجَسَّسُوا﴾، ئەو لەخستنە رووی ئەم مەرجانەدا بۆمان باس دەکات کە: عومەری کوڕی خەتاب (خوا لێی رازی بێت) چووە سەردیواری ماڵی پیاوێكو لەحاڵەتی سەرپێچیکردندا چاوی پێیکەوت، سەرزەنشتی کرد، ئەویش وتی: ئەی میری باوەڕداران من لەیەك رووەوە سەرپێچی خوام کردووە، بەڵام تۆ لەسێ رووەوە سەرپێچیت کردووە، وتی: ئەو سێ رووە چیە؟ وتی: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلاَ تَجَسَّسُوا﴾ [1] تۆش سیخوڕیت بەسەرمەوە کرد، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿...وَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَابِهَا...﴾ [2] تۆ

---

[1] سورة الحجرات: ١٢ .

[2] سورة البقرة: ١٨٩.

لەسەر دیوارەوە هاتیت، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لاَ تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا﴾[1] تۆ هاتیتو سڵاوت نەکرد، عومەر وازی لێهێنا چونکە بینی ئەو لەحورمەتی ماڵەکەیدا لەسەر حەقەو لەبەر ئەوە لێپێچینەوەی لەگەڵ نەکرد، بەڵام کردیە مەرج لەسەری کەتەوبە بکات، پاشان غەزالی دەڵێت: "بزانە هەرکەس دەرگای ماڵەکەی داخستو بەهۆی دیوارەکانیەوە خۆی پەنا دا رێگا نادرێت بەبێ مۆڵەت وەرگرتن چوونە ناو ماڵەکەی تا سەرپێچی بزانرێت، مەگەر ئەوەی لەناو ماڵەکەدا ئەنجام دەدرا ئەوانەی لەدەرەوەن پێی بزانن"[2].

لەقورئانی پیرۆزو سوننەتەکانی پێغەمبەرو گوتەی زانایانی پێشینی چاك دەگەینە ئەو دەرئەنجامە کەدروست نیە چوونە ماڵی هیچ کەس بەمەبەستی پشکنینی بەبێ ئاگادارکردنەوەو هەواڵپێدانی پێشوەختەو بەئامادەبوونی خاوەن ماڵ یاخود کەسێك لەبری خۆی یان کەسایەتیەکەی ناوچەکەی وەك موختاری شوێنەکە.

بەڵام گەشەکردنی تەکنەلۆژیا بەهۆی ئامێرەکانی وێنەگرتنو گواستنەوەیو گوێگرتنو تۆمارکردنو هاوشێوەکانیەوەکەهەڕەشەن بۆ سەر ژیانی تایبەتی تاکەکان بووە هۆی ئەتکردنی حورمەتی ماڵو شوێنی نیشتەجێبوون، بەجۆرێك کەدەتوانرێت بەئاسانی ژیانی تایبەتی ناوماڵەکان چاودێری بکرێتو، ئامێری هاوچەرخی وا داهێنرا کەماوەی دووری نێوانی سڕیەوە کەرێگر بوو لەئاگاداربوون لەو تایبەتمەندیانەی لەشوێنێکی دوور روودەدات، هەروەها ئامێری مۆبایلو گوێگرتنی وا داهێنراوە کەدەتوانرێت گوێبیستی هەموو ئەوە بێن کەلەناو ماڵەکاندا روودەدات لەرێی دانانی ئامێرەوە لەدەرەوەی ماڵەکان یاخود لەسەربانەکان، پێشکەوتنی تەکنەلۆژی گەیشتە رادەیەك کەلەتواناداییە چاودێری هەموو تایبەتمەندییەکانی مرۆڤ بکرێت لەنێو ماڵەکەیو لەدەرەوەی ماڵەکەی، هەروەها سەرچاوەیەکی نوێی مەترسیدار بۆ سەر

---

[1] سورة النور: ٢٧.

[2] احیاء علوم الدین : ٢\٣٢٠.

ژیانی تاك پەیدا بووە کەپێی دەوترێت عەقڵی ئەلیکترۆنیو لەتوانایدایە کەزۆرترین زانیاری پەیوەست بەژیانی تایبەتی تاك لەنێو ماڵەکەیو دەرەوەیدا کۆبکاتەوە[1]، ئەمە سەرەڕای گۆڕانی رەوشی دانیشتوانو دەرکەوتنی باڵەخانەی بەرزی هاوشانی یەك کەوایکردووە بەئاسانی سەیری ناوماڵی یەك بکرێتو ئەوەی مایەی شەرمە لەنێو ماڵەکاندا ببینرێت، بەتایبەت لەباخچەی ماڵەکاندا، بەمجۆرە دەبینین هەتاوەکو مرۆڤ لەرووی مادیەوە پێشبکەوێت لەرووی رەوشتیو مەعنەوەیەوە بەرەو پاش دەگەڕێتەوە، ئەمەش بەهۆ دابڕینی وزەی مادی لەوزەی رۆحی لەجێبەجێکردنی پێداویستیەکانی ژیاندا، ئەمە لەکاتێکدا کەئەو دوو وزەیە تەواوکاری یەکترن، هەربۆیە ئایندەی پێشکەوتنی شارستانی شکست هێنەرە لەدابینکردنی بەختەوەری بۆ مرۆڤ ئەگەر هاتوو وزەی رۆحی پشتیوانی نەبوو.

---

[1] بڕوانە: الحق في احترام الحياة الخاصة (الحق في الخصوصية) للدكتور حسام الدين كامل الاهواني، ل٥ ودواتر.

# دەروازەی دووەم:
# مافی ئازادی هاتوچۆ

## ( حق حرية التنقل )

هیچ یاسایەك لە جیهاندا نیە هێندەی شەریعەتی ئیسلامی رێگری لەبەردەم ئازادیی هاتوچۆ (حریە التنقل)هەلگرتبێ، لەبەرئەوەی رەگەزنامەی موسڵمان ئیسلامە، هەربۆیە هیچ بەربەستێك لەبەردەم هاتوچۆی لەناوەوە و دەرەوەی وڵاتدا نیە مەگەر لە حاڵەتێکدا لەگەڵ بەرژەوەندیی گشتی لێك بدات.

یەکەمین جێبەجێکردنی هاتوچۆ و کۆچکردن و پەنابەری کۆچی پێغەمبەرﷺ بوو لە مەکەوە بۆ مەدینە. لە گەشترین وێنەکانی هاوکاریی نێوان خەڵك لە مێژوودا هاوکاریی نێوان یاریدەدەر و کۆچەریەکانە لەگەڵ پێغەمبەرﷺ. ئەو کۆمەکی و پەنادانەی یاریدەدەرەکان پێشکەشی کۆچەریەکانیان کرد بەڕادەیەك بوو مێژووی مرۆڤایەتی بەخۆیەوە نەدیوە.

ئازادی هاتوچۆکردن لە ئیسلامدا دەستەبەرە جا چ ئەو هاتوچۆیە بۆ سەیر و سەفا بێ، یان بۆ بازرگانی یان چارەسەری نەخۆشی یان هەر مەبەستێکیتری رەوا. قورئانی پیرۆز لە چەندین ئایەتدا باسی ئەم مافەی کردوە، لەوانە: ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ ذَلُولًا فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ﴾[1].

قورئان بڕیاری سەروەری هەرێمی داوە لەپێناوی رێکخستنی ژیانی کارگێڕیو سیاسیو رۆشنبیریو ئابووریو بوارەکانی تر، بەڵام پێویستە ئەم سەروەریە نەبێتە

---

[1] الملك: ١٥.

ڕێگر لەئازادی هاتوچۆو نیشتەجێبوون لەهەرێمەکەو دەرەوەیدا، چونکە ئەوەی خوای گەورە لەسەر زەوی‌و ناواخنیدا دروستی کردووە هاوبەشە لەنێوان مرۆڤایەتیدا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا..﴾[1]، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَسِيرُوا فِي الأَرْضِ فَانْظُروا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ﴾[2]، واتە: تا وانەو پەند لەژیانی کەسانی ترو چارەنووس‌و ئەنجامی کارەکانیان وەربگرن، لەوانە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَاعِبَادِيَ الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ أَرْضِي وَاسِعَةٌ فَإِيَّايَ فَاعْبُدُونِ﴾[3].

لەوانەیە هاتوچۆ واجبێك بێ بۆ پاراستنی ئاین یان ژیان یان ناموس یان ماڵ، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنْتُمْ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الْأَرْضِ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا﴾[4].

لەوانەیە هاتوچۆکە بۆ بەدەستهێنانی زانست‌و زانیاری‌و ئاگاداربوون لەگەشەسەندنی شارستانی وڵاتانی تر بێت بەمەبەستی بڵاوکردنەوە لەنێو هاوڵاتیانی وڵاتەکەیدا پاش گەڕانەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنْفِرُوا كَافَّةً فَلَوْلاَ نَفَرَ مِنْ كُلِّ فِرْقَةٍ مِنْهُمْ طَائِفَةٌ لِيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ وَلِيُنْذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ﴾[5].

ئازادیی هاتوچۆ چواردە سەدە پاش پەسەندکردنی لە قورئانی پیرۆزدا، لە جاڕنامەی جیهانیی مافەکانی مرۆڤی ساڵی ١٩٤٨لە(م/١٣) دا هاتووە: (هەموو تاکێك مافی ئازادی گواستنەوەو هەڵبژاردنی شوێنی مانەوەی هەیە لەسنووری وڵاتدا، هەموو

---

[1] سورة البقرة : ٢٩ .
[2] سورة الانعام: ١١ .
[3] سورة العنكبوت: ٥٦ .
[4] النساء: ٩٧.
[5] سورة التوبة : ١٢٢ . قورئان یەکەم یاسایە لەسەر زەویدا لەکاتی دروستبوونەوە کەبڕیاری سیستەمی نێردراوان‌و هاتوچۆی لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر دابێت بەمەبەستی بەدەستهێنانی زانیاری.

تاکێك بۆی هەیە هەر وڵاتێك بەجێ بهێڵێت لەوانە وڵاتەکەی خۆی هەروەها بۆی هەیە بگەڕێتەوە بۆی).

## کۆتکردنی ئازادی هاتوچۆ:

بۆ بەرپرس (ولی امر) هەیە بۆ ماوەیەك ئازادی هاتوچۆ کۆت بکات ئەگەر بەرژەوەندی گشتی ئەو کۆتکردنەی دەخواست، هەروەك عومەری کوڕی خەتاب (خوا لێی رازی بێت) رێگریکرد لەگەورە هاوەڵانی کۆچەران و پشتیوانان لەبەجێهێشتنی شاری مەدینە بەمۆڵەتی ئەو نەبێت ئەمەش بۆ بەرژەوەندی موسڵمانان لەرێگەی سوودمەندبوون لەپرس و راپێکردنیان بەوپێیەی ئەهلی مەشورەت پێکردنن و تا هاریکاری بن لەپتەوکردنی بناغەکانی دەوڵەتی ئیسلامی تازە بونیات نراو.

لەوانەیە رێگریکردن بەهۆی تەندروستیەوە بێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (اذا سمعتم الطاعون بارض فلا تدخلوها، واذا وقع بارض وانتم فيها فلا تخرجوا منها)[1].

واتە: ئەگەر بیستتان لەشوێنێك تاعون بڵاو بۆتەوە ئەوا مەچنە ئەو شوێنە، ئەگەر لەشوێنێکیش بڵاوبوویەوە و ئێوە لەوێ بوون لەو شوێنە مەچنە دەرەوە.

ئیسلام تەنها بە بەخشینی مافی ئازادیی هاتوچۆوە نەوەستاوە، بگرە پارێزگاری لە سەلامەتیی هاتوچۆیش کردوە لەرێی سەپاندنی توندترین سزا بەسەر چەتە رێگرەکان کە هەڕەشە لە ماڵ و گیانی رێبواران دەکەن. خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الْأَرْضِ فَسَادًا أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلَافٍ أَوْ يُنْفَوْا مِنَ الْأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾[2].

---

[1] بڕوانە: صحيح البخاري: ٣/١٢٨١، وصحيح مسلم: ٤/١٧٣٧.

[2] المائدة: ٣٣.

# بەشی سێیەم

## مافی ئازادی مەعنەوی

## (ئازادی ئاین و بۆچوون و بیرکردنەوە و ئیجتیهاد)

## حق الحرية المعنوية
## ( حرية الدين والرأي والتفكير والاجتهاد )

باسکردنی ئەم چوار ئازادییە لەچوار دەروازەدا دەخەینە روو.

# دەروازەی یەکەم:
# ئازادی ئاینی لەقورئانی پیرۆزدا

## (الحريات الدينية في القرآن الكريم)

هەندێك [1] بانگەشەی ئەوەیان کرد کەهەموو ئەوانەی لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە وەك: (اعرض، وتولى عنهم، وذرهم)و هاوشێوەکانیان بەئایەتی شمشێر سڕاوەتەوەو شتێك لەئیسلامدا بەناوی لێبوردەیی بەرانبەر ناموسڵمان نەماوەتەوە، لەکتێبە (الناسخ‌والمنسوخ)ەکەشیدا بۆ ئەوە چووە کەهەموو ئایەتەکانی لێبوردەیی بەرانبەر ناموسڵمان سڕاوەتەوە (نەسخ بۆتەوە)، وایدەبینێت پێویستە لەسەر هەرکەس کەتوانای هەڵگرتنی چەکی هەیە لەدژی ناموسڵمان بجەنگێتو پێی بڵێت موسڵمان ببە ئەگینا دەتکوژم تەنها ئەوانە نەبێت کە (ذمي)ن، دەشڵێت ئایەتی شمشێر سەدوبیستو چوار ئایەتی سڕیوەتەوە لەقورئاندا پاشان کۆتایی ئایەتەکە سەرەتاکەی سڕیوەتەوە، ئەو ئایەتە سڕاوانەش هەموو پەیوەستن بەپەیوەندی ئاشتیانەی نێوان موسڵمانو ناموسڵمان.

ئەم ئاراستەیە هەمان ئەو ئاراستەیە کە ئیبن حەزمی ئەندەلوسی گرتوویەتیەبەر لەکتێبەکەیدا (الناسخ والمنسوخ فی القران الکریم) بەهەمان شێوە ئەبو جەعفەری

---

[1] لەوانە: هبة الله بن سلامة بن نصير بن علي البغدادي (ت٤١٠هـ) لەکتێبەکەیدا: الناسخ والمنسوخ . دراسة وتحقيق د.موسى بناني ، ص:٢٠٢ ومايليها ، ولبن حزم الاندلسي لەکتێبەکەیدا: الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم ، تحقيق د.عبد الغفار سليمان البغدادي ، طبعة بيروت ، ص:١٤ ومايليها.

نحاس[1] و هی تریش که بۆ ئەوەچوون کەهەموو ئەو ئایەتانەی لەبارەی چاك مامەڵکردنی موسڵمان لەگەڵ ناموسڵمان هاتبێت سڕاوەتەوە.

ئەمە لەکاتێکدا هەرکەس بەقوڵی لەتێکڕای ئەو ئایەتانە رابمێنێت کەفەرمان بەشەڕکردن دەکەن دەبینێت هەموویان بۆ بەرگری شەرعی گشتی هاتوون، هەرکاتێ ئیسلامو موسڵمانان گیانو ناموسو ماڵو ئاینیان لەوڵاتەکەیاندا رووبەرووی مەترسی بوویەوە، ئاشکرایە کەئیسلام ئاینی ئاشتیەو ناوەکەی لەچاوگی (سلام)ەوە وەرگیراوەو فەرمانیش بەمرۆڤ دەکات کەبەیانیانو ئێواران سڵاوکردنیان لەیەکتر (السلام علیکم ورحمه الله وبرکاته) بێت.

وشەی (السلم)و چاوگەکانی لەزیاتر لە (٨٠) ئایەتی قورئانی پیرۆزدا هاتووە، لەوانە: خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ادْخُلُوا فِي السِّلْمِ كَافَّةً وَلاَ تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ﴾[2]، ئەم ئایەتە پیرۆزە بەئاشکرایی بۆمان روون دەکاتەوە کەبەکارهێنانی هێز جگە لەحاڵەتی بەرگری رەوا (الدفاع الشرعي) شوێنکەوتنی فەرمانو رێنوێنیەکانی شەیتانە کەئەویش سەرسەخت ترین دوژمنی مرۆڤەکانە.

ئایەتی تریش هەیە بەراشکاوی بەڵگەیە لەسەر دروست نەبوونی پەنابردن بۆ هێز تەنها لەحاڵەتەکانی بەرگری رەوادا نەبێت، لەوانە: خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَقَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ﴾[3]، قورئانی پیرۆز نەهی کردووە لەهەموو لەرادە دەرچوونێکی سنووری بەرگری رەواو فەرمانی کردووە کەوەڵامدانەوەی دەستدرێژی لەرووی رادەو چۆنیەتیەوە یەکسان بێت بەدەستدرێژیەکە، هەموو لەرادە دەرچوونێك لەبڕی پێویست دەبێتە هۆی

---

[1] ئەویش محمدی کوڕی احمد کوڕی اسماعیل الصفار لەکتێبەکەیدا: الناسخ والمنسوخ في القران.

[2] سورة البقرة: ٢٠٨.

[3] سورة البقرة: ١٩٠.

گــۆڕانی دەســـتدرێژیکراوە ســـەر بـــۆ دەســـتدرێژیکارو دەســـتدرێژیکاریش بـــۆ دەستدرێژیکراوەسەر، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَمَنْ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾[1].

قورئانی پیرۆز فـەرمان بەموسـڵمان دەكـات كـە لەڕێگـەی ئامۆژگـاریو بانگـەوازو دانـایيو گفتوگـۆی زانسـتیەوە بـانگی ناموسـڵمان بكـات بۆسـەر ڕێگـەی ڕاسـتو موسڵمانبوون، هەروەك خوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾[2].

ناموسڵمانیش بۆی هەیە لەهەر وڵاتێكی ئیسلامیدا بەئاشتيو ئاسایش بژی ئەگـەر تـاوانێكی دەسـتدرێژی ئـەنجام نـەدابێتو ئـازادی بـەجێهێنانی هـەموو دروشمـە ئاینیەكانی خـۆی هەیـە بـەپێی بیروباوەڕەكـەی ئەگـەرهاتوو پێچـەوانەی سیسـتەمی گشـتيو ئـادابی گشـتی نـەبوو، بنـەمای چەسـپاو لەئیسـلامدا ئەوەیـە: (ئـەوەی بـۆ موسـڵمان هەیـە بـۆ ناموسـڵمانیش هەیـەو ئەوەشـی لەسـەر موسـڵمانە لەسـەر ناموسڵمانیشە)، قورئانی پیرۆز زۆرلێكردنی هەركەسێكی بۆ موسـڵمانبوون لەبـەر دوو هۆكار حەرام كردووە:

**هۆكاری یەكەم**: زۆرلێكردن ئەگـەر زاڵبـوو بەسـەر جەسـتەی مرۆڤـدا ئـەوا ناتوانێـت زاڵبێت بەسەر دڵی مرۆڤو ئەو بیروباوەڕەی تێیدایەو باوەڕی پێیـەتی، چـونكە ئـاین بـاوەڕی مكـوڕی چەسـپاوی هاوتـای واقیعـە بـەخوای گـەورەو ئـەو بیروباوەڕانـەی تـر كەئـەم باوەڕهێنانـە لێـی دەكەوێتـەوە لەگـەڵ ئەركـە ئاینیەكاندا.

**هۆكاری دووەم**: زۆرلێكردنی هەر مرۆڤێك لەسەر بیروباوەڕێكی ئاینی یاخود سیاسی

---

[1] سورة البقرة :١٩٤ .

[2] سورة النحل : ١٢٥ .

لەکاتێکدا لەناخەوە بڕوای پێی نەبێت ئەوا دەیکاتە مرۆڤێك دووڕوو (مونافق) کەرووکارەکەی بەجۆرێکەو ناواخنیشی بەشێوەیەکی ترە، ئیزدیواجی یاخود دووڕوو لەهەر کۆمەڵگایەکدا مەترسی لەدوژمن زیاترە، لەشاهێدییە مێژووییەکان شکستی موسڵمانان لەشەڕی ئوحوددا بەهۆی بوونی هەندێك دووڕوو بوو لەنێویاندا، لەبەر ئەم دوو هۆکارەو هۆکاری تریش خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنْ الغَيِّ...﴾[1].

پێغەمبەر لەبەربەرژەوەندییان ویستی زۆر لەهەندێك لەقوڕەیشیەکان بکات تا موسڵمان ببن خوای گەورە بەپرسیاری نەرێنی (الاستفهام الانكاري) سەرزەنشتی کردو، فەرمووی: ﴿وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لآمَنَ مَنْ فِي الأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا أَفَأَنْتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ﴾[2]. هەروەها خوای گەورە لەچەندین ئایەتدا بۆ پێغەمبەری روون کردۆتەوە کەئەرکی ئەو گەیاندنی پەیامەکەیە پێیانو بەکارنەهێنانی هێزە کەنابێت بەکار بێت تەنها لەحاڵەتی بەرگری رەوادا نەبێت، لەو ئایەتانەش خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿...وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلاَّ الْبَلاَغُ الْمُبِينُ﴾[3] و خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاَغُ الْمُبِينُ﴾[4]، و خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَإِنْ أَعْرَضُوا فَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا إِنْ عَلَيْكَ إِلاَّ الْبَلاَغُ...﴾[5].

هەندێك لەموسڵمانانی توندڕەو بانگەشەی ئەوەیان کردووە کەئەم ئایەتانەو هاوشێوەکانیان بەئایەتی شمشێر سڕاوەتەوە، ئەمەش بانگەشەیەکی بەتاڵەو لێخۆشبوونی بۆ نیەو، قورئانی پیرۆز لەهەموو ئەو ئایەتانەی پەیوەستە بەحوکمەکانی پەیوەندی نێوان گەلانو نەتەوەکان داوای ئەوەمان لێدەکەن کەبگەینە

---

[1] سورة البقرة : ٢٥٦ .

[2] سورة يونس : ٩٩ .

[3] سورة النور : ٥٤ .

[4] سورة النحل : ٨٢ .

[5] سورة الشورى : ٤٨ .

ئەو بڕوایەی کەبنەڕەتی ئەو پەیوەندیانە ئاشتییەو، شەڕ تەنها بۆ کاتی جیایەو تـەنها لەحاڵەتی بەرگری رەوادا پەنای بۆ دەبرێت.

**بناغەی ئەو رێسا شەرعیانە لەقورئانی پیرۆزدا زۆرە، لەوانە:**

**بنچینەی یەکەم: هاوڕەچەڵەکی (وحدە النسب):** هەموو تاکەکانی خێزانی مرۆڤایەتی لـە رابـردوو و ئێستا و ئایندەدا خوشـك و بـران لەبەرئـەوەی رۆڵـەی یـەك بـاب (ئادەم) و یـەك دایك (حـەوا)ن. رەوشـتی برایـەتیش بریتییـە لـە مامەڵـەکردنی یەکسانە لەگەڵ ئەویتر بەبێ جیاکاری بەمەبەستی سوود وەرگرتن لەچاکیەکانی سەرزەوی، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَـى وَجَعَلْنَـاكُمْ شُـعُوبًا وَقَبَائِـلَ لِتَعَـارَفُوا إِنَّ أَكْـرَمَكُمْ عِنْـدَ اللَّـهِ أَتْقَـاكُمْ إِنَّ اللَّـهَ عَلِـيمٌ خَبِيرٌ﴾[1].

**بنچینەی دووەم: هاوکانزایی:** هەموو مرۆڤێك لە کانزایەك دروست کراوە و دەکرێ کە خاکە، لەبەرئەوەی هەموو مرۆڤێك لە سـپێرمی نێرینـە و هێلکـەی مێینـە خـەلق دەبـێ، کـە کـرۆك و پوختــەی خـوێنن. خـوێنیش کـرۆك و پوختــەی ئـەو مـادە خۆراکیانەیە مرۆڤ بۆ بەردەوامیی ژیانی دەیانخوات. مادە خۆراکیەکانیش کـرۆك و پوختەی خاکن. لەم روانگەیەوە هەموو مرۆڤێك بە ناڕاستەخۆ لـە خـاك خـەلق کراوە و دەکرێ. کانزای هەندێ کەس بۆ نموونـە ئـاڵتون نیـە و هـی هەنـدێکیتر مس بێ تا پۆلی یەکەم فەزڵیان بەسەر دووەمەوە هەبێ. خوا دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ إِذَا أَنْتُمْ بَشَرٌ تَنْتَشِرُونَ﴾ الروم/٢٠.

پێغەمبەرﷺ لە حەجیماڵئاواییدا جەختی لـەم دوو بنچینەیە کـرد و فـەرموی: (کلکم من آدم وآدم من تراب لا فضل لعربي على أعجمي ولا لأبـيض علـى أسـود الا بـالتقوى)، واتـە بـەوزەی رۆحـی کـەمرۆڤ لـەخوا نزیـك دەکاتـەوەو بـەوەش دەیکاتە تاکێکی بەسوود بۆ مرۆڤایەتی، وەك پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (أفضـل

[1] سورة الحجرات الآية (١٣).

الناس أنفعهم للناس).

**بنچینەی سێیەم: هاوبەدیهێنەری:** بەدیهێنەری سەرجەم مرۆڤایەتی خوایە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾[1].

**بنچینەی چوارەم: هاوئاینی:** ﴿شَرَعَ لَكُمْ مِنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ كَبُرَ عَلَى الْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ اللَّهُ يَجْتَبِي إِلَيْهِ مَنْ يَشَاءُ وَيَهْدِي إِلَيْهِ مَنْ يُنِيبُ﴾[2].

**بنچینەی پێنجەم: یەکێتیی بەرژەوەندی هاوبەش:** خوای گەورە گۆی زەوی بەوەی لەسەر زەوی‌و ژێر زەویدا بۆ بەرژەوەندی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەبێ جیاوازی کەس بەسەر کەسی تردا دروست کردووە، خوا دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ...﴾[3].

**بنچینەی شەشەم: هاوچارەنووسی:** خەڵك هەموو لەم چارەنووسەدا یەکسانن ئەویش مردن و بەجێهێشتنی ژیانی دنیایە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا...﴾[4]. لەئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَى﴾[5] لەئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿أَيْنَمَا تَكُونُوا يُدْرِكْكُمُ الْمَوْتُ وَلَوْ كُنْتُمْ فِي بُرُوجٍ مُشَيَّدَةٍ﴾[6].

**بنچینەی حەوتەم: هاوبەرپرسیارێتی‌و پاداشت:** ئەگەر کارەکە باش بێت پاداشتەکەیان باش و ئەگەر خراپیش بن پاداشتیان خراپ دەبێ، خوای گەورە

---

[1] سورة البقرة الآية (٢١).
[2] سورة الشورى الآية (١٣).
[3] سورة البقرة الآية (٢٩).
[4] سورة الملك : ٢.
[5] سورة طه : ٥٥.
[6] سورة النساء: ٧٨.

دەفەرمووێت: ﴿فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ ، وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ﴾[1].

لەم ئایەتانەو ئایەتی تریش ئەو دەرئەنجامەمان دەستدەکەوێت کەئیسلام ئاینی ئیرهاب نیە، ئەوەشی لەدەربڕینی ئیرهاب هاتووە لەم ئایەدا: ﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ...﴾[2]، مەبەستی لێی ترساندنە نەك هێرش بردنو دەستدرێژی بۆسەر کەسی تر، هێزی سەربازی بەهەموو جۆرەکانیەوە لەهۆکارەکانی خۆپاراستنە چونکە دوژمن ئەگەر زانی لایەنی بەرانبەر ئەوەندە هێزی جەنگی هەیە بەرگری لەخۆی پێ بکات ئەوا واز لەهەڕەشەو دەستدرێژی دەهێنێتو بەمەبەستی چارەسەری کێشەکان بەرێگاچارەی ئاشتیانە لەسەر مێزی گفتوگۆ لەگەڵی دادەنیشێت.

بەڵام ئەگەر بینی لایەنی بەرانبەر لاوازە ئەوا بەجۆرێك مامەڵەی لەگەڵ دەکات کەخۆی لەسەرەوەی یاساو بەڵێننامەی نەتەوە یەککگرتووەکانو نەریتە نێودەوڵەتیەکانە، وەك ئەو هەڵسو کەوتە بێ ئابڕوانەو دەستدرێژیە دووبارەبوانەی ئێستا لەلایەن هەندێك دەوڵەتەوە بۆسەر دەوڵەتی تر دەبینرێت، چونکە لایەنی دەستدرێژیکار دەزانێت لایەنی بەرانبەری چەندە لاوازە لەرووی کارگێڕیو هێزەوە.

ئەمەیە قورئانی پیرۆز ئەگەر ئەم دەستوورە مەزنە نەمرە لەو ئەفسانانەی خزێنراوەتە ناو تەفسیرەکانی رزگار بکرێتو، موسڵمانان بەشێوەیەکی راستو دروست کاری پێ بکەن ئەوا دانیشتوانی سەرزەوی بەئارامی دەژیان چونکە ئاینی ئاشتیو خۆشەویستیو پێکەوەگونجانو، ئاینی زانستو کارو فیترەتی ساغو سیستەمی ژیانە لەهەردوو جیهانی دونیاییو قیامەتیدا.

---

[1] سورة الزلزلة الآية (٧–٨).

[2] سورة الانفال : ٦٠.

# دەروازەی دووەم:
# ئازادی بیروڕا

## (حرية الرأي)

قورئانی پیرۆز لە(٤٩)ئایەتدا فەرمانی کردووە بەبەکارهێنانی عەقڵی ساغو دروستو، فەیلەسوفە موسڵمانەکانیش لەنێویاندا غەزالی (رەحمەتی خوای لێبێت) وتوویەتی: (العقل والنقل (الشريعة الاسلامية) صنوان كل منهما يكمل الآخر) واتە: عەقڵو نەقڵ (شەریعەتی ئیسلامی) دوو بەشن تەواوکاری یەکترنو ئەمیان ئەویان تەواو دەکات، لەبەر ئەوە تەنها دەستگرتن بەنەقڵ بەبێ بەکارهێنانی عەقڵ ئەو ئامانجانە ناهێنێتەدی کەلەپێناویدا نەقڵ داڕێژراوە، هەروەك ئەوەی بەکردارییی لەژیانی جیهانی ئیسلامی دواکەوتوو لەکاروانی شارستانیەتی تەکنەلۆژی وڵاتە پێشکەوتووەکان سەلمێنراوە بەهەمان شێوە تەنها دەستگرتن بەعەقڵ بەبێ نەقڵ مرۆڤ بەرو تیاچوون دەبات، وەك ئەوەی لەژیانی هاوچەرخماندا سەبارەت بەوانەی کەدوورن لەئاینو وزەی رۆحی کەلەئاینەوە سەرچاوە دەگرێت دەبینرێت.

لەباشیەکانی بەکارهێنانی عەقڵ لەخستنەرووی بیروڕاو راوێژکردندا، قورئانی پیرۆز فەرمان بەفەرمانڕەوای هەموو کۆمەڵگایەکی ئیسلامی دەکات کەتەنها بەویستی تاك لایەنانەی خۆی بڕیار دەرنەکات، ئەگەر ئەو بڕیارە پەیوەندار بوو بەبەرژەوەندی گشتیەوە، بەڵکو پێویستە لەسەری راوێژ بەکەسانی خاوەن بۆچوون بکات هەرکەسە لەپسپۆڕی خۆیدا، لەمبارەیەوە رووی بانگەشەی دەکاتە پێغەمبەر (ﷺ)و ئەم فەرمانە هەموو بەرپرسێکی جیهانی ئیسلامیش دەگرێتەوە لەهەموو کاتو شوێنێکدا:

﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ﴾، راوێژ پێکراو پێویسته راستگۆ بێتو بۆچوونی خۆی بۆ ئەو بەرپرسە بەوپەڕی راستگۆیی‌و بوێرییەوە باس بکات، دوور لەهەر خۆپیاهەڵواسین‌و ماستاوچێتی‌و دووڕوویی‌و ترس‌و لایەنگرییەکەوە، گەیاندنی راستی بەبەرپرسان لەلایەن راوێژکارانەوە بەشێوەیەك کەپێچەوانەی ئەوە بێت کەبەراستی دەبینن‌و بڕوایان پێیەتی، ناپاکیە لەگەڵ خودا پاشان لەگەڵ ئەو بەرپرسەو لەگەڵ کۆمەڵگەکەشیان، بەهەمان شێوە ناپاکی نیشتمانیە بەرپرسیارێتی خراپ گەیاندنی بۆچوونەکەیان کەپێچەوانەی واقیع‌و راستی‌و بەرژەوەندی کۆمەڵگایە لەبەردەم خوای گەورەو پاشان لەبەردەم کۆمەڵگادا دەکەوێتە ئەستۆیان، قورئانی پیرۆز خەسڵەتەکانی کەسی بەرپرس‌و بەرپرسیار لەوانەی لەژێر قەڵەمڕەویدان روون کردۆتەوەو روودەکاتە پێغەمبەر (ﷺ)و فەرمانی پێدەکاتو مەبەستی لەو فەرمانە هەموو بەرپرسێکە کەفەرمانڕەوایەتیەکی کارگێڕی بگرێتە دەست لەهەر کاتو شوێنێداو دەفەرمووێت: ﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِنْ اللَّهِ لِنْتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنْتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانْفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ﴾[1].

قورئانی پیرۆز خەسڵەتەکانی مرۆڤی تەواوی روون کردۆتەوە کە بەچەند خەسڵەتێك جیاوازە لەکەسانی تر و بەو خەسڵەتانە خزمەتی خۆی‌و کۆمەڵگاکەی دەکاتو پەروەردگاری لەخۆی رازی دەکات، لەدیارترینی ئەو خەسڵەتانەش راوێژکردن‌و بەکارهێنانی بیروبۆچوونە بەمەبەستی گەیشتن بەراستو دروست، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَمَا أُوتِيتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَمَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَمَا عِنْدَ اللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَى لِلَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ، وَالَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ وَإِذَا مَا

---

[1] سورة ال عمران : ١٥٩ ، الفظ= واتە: رەفتار خراپ ( سيء الخلق ) ، وغليظ القلب= بریتیە لەدڵڕەق (القاسي)، لەسەر فەرمانڕەوا پێویستە کەخەسڵەتی لێبوردەیی تێیدا زاڵ بێت بەسەر خەسڵەتی سزادا چونکە مەبەست لەسزا بریتیە لەچاکسازی بەرێگایەکی تر جگە لەرێگای سزا پێویستە ئەوەیان هەڵبژێرێت.

غَضِبُوا هُمْ يَغْفِرُونَ، وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ﴾ [1].

ئازادی بیروڕا سەرەڕای ئەوەی قورئانی پیرۆز فەرمانی پێکردووە لەگەڵ ئەوەشدا رەها نیە، بەڵکو کۆت کراوە بەوەی ئەو بیروڕایە لەخزمەتی بەرژەوەندی گشتیدا بێتو دوور بێت لەمەبەستە کەسیەکانو بەرژەوەندی تایبەت، نابێت خاوەنی بیروبۆچوونەکە لەلایەنێکی دوژمنکارەوە ئاراستە کرابێتو، نابێت بۆچوونەکەی پێچەوانەی سیستەمی گشتیو ئادابی گشتی بێت.

---

[1] سورة الشورى: ٣٦-٣٨.

# دەروازەی سێ یەم:
# ئازادی بیرکردنەوە

ئاشکرایە ئازادی بیرکردنەوە لەرووی کرداریەوە پێش ئازادی بیرورا دەکەوێت، چونکە هەموو بۆچوونێك کەبەبێ تێروانین‌و بیرکردنەوەت بەزۆری راست دەرناچێت، بیرکردنەوە هەروەك فەیلەسوف‌و زانایانی لۆژیك ناویان بردووە بریتیە لەرامان بەبەرچاوروانی (النظر بالبصیرة)، ئەویش تێبینیکردنی مەعقولی زانراوە بۆ بەدەسیتهێنانی نەزانراو (مجهول)، بەوەی مرۆڤ بیربکاتەوە لەزانیاریە تۆمارکراوەکانی لەمێشکیدا لەو وێناکراوەییەکان(تصورات)و بەڕاستزانراوەکان (تصدیقات)ەی کەخۆی بەدەستی هێناوە یاخود لەنەوەی پێش خۆی بۆی ماوەتەوە، ئەمەش بەشیکردنەوەی‌و رێککردنی بەمەبەستی بەدەستهێنانی زانیاری نوێ لە وێناکراوەییەکان(تصورات)و بەڕاستزانراوەکان (تصدیقات) کەلای نەوەی پێشتر نەزانراو بووە، تا ئەم زانیاریانەی ماوەتەوە لەنەوەی پێشتر زیادەی بخاتە سەرو بیگەیەنێت بەنەوەی دواترو بەو شێوەیە ئەوانیش بۆ نەوەکانی تری بگوێزنەوە.

ئاشکرایە شارستانیەتی هەر ئومەتێك بەرهەمی یەك نەوە نیە، بەڵکو نەوە یەك لەدوای یەك هاتووەکان تێیدا بەشدار بوون‌و پێشکەوتنی هەر کۆمەڵگایەك‌و دواکەوتنی بەژمارەی بیرمەندەکانی ئەو کۆمەڵگایەو بەبەکارهێنانی بیرکردنەوەیان لەگەشەپێدانی کۆمەڵگاکەیان لەباشەوە بۆ باشترو لەچاکەوە بۆ چاکتر دەپێورێت، هەموو ئەو ئایەتانەی قورئانی پیرۆز کەلەرەوش‌و حاڵو چارەنووسی نەتەوەکانی پێشتر دەکۆڵێتەوە هەموویان بۆ بیرخستنەوەی مرۆڤەکان‌و بیرکردنەوەیە لەحاڵو رەوشیان تا پەندیان لێوەربگیرێت‌و ئەوەی چاکە ئەوان ئەنجامیان داوە ئەمانیش

دەستی پێوە بگرن و ئەوەی خراپ بووە خۆیانی لێ دوور بگرن، هەروەك خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِأُولِي الأَلْبَابِ...﴾ [1]، لەبەر گرنگی بیرکردنەوە لەبەختەوەری دونیاو قیامەتدا قورئانی پیرۆز لە زیاتر لە هەشتا ئایەتدا فەرمانی کردووە بەبیرکردنەوە، لەوانە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿....كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ﴾ [2]، لەئایەتێکی دیکەدا هاتووە: ﴿هَلْ يَسْتَوِي الأَعْمَى وَالْبَصِيرُ أَفَلاَ تَتَفَكَّرُونَ﴾ [3]، هەروەها دەفەرموویت: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لِّأُولِي الأَلْبَابِ، الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذا بَاطِلاً سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾ [4].

بۆ جەخت کردنەوە لەوەی کەلەقورئاندا هاتووە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویت: (لا تكونوا إمعه تقولون ان احسن الناس احسنّا وإن ظلموا ظلمنا، ولكن وطنوا أنفسكم إن احسن الناس ان تحسنوا وان اساءوا فلا تظلموا) [5].

واتە: ڕاڕا مەبن بڵێن ئەگەر خەڵکی باشی کرد ئێمەش باش دەکەین ئەگەر ستەمی کرد ئێمەش ستەم دەکەین، دڵ و دەروونتان ڕابێنن خەڵك چاکەی کرد ئێوەش چاکە بکەن ئەگەر خراپەیان کرد ئێوە ستەم مەکەن.

لەو ئایەتانەی خرانە ڕوو و چەندین ئایەتی دیکەش دەگەینە ئەو ئەنجامەی ئیسلام تا چ ڕادەیەك گرنگی داوە بەبیرکردنەوەو بەکارهێنانی بۆچوون و ئیجتیهاد.

---

[1] سورة يوسف: ١١١ .

[2] سورة البقرة : ٢١٩ .

[3] سورة الانعام : ٥٠ .

[4] سورة آل عمران : ١٩٠–١٩١ .

[5] صحيح الترمذي بشرح ابن العربي – باب البر والصلة : ٨/١٧٠ .

# دەروازەی چوارەم:
# ئازادی ئیجتیهاد

## ( حرية الاجتهاد )

ئیجتیهاد لە "جهد-کۆشان"ەوە وەرگیراوە لە رووی زمانەوانییەوە بە "ضم الجیم و فتحها"-واتە پیتی جیمەکە بۆری لەسەر بێت یان سەر بە چەند جۆرێك لە مانا هاتووە کە نزیکترینیان بۆ مانای زارارەیی وشەکە بریتییە لە "الطاقة-توانین"

لەرووی زاراوەیی زانایانی شەریعەتەوە بریتییە لە: بەخشینی توانای فیکری و جەستەیی بۆ دۆزینەوەی حوکمێکی شەرعی راستەقینە لەبڕوای ئەودا بۆ بابەتێکی دیاریکراو تا حوکمەکەی بزانێت[1] لەکاتی نەبوونی دەق لەبارەیەوە، بەڵام لەکاتی بوونی دەقدا ئەوا بواری ئیجتیهاد نیە، لەبەر ئەو رێسا شەرعیە هاودەنگ لەسەرە: (لا مساغ للإجتهاد في مورد النص)واتە: لەکاتی هەبوونی دەقدا بواری ئیجتیهاد نیە، بۆ نمونە: قورئانی پیرۆز بەدەق خستویەتیە روو کەتەڵاق بەسەر سێ جاردا دابەش کراوە: (الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ[2]) لێردا (التَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ) جاری سێیەمە، لەبەر ئەوە هەموو ئیجتیهادێك بۆ ئەم دەقە بەتاڵە ئیدی موجتەهیدەکە هەر کەس بێت، وتنی ئەوەی هەرسێ تەڵاقەکە بەیەك جار دەکەوێت بەتاڵە.

---

[1] (اصول الفقه الإسلامي في نسيجه الجديد)ی دلنەر: ٢\٤٧٣.

[2] سورة البقرة : ٢٢٩.

لەرووی زاراوەناسی پێڕی پیشەسازیکاران‌و بەرهەمهێنانەوە واتە کۆششی پسپۆڕان ئەوەندەی لەتواناياندايە لەوزەی فیکری‌و جەستەییەوە لەهەموو بوارەکانی پسپۆڕێتیەکەيدا لەپێناوی گەشەی پێشترو بەرهەمی نوێتر.

لەو ئایەتە پیرۆزانەی فەرمان بەئیجتیهاد دەکات لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە: ﴿...فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الأَبْصَارِ﴾ [1]، لەئایەتێکی دیکەدا هاتووە: ﴿وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ....﴾ [2]،لەئایەتێکی دیکەدا هاتووە: ﴿وَقُلْ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ وَسَتُرَدُّونَ إِلَى عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ [3].

دەستوری خودا (قورئانی پیرۆز) دەستورێکی نەمرەو ئەرکی دەستوور نەخشەسازی‌و پلاندانان‌و بەتەنها لەخۆگرتنی گشتیەکان‌و خوای گەورە دانانی یاساکانی بەپێی پێداویستیەکان سەرپشك کردووە، بەمەرجێك ئەوە پێچەوانەی بنەماکانی دەستوور نەبێت، بەهەمان شێوە قورئانی پیرۆز دەستوورێکی خوایی نەمرەو تەنها بنەما گشتی‌و رێسا گشتیەکانی لەخۆ گرتووەو، عەقڵی موجتەهیدەکانی سەربەست کردووە تا بەشەکیەکان بگێڕنەوە بۆ ئەو هەمەکیانە بەپێی پێداویستیەکانی ژیان، بازنەیەکی لەرەوشت دروست کردووە و بەعەقڵی مرۆڤی وتووە لەسنووریدا بەپێی پێداویستیەکانی ژیان‌و بەگوێرەی کات‌و شوێن بجوڵێتەوە بەو مەرجەی ئەو جوڵانەوەیە لەسنووری ئەو بازنەی رەوشتەدا بێت، هەموو کۆمەڵگایەکی شارستانی ئەو زانیاریانەی کەبۆی دەمێنێتەوە لەنەوەی پێش خۆیەوە بەکاردەهێنێت‌و زانیاری نوێی دەخاتە سەر تا لەگەڵ ئەوەی بۆی بەجێهێڵریوو ئەمیش بۆ نەوەی نوێی بەجێ بهێڵێت‌و بەوجۆرە.

---

[1] سورة الحشر: ٢ .

[2] سورة البقرة : ١٤٨ .

[3] سورة التوبة : ١٠٥ .

بەپێچەوانەی ئەوەی جیهانی ئیسلامی تێدایە لەوتنەوەی ئەوەی پێشینان وتوویانە بەبێ ئەوەی هیچی نوێی بخاتەسەر، لەبەر ئەوە دەبینین کۆمەڵگای ئیسلامی لەکاروانی شارستانی مرۆڤایەتی دواکەوتووەو خێرو بێرەکەی پارووییەکی چەورەو پێشکەشی جیهانی ناموسڵمانیان کردووە، بەرپرسیارێتی ئەمە دەکەوێتە ئەستۆی هەموو ئەوانەی لەپێڕی موجتەهیدانن.

## ئیجتهیاد و مەرجەکانی

ئیجتیهاد لەرووی زمانەوانیەوە لەچاوگی (جهد) [1] وەرگیراوە بەواتای خستنەکاری وزەی جەستەیی [2] و فیکری، لەرووی زاراوەیشەوە پێناسەی زۆرەو هەموویان لەیەك ئاراستەدا دەخولێتەوە، ئەویش بریتییە لەوەی: (کە زانای شایستە و شیاو، توانای [3] زانایەتی خۆی بخاتە کار، بۆ ئاشکراکردنی ئەو بڕیارو یاسایانەی کە داواکراون و پێویستن‌و، ئیجتیهادیش تەنها کورت نەکراوەتەوە لەسەر ئاشکرا کردن و دۆزینەوەی بڕیاری شەرعی راست بەپێی تێڕوانینی بۆ بابەتێکی دیاریکراوی تایبەت بەحوکمەکە).

لەپێناسەکەیەوە کەئیجتیهاد لەحوکمە شەرعیەکاندا لەسەر ئەم مەرجانە راوەستاوە:

**أ- پێویستە ئەو کەسەی پێی هەڵدەستێت شارەزا (فەقیە) بێت‌و ئەم خاسیەتانەی تێدا بێت:**

١- شارەزابوون لەبنەماکانی (نحو)و (صرف)و رەوانبێژی، چونکە حوکمەکان لەزمانی بنەرەتیەوە کەعەرەبیە لەقورئان‌و فەرموودە وەردەگیرێت نەك

---

[1] الصحاح في اللغة والعلوم : ١\٢١٦.

[2] وەك پێداچوونەوە بەپێشەکیەکانی بابەتەکەو ئاگاداربوون لەحوکمی کێشە هاوشێوەکانی‌و هەوڵدان بۆ زانینی بۆچوونی کەسانی ترو کاری لەو شێوەیە ئەمانە دەچنە چوارچێوەی هەوڵی جەستەییەوە سەرەرای هەوڵی فیکری.

[3] - مەبەست تواناو وزەی هزریی، (مەعنەوی) و هەروەها توانای جەستەیی (ماددی).

لەوەرگێرانەوە ئیدی زمانەکەی تر هەرچیەك بێت.

٢- شارەزابوون بەرێساکانی اصولی فیقهو مەنتیقو فەلسەفە بۆ ئاشنابوونی تایبەتمەندی دەستەواژەکانو رووەکانی مانابەخشینی لەسەر حوکمەکانو رێگاکانی هەڵگوستن (وطرق الاستنباط).

٣- بایەخدان بەزانستەکانی فەرموودە بۆ زانینی جۆرەکانیو پلەی هێزی پەیوەستییان.

٤- ئاگاداربوون لەمەبەستەکانی شەریعەتو بەرژەوەندییە دونیاییو قیامەتیەکانیو جیاکردنەوەیان لەخراپەکاریەکان (المفاسد)و تێگەیشتن لەپەیوەندی نێوان شەریعەتو ژیان، چونکە نەشارەزا لەواقیعی ژیانو پێویستیەکانی لەو پەیوەندییە ئاگادار نابێتو بەو هۆیەشەوە دەکەوێتە هەڵە لەچارەسەری کێشەکاندا.

٥- پابەند بێت بەشەریعەتو خاوەن بەهاو رێزو دوور لەکاری خراپە بێت.

٦- ئاگاداربوون لەبنەما فیقهیە نووسراوەکانی هەموو مەزهەبەکان تا مەبەستی حوکمەکانو گەرانەوەی بەشەکی (جزئي)یەکان بۆ گشتیەکان (کلیات) تێ بگات، چونکە ئەو بنەمایانە وەك بیردۆزەکان لەیاسادانراوەکاندا وەهان.

٧- هەبوونی زانیاری فراوان لەو بابەتانەدا کەجیارایی فیقهیان لەبارەوە هەیە لەگەڵ لێکدانەوەو شیکاریو ئەنجام دەرهێنانو پەسەندزانی.

٨- زانینی رێگاکانی هەڵگوستنی زانایان لەهاوەڵانو شوێنکەوتوانو ئوصولی مەزهەبە فیقهیەکان.

ب- بەگەرخستنی ئەوەی لەتوانایدا لەوزەی زانستیو کۆششی فیکریو مەلەکەی فیقهی بۆ گەیشتنە حوکمی خوا لەو بابەتەی داوای لێکراوە بەو پەری وردەکارییەوە نەك بەوەی بەمەبەستەکە بگات لەبەر ئەمەیە لەحاڵەتی نەدۆزینەوەی حوکمەکەشدا پاداشتی بۆ هەیە.

ج- پێویستە مەبەست لەئیجتیهاد ئەوە بێت کەمترینی گومانی هەبێت کە ئەوەی پێی گەیشتووە حوکمی خوای گەورەیە، بابەتە دیاریکراوەکەش بەحوکمەکە لەوبابەتانە بێت کەئیجتیهاد هەڵدەگرێتو حوکمەکەی بەدەقێکی بنبڕی یەکلاکەرەوە یاخود بەکۆدەنگی یەکلا نەبووبێتەوە، لەگەڵ رەچاوکردنی رێسای: (الاجتهاد لا ینقض بالاجتهاد)، واتە: ئیجتیهاد بەئیجتیهاد هەڵناوەشێتەوە، ئەمەش بۆ دوورخستنەوەی ئاڵۆزی لەو حوکمانەی پێشتر دراونو سەقامگیری مامەڵە دارایی‌و نادارابیەکان، ئەمە ئەگەر هاتوو ئیجتیهادەکەی پێشتر دژ نەبوو لەگەڵ دەقێکی بەڵگە بنبڕ یاخود کۆدەنگی، چونکە ئەگەر وابوو پێویستە هەڵوەشێتەوە.

دەکرێت هەموو ئەم مەرجانە بگێڕینەوە بۆ سێ خاڵی سەرەکی، کەئەمانەن:

١.لە رۆحی شەریعەتی ئیسلام و ئامانجەکەی تێبگات.

٢.لە جەهەر و کرۆکی ژیان و داواکارییەکانی تێبگات.

٣.لە پەیوەندی نێوان شەریعەت و ژیان تێبگات.

### گرنگی ئیجتیهاد بەشێوەیەکی گشتی:

یەکەم: ئیجتیهاد لەپێویستیەکانی ژیانە کەئەگەر کەمو کورتی تێدا بوو ئەوا سیستەمی ژیان کەمو کورتی تێدا دەبێتو کۆمەڵگا دوا دەکەوێت بەوەش لەمیراتی زەوی‌و خێرو بێرەکەی بێبەش دەبێت[1]، ئەو گەشەسەندنە سەرسوڕهێنەرەی شارستانیەت ئەمرۆ هەیە بەرهەمی ئیجتیهادە، هەموو نەوەیەکی نوێ زانیاری لەنەوەی پێش خۆی وەردەگرێتو زانیاری نوێی دەخاتە سەرو سەرمایەو قازانج دەگەیەنێتە نەوەی دوای خۆی‌و بەو جۆرە بەردەوامی دەبێت، بۆ نمونە جیاوازی

---

[1] ئامارەیە بۆ ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِنْ بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ﴾ (سورة الانبياء: ١٠٥) مەبەست لەچاك (صالح) ئەو کەسەیە بەباشی بەرهەمی بێنێت.

نێوان شێوەی فرۆکە لەئێستاداو ئەو شێوەیەی کەیەکەمجار دروستکرا هەیبوو وەك جیاوازی نێوان ئاسمان‌و ڕێسمانە، ئیدی لەسەر فرۆکە ئامێرە تەکنۆلۆژیە هاوچەرخەکانی تریش پێوانە بکە کەجیهانی ئیسلامی لێیان بێبەش بووە، هەموو شتێك لەجیهاندا گەشەی کردووە تەنها فیقهی ئیسلامی نەبێت، خۆ ئەگەر لەسەر ئەو سەرمایە فیقهیە بنوسرایە کەپێشبینی چاك بۆیان بەجێهێشتووین تابەشێوەیەکی ڕاست سوودی لێوەربگیرایە، بەجۆرێك ئەوەی ڕۆڵێ نەماوە ڕەش بکرایەتەوە وەك نمونە بێکەڵکەکان لەوانە ئەو نمونانەی بەبەندەو جاریە هێنراوەتەوەو شتی نوێی بۆ زیاد بکرایە لەسەردەمی هەر نەوەیەکدا لەلایەن ئەو کەسانەوە کەخاوەن توانای زانستین‌و پابەندن بەبەها ئیسلامیەکانەوە ئەوا ئەم سەرمایە دەبووە سەرچاوەیەکی بەپیت بۆ هەموو یاساکانی وڵاتانی ئیسلامی‌و نائیسلامیش.

دووەم: هەروەك پێشتر باسمان کرد قورئانی پیرۆز دەستورێکی خواییە، تەنها میتۆدە گشتیی و یاساو ڕێسا گشتییەکانی هێناوە، وعەقڵ‌و بیری مرۆڤی سەرپشك کردوە، کە لە هەموو سەردەم و لە هەموو جێگایەکدا، بابەتە لاوەکییەکان بگەڕێنێتەوە سەربابەتە گشتییەکان‌و بە بەریاندا بیگرێت، ئەمەش تەنها لەڕێی ئیجتیهادەوە دەکرێت.

سێیەم: گومانی تێدا نیە دەقەکانی شەریعەتی ئیسلامی سنوردارن، لە کاتێکدا کە هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ و پێشهاتە پەیوەندیدارەکان بە مرۆڤەوە بێ سنورن و کۆتاییان نییە، بۆیە ناتوانین کە یاساو ڕێسای بابەتە بێ سنورەکان، لە چوارچێوەی بابەتی سنوردارەکاندا جێگا بکەینەوەو، کۆنترۆڵی بکەین‌و، بۆیە پرۆسەیەکی لەم شێوازە، تەنها لە ڕێی ئیجتیهاد کردنەوە چارەسەر دەکرێت، کە بچین بابەتە لاوەکییەکان (جزئیات) ببەینەوە سەر بابەتە هەمەکییەکان (کلیّات) و لەبەر ڕۆشنایی ئەم هاوکێشەیەدا، چارەسەریان بۆ بدۆزینەوە.

**حوكمی ئیجتیهاد (حكم الاجتهاد):**

لەگرنگیو پێویستی ئیجتیهادەوە دەگەینە ئەوەی كەحوكمەكەی فەرزی كیفایەیە لەسەر هەموو موسڵمانێك كەبتوانێت بگاتە پلەی ئیجتیهادو، ئامادەسازی خودیو پێگەیشتنی عەقڵی هەبێت، ئەم توانایەش تەنها بۆ ئیمامی ئەبو حەنیفەو ئیمامی مالیكو ئیمامی شافیعیو ئیمامی ئەبو جەعفەری صادقو ئیمامی ئەحمەدو ئیمامی زەیدو ئیمامی ئیبن حەزمو ئیمامی ئیبازیو فەقیهەكانی تری سەرمەزهەبی قوتابخانە فیقهیەكان (رەحمەتی خوایان لێبێت) نەبووە، چونكە ئیجتیهاد پەیام نیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِنْ رِجَالِكُمْ وَلَكِنْ رَسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ...﴾[1] واتە: موحەمەد باوكی هیچكام لەئێوە نەبووە نەبووە بەڵام پێغەمبەری خودایەو دوایینی پێغەمبەرانە، نەیفەرمووە: (ان ابا حنیفة او مالكاً او الشافعي او غیرهم خاتم الفقهاء)، واتە: ئیمام ئەبو حەنیفە یان مالیك یاخود شافعی یاخود ئەوانی تر كۆتا فەقیهن)، هەروەها هیچ دەقێك لەقورئان یاخود سوننەتی پێغەمبەردا نەهاتووە گوزارشت بێت لەوەی شوێنی بۆچوونی ئەو فەقیهانە بكەوین تا رۆژی قیامەتو دەقە فیقهیەكان وەك دەقی شەرعی پیرۆز بێت لامان، بەڵكو قورئانی پیرۆز پێمان دەفەرموێت: ﴿فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾[2]، واتە: لەكەسانی شارەزا پرسیار بكەن، كەسانی شارەزاش هەموو كەسێك دەگرێتەوەكەشیاوێتی ئیجتیهادكردنو فەتوادانی تێدا بێت لەهەموو كاتو شوێنێكدا، رووكاری ئەو ئایەتەش ئەوەی لێدەخوێنرێتەوە كەلاساییكردنەوەی مردوان دروست نیە، چونكە پرسیار ئاراستەی مردوو ناكرێت، بەڵكو لەسەرمان پێویستە رێز لەو زانایانە بگرینو دان بەچاكەو هەوڵەباشەكانیان بۆ ئومەتی ئیسلامی بنێینو، ئەوەی ئەوان بەجێیان هێشتوە لەسەرمایەی فیقهی لێی بەهرەمەند بین تا بۆچوونی نوێیان لێ بەرهەم

---

[1] سورة الاحزاب : ٤٠ .

[2] سورة الانبیاء : ٧ .

بێنین‌و، دەست لەوە هەڵنەگرین کەئەوان بونیاتیان ناوە بۆمان‌و واز لەو سەرمایە فیقهیە مەزنە نەهێنین کەئەگەر بەشێوەیەکی راست بخرێتەکار ئەوا دەبێتە زەمینەیەکی بەپیت نەك تەنها بۆ یاسا ئیسلامیەکان، بەڵکو بۆ یاسای وڵاتانی ئیسلامی‌و نائیسلامیش.

## لاسایکردنەوەو هۆکارەکانی:

لاسایکردنەوە (التقلید): بریتیە لەوەرگرتنی حوکمەکان لەیەك موجتەهیدی دیاریکراوەوەو دانانی وتەکانی وەك ئەوەی دەقی شەرعی بن لەلایەن خوای گەورەوە هاتبن پێویستە شوێنکەوتووانی پێیانەوە پابەند بێت.

هۆکارەکانی بڵاوبوونەوە لاسایکردنەوە پاش ئەو راپەرینە فیقهیە زۆرن، گرنگترینیان ئەمانەیە:

١- **لاوازی سیاسی دەوڵەتی ئیسلامی:** هەر لە سەرەتای سەدەی چوارەمی کۆچییەوەو، لە دوای ئەوەی کە دەوڵەتی ئیسلامی دابەش بوو بۆ چەندەها بەشی جیاواز، کە هەندێکیان دژی هەندێکی تریان راپەڕیبوون و لە سەر هەر بەشێك دەسەڵاتدارێك هەبوو، کە خۆی ناو نابوو بە رابەری بڕواداران (أمیر المؤمنین) و پەرتبوون ڕوویدا بوو لە نێوانیانداو، پەیوەندییەکانیان پچڕابوون، لە جیاتی بەهێزی، تووشی بێ هێزی بوون، ئەم حاڵەتەیش کاریگەری نێگەتیڤی زۆر گەورەی هەبوو، لە سەر چالاکییەکانی بزاڤی فیقهی، ئیتر رۆحیەتی زانستی و ئەکادیمی لاواز بوو، ورەو چالاکییەکانی زانایانی شەریعەت تووشی ساردی و هێواشی بوونەوەهات‌و، رۆحیەتی سەریەخۆیی‌و ، بڕوا بەخۆ بوون، تیایاندا مردو، ڕۆشتن بەرەو پرۆسەی ئیجتیهاد کردن لە لایان نەما.

٢- نووسین و نووسینەوەو تۆمارکردنی مەهەبە فیقهییەکان: لەدوای ئەم پرۆسەی تۆمارکردن‌و نوسینەوەی مەزهەبانە، خەڵکی ئیتر سەریان لەسەرچاوە و پەرتوکە مەزنەکان دەرنەچوو، لێیان بێ نیاز بوون‌و، بەهۆی ئەم

حاڵەتەیشەوە لە توێژینەوەو پشکنینی نوێکەوتن، کارو باری زانایان کورت بوویەوە لەسەر کورتکردنەوەی ئەو بابەتانەی کە درێژن و ڕاڤەکردنی ئەو بابەتانەی کە کورت لە پەرتوکە سەرچاوەییە مەزنەکان لە هەموو مەزهەبەکاندا لەسەریان نوسراوە.

٣- **دەمارگیری مەزهەبی، و ڕەچاوکردنی مەزهەبگەرایی:** دواجار کارگەیشتە ئەوەی کە هەر شەرعزانێك کە سەر بە مەزهەبێکی دیاریکراو بوو، دە بووە پارێزەری مەزهەبەکەی، و ئەوەی کە لە توانایدا هەبوو بەکاری دەهێنا بۆ بەرگری لێکردنی ئەوەی کە لەمەزهەبەکەی خۆیدا هەبوو، بە دروستی دەزانی و غەیری ئەوەی بەهەڵە دادەنا، تاواجار دەمارگیری مەزهەبی گەیشتە ئاستێك کە هیچ جیاوازی نەدەکرا لە نێوان دەقەکانی شەریعەت (لەقورئان و سوونەتی پێغەمبەرﷺ، و لەگەڵ دەقە فیقهییەکاندا، ئەوەتا صاوی لەم بوارەدا دەڵێت[1]: تەقلیدی جگە لەچوار مەزهەبەکە دروست نیە، با لەگەڵ وتەی هاوەڵان و فەرموودەی صەحیح و ئایەتیشدا یەکبگرێتەوە، ئەو کەسەی لەچوار مەزهەبەکە دەربچێت سەرلێتێکچوی سەرتێکدەرە، لەوانەیە ئەوە ببێتە هۆی بێباوەڕبوونی، چونکە وەرگرتنی رووکاری قورئان و فەرموودە لەبنەماکانی بێباوەڕبوونە)، بەصاوی و ئەوانەی وەك ئەو بیر دەکەنەوە دەڵێم: ئەوەی ئەو قسەیە بکات خۆی سەرلێ تیکچووی سەرلێ تێکدەرە، چۆن بۆچوونی چوار مەزهەبەکە پێش قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر دەخرێت کاتێك یەکیان نەگرتەوە، ئەبو لحەسەنی کەرخی حەنەفی[2]، دەڵێت: (ئەسڵ لە مەزهەبی ئەواندا ئەوەیە کە هەر ئایەتێك کە پێچەوانەبێت لەگەڵ قسەی زانایانی مەزهەبەکەیاندا، ئەو ئایەتە بە نەسخ کراوە هەژمار دەکەن، یان تەئویلی

---

[1] الشيخ احمد الصاوي المالكي، على تفسير الجلالين، المجلد الثاني، الصحيفة العاشرة.

[2] - بڕوانە پاشکۆی (تأسيس النظر)، ل١١٦.

دەکەن و مانای دوور مەودای بۆهەڵدەبژێرن، و باشتر وایە کە تەئویل بکرێت‌و، بەئاراستەی کۆککردنی ئایەتەکە لەگەڵ ڕا مەهەزبییەکەدا کاربکرێت) ئەم قسەیە گوزارشت دەکات لەسەر ئەوەی کە لە تێڕوانینی ئەودا پێویستە گوێڕایەڵی سەرجەمی ئەو بڕیارو قسانە بکرێت، کە لە مەزهەبی حەنەفیدا هاتووە، ئەگەر چی پێچەوانەی قورئانیش بن، ئەمە لە کاتێکدایە کە بنیاتنەری ئەم مەزهەبە کە پێشەوا ئەبو حەنیفەیە (رەحمەتی خوای لێبێت) سەربارەت بە کەسایەتی زاناکانی پێش خۆی دەڵێت: (هم رجال ونحن رجال ولی أن اجتهد کما اجتهدوا): (ئەوان مرۆڤ بوون و ئێمەیش مرۆڤین و یان ئەوان پیاو بوون، ئێمەشی پیاوین، و بۆمان هەیە، کە ئیجتیهاد بکەین، وەك چۆن ئەوان ئیجتیهادیان کردووە).

لەنمونەکانی تری دەمارگیری مەزهەبی یەکێك لەمامۆستا ئاینیەکانی هاوڕێم وتی: تۆ وتووتە سێ تەڵاقە یەك تەڵاقی پێدەکەوێت؟ وتم: نەخێر. وتی: ئەی ئیبن تەیمیە وای وتووە؟ وتم: نەخێر. وتی: ئەی شیعەی ئیمامی وایان وتووە؟ وتم: نەخێر. وتی: باشەی ئەی کێ وا ئەڵێت؟ وتم: خوای گەورە وای فەرمووە لەم ئایەتەدا: ﴿الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾، لەئایەتەکەدا (تسریح باحسان) بریتیە لەتەڵاقی سێیەم، لەو کاتەدا تەماتە فرۆشێکی عەرەب لەبەر دەرگاکەماندا راوەستابوو کەنەخوێندەوار بوو، وتم ئەگەر برۆیت پرسیاری لێ بکەیت جیاوازی چیە لەنێوان (مرتین)و (إثنتین) پێت دەڵێت: (مرتان) کات دەکەوێتە نێوانیانەوە، بەپێچەوانەی (إثنتین)، ماوەیەك بێدەنگ بوو پاشان وتی: گەر لەبەر شافیعی نەبوایە ئەوا کارم بەم ئایەتە دەکرد، ئەمەیە عەقڵیەتی لاساییکارەوەو پەسندزانی مەزهەب بەسەر دەقی راشکاوی قورئانی پیرۆزدا، ئەمە لەکاتێکدایە شافیعی (رەحمەتی خوای لێبێت) وتوویەتی: ئەگەر بینیتان قسەی من پێچەوانەی فەرموودەی پێغەمبەرە ئەوا بیدەن بەدیواردا).

**٤- بێ کەڵکی و دەربنەخواردوویی، سیستمی فێرکاری و فێرکردن لە دامـەزراوە قوتابخانە ئاینییەکاندا:** لە ڕاستیدا زانایانی شەریعەت لە بایەخدان بـە زانسـتە ئامرازییەکاندا زیادە ڕەوییان کرد، وەك زانستەکانی ئوصولی فیقـه، و زانسـتی لۆژیكو، فەلسەفە و زانستی ڕەوانبێژیو، زانستی ڕێزمانی عەرەبی (نـەخو – صەرف) بەجۆرێك کـە مەبەسـت و ئامانجـە بنەڕەتییەکـەیان لـە بیرکـرد، کـە سەرقاڵبوون بـوو بـە قورئـانی پـیرۆزو سـوونەتی پێغەمبـەری دڵسـۆزەوە ﷺ، هـەروەها سـەرقاڵی بـە هەڵگوسـتنی حوکمـەکان، تـا دوا جـار وای لێهـات کـە ئامرازەکان جێگای مەبەستو ئامانجەکانیان گرتەوەو، ئامانجو مەبەسـتەکان وازلێهێنران‌و لە کونجی لەبیر چوونەوەی لەبیرکران.

هەتا ئێستاش قسەی ئەو دانایەم لەمێشکایە کەساڵی ١٩٤٧ کـاتێ مامۆسـتای ئاینی بـووم لەگونـدی سەرسـیانی سـەر بەقـەزای قـەڵادزێ، سـەرۆکی یـەکێك لەهۆزەکانی پشدەر[1] کەشێخ حوسێنی بۆسـکێنی بـوو کەنیمچـە خوێنـدەوار بوو[2]، هاتـە حوجرەکـەمو گـوێی بـۆ دەرسـەکەم ڕاگـرت، لـەو کاتـەدا وانـەی مەنتیقم دەوتەوە[3]، وتی: مامۆستا هەموو تواناى ژیانتان بەکار دێنن لـەپێناو دروسـتکردنی کلیلێکدا بـۆ کردنـەوەی دەرگایـەك، تەمـەنتان تـەواو دەبێـتو هەموو هەوڵەکانتان بەفیڕۆ دەچێتو بەرەو ماڵی کۆتایـان دەگەڕێنـەوەو ئـەو دەرگایـەتان نەکردۆتـەوە، ئـەو مەبەسـتی لەکلیلەکـە زانسـتە ئـامێر (ئالی)یـە ئیسلامیەکان بوو کە بۆ دەرهێنانی حوکمەکان بەکار دەهێنرێـت، دەرگاکـەش دەرگای قورئانی پیرۆزە کەسەرچاوەی حوکمە شەرعیەکانە.

---

[1] ناوچەیەکە لەکوردستانی عێراق.

[2] ئاستی خوێندەواریەکەی بڕوانامەی سەرەتایی هەبوو.

[3] کتێبی (البرهان للکلنبوی)م دەوتەوە.

### گرنگی لاسایکردنەوە (أهمية التقليد):

هەروەك چۆن ئیجتیهاد لەپێویستیەکانی ژیانە، بەهەمان شێوە لاسایکردنەوەش لەرووی زانستیەوە کەمتر نیە لەئیجتیهاد، چونکە زۆرینەی خەڵکی ئاگاداری زۆرێك لەحوکمەکانی ئاینەکەیان نین‌و توانای گەڕانەوەیان نیە بۆ سەرچاوەی ئەو حوکمانە، تاکە چارەسەر پرسیار کردنە لەکەسانێك کەشیاوێتی وەڵامدانەوەیان هەبێت، لەوانەیە وەڵامدەرەوەش لاسایکەرەوە بێت، وەك نمونەی فەتوادان بەبێ ئیجتیهاد، لەبەر ئەوەیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾[1]. رووکاری ئەم ئایەتە ئەوەیە دروست نیە لاسایی مردوو بکرێتەوە، چونکە پرسیار ئاراستەی مردوو ناکرێت.

### مەترسی لاسایکردنەوە (خطورة التقليد):

ئەم مەترسیە لەچەند روویەکەوەیە، لەوانە:

یەکەم: لاسایکەرەوە جیاوازی ناکات لەنێوان ئەو دەقەی لاسیکارەکەی‌و دەقەکانی قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەر لەرووی پیرۆزییەوەو لەو باوەڕەدا نیە هیچ هەڵەیەك هەبێت لەو مەزهەبەی شوێنی کەوتووە.

دووەم: خۆبەستنەوە بەمەزهەبێکی دیاری کراوەوە کەتا لەژیاندایە شوێنی دەکەوێت، ئەمەش دەبێتە هۆی دەمارگیری مەزهەبی‌و ئەوەش دەبێتە هۆی پەرتەوازەیی ئومەت، دەڵێن یەکێك لەوالیەکانی عوسمانیەکان لەشاری بەغدا لەسەر مەزهەبی حەنەفی بووە، مزگەوتێکیش لەسەر رێگاکەیدا بوو کەلەسەر مەزهەبی شافیعی بوون، فەرمانی کردووە بیڕوخێنن، کەس ئامادە نەبووە فەرمانەکەی جێبەجێ بکات، تا رۆژێك لەبەردەم مزگەوتەکەدا راوەستاوەو بەوانەی دەوروبەری وتووە: تاکەی ببینم ئەم کڵێسایە ئاوا هەبێت؟ لاسایکارەوەکان بەجۆرێك ململانێیان

---

[1] سورة الانبياء : ٧ .

لەنێواندا دروست بووە کەوەك ململانێ سیاسیەکانی نێوان حزبـەکانی ئـەم سـەردەمە وابووە.

سـێیەم: لاسـایکردنەوە گیـانی بەرهـەمهێنان دەکوژێـتو لاسـایکەرەوە لەجوڵـە دەکەوێتو عەقڵی ناخاتە کار، دەبێتـە کۆسـپیش لەبـەردەم هـەموو گەشـەکردنێکی فیکریـدا، ئەمــەش دەبێتــە هــۆی دواکــەوتنی لــەکاروانی شارســتانی مرۆڤایــەتیو پێشکەوتنی زانستی، وەك ئەوەی ئەمرۆ لەجیهانی ئیسلامیدا دەیبینین.

چوارەم: مەزهەب سەرچاوە نیە بۆ حوکمی شەرعی با ئەوە مەزهەبی زانایەك لەهاوەڵانیش بێت، ئەمە بەپێی بۆچوونی فەیلەسوفـو موجتەهیدی گەورە ئیمامی غەزالی (رەحمەتی خوای لێبێت) کەلەکتێبی (المستصفی) (ل243)دا دەڵێت وتەی هاوەڵان حوجە نیەو ئەمەش دەقی وتەکەیەتی: (إن قول الصحابي ليس حجة أي لا يعتبر مصدراً من مصادر الفقه الإسلامي)، واتە: وتەی هاوەڵ بەڵگە نیەو بەسەرچاوەیەك لەسەرچاوەکانی فیقهی ئیسلامی دانانرێت)، بۆ ئەمەش بەڵگەی عەقڵی مەنتیقی هێناوەتەوەو دەڵێت: هەندێك بۆ ئەوە چوون کەوتەی هاوەڵ بەرەهایی بەڵگەیە، هەندێکیش وتوویانە وتەی ئەبوبەکرو عومەر بەڵگەیە، هەندێکی تر وتوویانە وتەی خەلیفەکانی راشیدین کەهاودەنگ بووبن لەسەری بەڵگەیە، لای ئێمە هەموویان پوچڵ (باتڵ)ە، چونکە ئەو کەسەی بکرێت بکەوێتە هەڵەوەو بێگوناهی (عیصمەتی) نەسەلمێنرا بێت ئەوا وتەی نابێت بەڵگە (حجە)، چۆن دەبێت قسەیان بکرێت بەڵگە لەکاتێکدا بکرێت هەڵەبن؟ چۆن دەکرێت کەسانێك بەمەعصوم دابنرێن کەروودەدات بۆچوونیان جیاواز بێت؟ چۆن دوو مەعصوم بیروڕایان جیاواز دەبێت؟ چۆن هاوەڵان هاودەنگ بوون لەسەر ئەوەی کەسەرپێچی هاوەڵ (مخالفه الصحابه) دروستە؟ ئەبوبەکر ئەوانەی رەت نەکردۆتەوە کەهاوڕای ئیجتیهادی نەبوون، لەبەر ئەوەی هیچ بەڵگەیەك نیە مەعصوم بن، جیارایش لەنێوانیاندا روویداوەو، رایانگەیاندووە هاوڕانەبوونیان: ئەمانە سێ بەڵگەی بنبڕن لەسەر ئەوەی قسەی هاوەڵ حوجە نیە).

لەم بەڵگانەی ئیمامی غەزالیەوە (رەحمەتی خوای لێبێت) دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە وتەی هیچ یەکێك لەمەزهەبە ئیسلامیە تۆمارکراوەکانو هیچ رێسایەك لەرێساکانی ئەم مەزهەب یاخود ئەو مەزهەب دروست نیە فەتوای پیٚ بدرێتو بەحوجە لەسەر حوکمی ئەو فەتوایەی دەدرێت دابنرێت ئەگەر هاتوو بۆچوونی ئەو مەزهەبە یاخود ئەو رێسا فیقهیەی مەزهەبەکە پشتی بەدەقێکی قورئان یاخود دەقێکی چەسپاو لەسوننەتی پێغەمبەر نەبەستبێت، ئەگەر ئەو پشت پیٚ بەستنە هەبوو ئەوا حوجیەتەکە تێیدا بۆ بۆچوونی مەزهەبەکە و رێسا مەزهەبیەکە نیە بەڵکو بۆ دەقەکەی قورئان یان سوننەتەکەی پێغەمبەرە.

# بەشی چوارەم

## مافی ئازادی دادگایکردن و دابینکاریەکانی تۆمەتیار

## ( حق حرية التقاضي وضمانات المتهم )

لێکۆڵینەوە لەم بابەتە بۆ دوو دەروازە دابەش دەکەین:

یەکەمیان تایبەت دەکەین بۆ مافی ئازادی دادگایکردن.

دووەمیشیان بۆ دابینکارییەکانی تۆمەتبار.

# دەروازەی یەکەم:
# مافی ئازادی دادگایکران و بێدادی

## ( حق حرية التقاضي والتظلم )

قورئانی پیرۆز لەچەندین ئایەتدا بڕیاری لەسەر ئازادی تاوتێکردن (مناقشە)ی داواکار یان داواکراو لەگەڵ دادوەر کردووە ئەگەر هەستی کرد مافی خوراوە، لەجوانترینی بەڵگەکانیش لەسەر ئەم ئازادیە قسەی (خەولەی کچی حەکیم)ە ئەو کاتەی پێغەمبەر (ﷺ) لەکێشەی ناکۆکی لەگەڵ مێردەکەیدا (ئەوسی کوری صامت) سەبارەت بەسوێندی زیهار، زیهار بریتیە لەچواندنی ژن لەلایەن مێردەوە بەیەکێك لەکەسە مەحرەمەکانی، وەك ئەوەی مێردەکە بەژنەکەی بڵێت: (تۆ وەك دایکم یاخود وەك خوشکمیت)، ئەم زیهارە پێش هاتنی ئیسلام لای عەرەبەکان بەتەڵاق دادەنرا، پێغەمبەر (ﷺ) وا حوکمیدا کەتەڵاقە بۆ ئەو ئافرەتە کەمێردەکەی سوێندی زیهاری خواردبوو، ئەمەش لەسەر بنەمای نەریتی باوی ئەو کاتە و پێش هاتنەخوارەوەی وەحی لەسەر ئەو بابەتە، کاتێ ژنەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوسی مێردم هەموو سامانمی خواردووە، گەنجێتیمی نەهێشتووە، سکم بۆی هەڵچۆڕا تا چوومە تەمەنەوەو، لەمناڵبوون کەوتم ئێستا سوێندی خواردووە وەك دایکی وام، پێغەمبەر (ﷺ) وەڵامی دایەوە: وایدەبینم تۆ حەرام بوویت بۆی، خەولە گەڕایەوەو بەو پەڕی ئازادیەوە قسەی لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) کردەوەو رازی نەبوو بەدادگایکردنەکەی، وتی: من مناڵم لێی هەیە، ئەگەر بیدەم بەو دەفەوتێن، ئەگەر لای خۆم بیانهێڵمەوە برسیان دەبێت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەوە: وایدەبینم کەتۆ بۆ ئەو حەرام بوویت،

خەوله نەگەیشتە قەناعەتو لەو حوکمەدا خۆی بەمافخوراو دەزانی، وتی: من سکاڵای کێشەکەو ئەو نەهامەتیەی بەسەرم هاتووە بۆ لای خوا بەرز دەکەمەوە، پاشـان ئـەم ئایەتانـە هاتــە خــواراوە بــۆ پێغەمبــەر (ﷺ) کـەحوکمی زیهاریـان لـەخۆگرتبوو، کەدەفەرموویێت: ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ، الَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنْكُمْ مِنْ نِسَائِهِمْ مَا هُنَّ أُمَّهَاتِهِمْ إِنْ أُمَّهَاتُهُمْ إِلاَّ اللاَّئِي وَلَدْنَهُمْ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنْكَرًا مِنَ الْقَوْلِ وَزُورًا وَإِنَّ اللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ، وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا ذَلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ، فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا فَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا ذَلِكَ لِتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾[1]، خوای گـەورە لـەم ئایەتانـەدا روونـی کـردەوە کـەزیهار (چواندنی ژن لەلایەن مێردەوە بەیەکێك لەکەسـە مەحرەمـەکانی) تـەڵاق نیـە، بـەڵکو بەسوك تەماشاکردنی پەیماننامەی هاوسەرێتیو حوکمی خوا، بەڵکو سـزای پیاوەکـە بەوە دەدرێت کەنابێت بچێتە لای ژنەکەی تـا کۆیلـە یـان کـەنیزەکێك ئـازاد دەکـات، ئەگەر نەیتوانی ئەوە بکات ئەوا دوو مانگی یەك لەدوای یەك (بەسەریەکەوە) بـەرۆژوو بێت، ئەگەر ئەوەشی لەتوانادا نەبوو ئەوا خواردنی شەست هەژارو نـەدار بـدات پـێش ئەوەی بچێتەوە لای ژنەکەی.

لەئازادیـەکانی تۆمـەتبار لەدادگایکرانیـدا مـافی بـەرگری لەخۆکردنیـەتی، چـونکە (تۆمەتبار بێتاوانە تا ئەو کاتەی تۆمەتەکەی لەسەر دەسەلمێت)، ئەم بنـەما یاسـاییە تاوانکارییە بنەڕەتەکەی لەم ڕێسا ئوصولیەوە سەرچاوەی گرتووە: (إن الاصل بـراءة الذمـة)، واتـە: بنــەرەت ئەســتۆ پاکیــە، ئەمــەش جۆرێکـە لـەجۆرەکانی بەباشـزانین (استصحاب) کەئەویش سەرچـاوەیەکی یـەدەکیی حـوکمی شـەرعیە ئەوکاتـەی دەق لەئارادا نەبێـت، چونکە مرۆڤ بەبێ گوناهی لەدایك دەبێت، هیچ پابەندیەکی مـەدەنیو

---

[1] سورة المجادلة : ١-٤ ، مەبەست لە (تماس) چوونەلای هاوسەرییە.

تاوانکاری لەسەر نیە، کاتێ داوای مەدەنی یاخود تاوانکاری لەدژی بەرز دەکرێتەوە، لەسەر لێکۆڵەری دادبینی یاخود دادوەری پێویستە وا دابنێت هێشتا وەك خۆی بێتاوانە، تا بەدانپێدانانی ئازادانەی خۆی یاخود بەبەڵگە پێچەوانەی ئەوە بسەلمێنێت، بەهەمان شێوە لەسەر دادوەر پێویستە وەك بەباشزانی وایدابنێت کەلەسەر بێتاوانیەکەی خۆی ماوە کەپاش لەدایکبوونی دەستبەجێ هەیبووە، بەباشزانی (استصحاب) بریتیە لەحوکمدان لەئێستادا بەوەی کەلەپێشتردا چەسپاوە تا ئەو کاتەی پێچەوانەکەی دەسەلمێندرێت، بنەرەتی ئەم مافەش قورئانی پیرۆزە:
﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ[1] بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا[2] أَنْ تُصِيبُوا قَوْمًا بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ﴾[3].

ئەم ئاڕاستەکرانە لەلایەن خوای گەورەوە بۆ دادبینانو دادوەران بۆ ئەوەیە بزانن هەموو هەواڵدەرێك راستگۆ نیە لەهەواڵدانەکەیداو هەموو داواکارێك مەرج نیە راست بێت لەداواکەیدا، ئەم گوتارە بەشێوەیەکی گشتی ئاڕاستەی ئەوانە کراوە کەئەرکی لێکۆڵینەوە لەگەڵ تۆمەتبارو بەندکراواندا ئەنجام دەدەن، ئەم گوتارە فەرمانیان پێدەکات کەپەلە نەکەن لەگەیشتن بەماف (حق) لەڕێگەی ئەشکەنجەو هەڕەشەوە، بەڵکو لەسەریان پێویستە دان بەخۆدا بگرنو بەشوێن بەڵگەدا بگەڕێن کەلەبەرژەوەندی یان لەدژی تۆمەتبارەکەیە، دادوەر هەرچەندە داوا نەکراوە لێی کەهەمیشە بەدڵنیابوونی تەواو (یەقین) کاربکات، لەگەڵ ئەوەدا لەسەری پێویستە پشت بەهەموو ئەوانە نەبەستێت کەلەشاهیدی شاهێدەکان یاخود بەڵگەکان یان نزیکیەکان (قرینة) دەیبیستێت، بەڵکو لەسەری پێویستە دان بەخۆیدا بگرێتو پەلە نەکات لەدەرکردنی حوکمەکە لەسەر بنەمای هەبوونی گومان لای، چونکە گومان

---

[1] واتە دادپەروەر نابێت، دادپەروەر ئەو کەسەیە کەتاوانێکی گەورەی لەتاوانە گەورەکان ئەنجام نەداوەو سورنەبووە لەسەر سەرپێچیە بچوکەکان بەدرێژایی ژیانی لەو کاتەوەی گەیشتوتە تەمەنی پێگەیشتن (سن الرشد).
[2] واتە بەبەڵگە یاخود دانپێدانان بەویستێکی ئازاد کەبزانێت چی دەڵێت بێت.
[3] سورة الحجرات : ٦ .

لەهەموو بوارێکدا نابێتە بەلگە، بەلکو خوای گەورە رەتی کردۆتەوە کەلەهەموو کاتێکداو بۆ هەموو ڕووداوێك پشت بەگومان ببەسترێت، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ...﴾[1] لەئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَمَا لَهُمْ بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِنْ يَتَّبِعُونَ إِلاَّ الظَّنَّ وَإِنَّ الظَّنَّ لاَ يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئًا﴾[2].

## مافی دادپەروەری و بێدادی (حق العدل والتظلم):

### دادپەروەری

لەپێویستیەکانی مافی دادگایکرانە، دادپەروەری دادوەرو بێدادی داواکارو داوالێکراو ئیدی ئەوەی حوکم دراوە لەسەری بەرژەوەندیەکی مادی یا مەعنەوی بێت، سزابێت یاخود قەرەبوو، دادپەروەریش بریتیە لەپێدانی مافی هەر خاوەن مافێك، خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا لەچەندین ئایەتدا فەرمانی کردووە، لەوانە: ﴿...وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ أَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ...﴾[3]، هەروەها دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ...﴾[4]، دادپەروەریش واتە حوکمدان بەوەی داواکار شایستەیەتی، چاکەخوازی (احسان)یش بریتیە لەرەچاوکردنی سوککردنی سزا چونکە مەبەست لێی چاکسازییە، خۆگەر کرا بەجگە لەسزا چارەسەر ببێت ئەوا باشترەو دەبێت رەچاوی دادپەروەری‌و دەستبەردارنەبوونی لەبەر دوژمنایەتی یا خزمایەتی بکرێت، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿...وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ

---

[1] سورة الحجرات : ١٢ .
[2] سورة النجم : ٢٨ .
[3] سورة النساء : ٥٨ .
[4] سورة النحل : ٩٠ .

تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى...﴾[1] واتـه رق لێبونتـان لەكەسـانێك واتـان لێ نـەكات دادپەروەر نەبن، چونكە دادپەروەری مرۆڤ لەخوا نزیك دەكاتەوە، بـەدادوەرو شـاهێدو كەسانی تریش دەفەرمووێـت: ﴿...وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى...﴾[2] واتـه ئەگەر ئەو كەسەی قسەی لەبارەوە یـان لەسـەر دەكـەن خزمایـەتیتان لەنێوانـدا بـوو دادپەوەر بن چونكە بەلاداشكانەوە واتە وازهێنان لەدادپەروەری‌و ئەنجامدانی ستەم.

جێبەجێ نەكرانی ئەو دەقانەی دواتـر دەردەكـرێن بەسـەر ئـەو رووداوانـەدا پـێش دەرچوونی دەقەكە روویان داوە لەرووەكانی دادپـەروەرییە، قورئانی پیرۆزیش لەچەند ئایەتێكدا بریاری لەسەر ئەمە داوە، لەوانە: ﴿وَلاَ تَنكِحُوا مَا نَكَحَ آبَاؤُكُمْ مِنَ النِّسَاءِ إِلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَمَقْتًا وَسَاءَ سَبِيلاً﴾[3] مەبەسـت لـەمارەبرین (نكـاح) گرێبەستی هاوسەرگیرییە، چونكە تەنها بەگرێبەستەكە هاوسەری باوك‌و باوكی باوك‌و بەرەوسەرتر حەرامە بۆ كوڕو كوڕی كوڕو بەرەو خوارتر، خۆ ئەگـەر بـەمردن یـاخود بەتەڵاق پێش چوونەلاو پاش چوونەلا لێك جیابوونەوە، ئـەوا ژن بەهاوسـەرگیری بـۆ لقەكانی مێردەكەی حەرام دەبێـت، هـەروەك چـۆن بـۆ پشـتەكانی حـەرام دەبێـت، نمونەی ئەم هاوسەرگیرییە پێش ئیسـلام هـەبوو، پاشـان حـەرام كـراو پـاش هـاتنی ئیسـلام بـەتاوان دانـرا، هەركـەس پێشـتر ئـەو هاوسـەرگیرییەیان كردبـوو سـەبارەت بـەرابردوو سـزا نـەدەدران‌و بەموسـڵمان بوونیـان راسـتەوخۆ لێـك جیـا دەكرانـەوە، سەبارەت بەهەموو تاوانەكانی تریش كەمرۆڤەكە پێش موسڵمانبوونی ئەنجامی دابوو، خوا گەورە دەفەرمووێـت: ﴿...عَفَا اللَّهُ عَمَّا سَلَفَ وَمَنْ عَادَ فَيَنتَقِمُ اللَّهُ مِنْهُ...﴾[4]

---

[1] سورەتی (المائدة :٨)، تەولوكاری ئایەتەكە: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ لِلَّهِ شُهَدَاءَ بِالْقِسْطِ وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ ، (القسط) بریتیە لە دادپەروەری (العدل).

[2] سورة الانعام : ١٥٢.

[3] سورة النساء : ٢٢ .

[4] سورة المائدة: ٩٥ .

واتە لەسەر ئەوەی پێش موسڵمانبوونی ئەنجامی داوە پێش ئەوەی ئەو کارە بەتاوان دابنرێت ئەوا سزا نادرێت لەسەری بەڵام ئەگەر پاش حەرامکرانی ئەنجامیدا ئەوا سزا دەدرێت لەسەر ئەنجامدانی.

**بێدادی (التظلم)**

بێدادی (تظلم)ی کەسێك لەکەسێکی تر بریتیە لەوەی سکاڵا لەستەمی بکات لای کەسێك کەپلەو دەستەڵاتی زیاتر بێت، لەئیسلامدا بنەڕەت ئەوەیە پلەبەندی دادوەری (التدرج القضائي) نەبێت لەبەر ئەوەی پێویست دەکات دادوەر (قازی) موجتەهید بێت، چونکە ڕێسای شەرعی ئەوەیە کە: (الأجتهاد لاینقض بمثلە)، واتە: ئیجتیهاد بەئیجتیهاد رەت ناکرێتەوە، واتە حوکمی ئیجتیهادێکی پێشتر بەئیجتیهادێکی نوێ ناسڕێتەوە، نەلەخودی موجتەهیدەکەوە .نەلەموجتەهیدێکی ترەوە، ئەمەش بەهۆی یەکسانی هەردوو ئیجتیهادەکە لەهێزی پابەندیو بۆ لەبەرچاوگرتنی سەقامگیری پێشینیە دادوەرییەکان (السوابق القضائیة).

لەجێبەجێکرانەکانی ئەمەش دادوەریکردنی گەورەمان عومەری کوڕی خەتاب (خوا لێی رازی بێت) لەکێشەیەکی میراتیدا کەمیراتگرەکانی مێردەکەو دایكو برای دایکیو خوشكو برای دایكو باوکی بوو، بڕیاریدا بەبێ بەشکردنی خوشكو برا دایكو باوکیەکان لەمیراتیەکە، چونکە ئەوان پشت بوونو پاش ئەوەی مێردەکە نیوەی بەرکەوتو دایك شەش یەكو براکان لەدایکەوە یەك لەسەر سێیان برد لەمیراتیەکە هیچیان بۆ نەمایەوە.

پاش ساڵێك هەمان بابەت لەسەردەمی خەلیفایەتیەکەیدا دووبارە بوویەوە، ئەمجارەیان بەشی برا دایكو باوکیەکانشیدا لەسێ یەکەکەی[1] براکان کەتەنها لەسەری دایکەوە بوون، ئەمەش پاش ئەوە هات کەوتیان: باشە وا باوکمان بەرد بوو

[1] بابەتی میراتیەکە لە(٦)ە، (٣) بۆ مێردەکە، (١) بۆ دایك، (٢) بۆ ئەو برایانەی لەدایکەوەن، ئەوانی تر بەنغرۆبوون بەشبڕاو(حجب) دەکرێن، واتە خاوەن پشکە دیاریکراوەکان میراتیەکە نغرۆ دەکەن.

باشه خۆ دایکمان یەکە، کاتێ پرسیار لەعومەر کرا لەبارەی گۆڕانی ئیجتیهادەکەیەوە وتی: پێشتر بەوجۆرە بڕیارمانداو ئێستاش بەمجۆرە دەیدەین.

بەڵام سەرەڕای نەسڕانەوەی ئیجتیهاد بەئیجتیهاد بۆ ئەو کەسەی بڕیاری بۆ دراوە یاخود بڕیاری لەسەر دراوە، لەگەڵ ئەوەشدا مافی بێدادی هەیە لای دەستەڵاتێکی باڵاتر ئەگەر هەستی بەمافخوران‌و ستەم لەحوکمەکەدا کرد، لەجێبەجێکرانەکانی بێدادی لەسەردەمی خەلیفەکانی راشیدیندا بابەتێکی میراتی بوو کەمیراتگرەکانی ژن‌و دایك‌و دوو کچ‌و دوازدە براو خوشکێك بوون، بابەتەکە بە(٦٠٠)پشك راست دەبوو، میراتیەکەش شەش سەد دینار بوو، پاش ئەوەی هەموو خاوەن بەشە دیاریکراوەکان بەشی خۆیانیان برد، بیست‌و پێنج دینار مایەوە بۆ دوازدە براو تاکە خوشکەکەیان کەنێرینە دوو هێندەی مێینەی دەکەوێت.

پشکی خوشکەکە تەنها یەك دینار بوو، هەستی بەستەم لێکران کرد، سکاڵای بەرزکردەوە بۆلای گەورەمان عەلی کوڕی ئەبو تاڵب (رەزای خوای لێ بێت) کەخەلیفە بوو.

شێخ مارفی نۆدێی ئەم بابەتەی بەمجۆرە هۆنیوەتەوە:

| | |
|---|---|
| قالت أخي مات وعندما هلك | ستمئة من الدنانير ترك |
| ولي بدينار شريح قد حكم | وقد اتيت اشتكي مما ظلم |
| قال لعل حين ذاق حتفه | عصابة سواك خلى خلفه |
| و عدهم كما مضى قال نعم | فقال بالحق قضى وما ظلم[1] |

---

[1] كشف الغامض شرح منظومة قطر العارض في علم الفرائض للشيخ النودهي البرزنجي. ص٢٥٢ وما يليها.

تەولوکاری شیعرەکە:

| | |
|---|---|
| وكالركابية وهي عرسُ | ولخوة لمن حواه الرمسُ |
| عدهم عشرة واثنان | والدة والأخت وابنتان |
| فيهما ثلاثة مع الثمانية | فضربت أولاهما في الثانية |
| لكنها تصح من ستمائة | فاستكملت سهامها تلك الفئة |
| ونيك في عهد علي وقعت | ثم إلى القاضي شريح رفعت |
| و بعد ان جعلها من ست | مائة اعطى واحد ا للأخت |
| فأقبلت نحو ابي تراب | ورجله اذ ذاك في الركاب |
| قالت: أخي مات .. ........ | ...........الى آخره. |

←

# دەروازەی دووەم:
# دابینکارییەکانی تۆمەتبار

شەریعەتی ئیسلام بە کۆمەڵێك دابینکاری دەورەی تۆمەتباری داوە گەر ڕەچاوبکرێن ئەوا هیچ کەس لە جیهانی دادگادا ڕووبەڕووی شتێك نابێتەوە پێچەوانەی قەزا بێت، لەو دابینکاریانە:

**یەکەم: بنەمای شەرعییەت:** (تاوان و سزا تەنها بە دەقە)، واتە سزا دروست نییە مەگەر کارێك بێت یاسا بە تاوانی دابنێت لە کاتی ئەنجامدانیداو، دروست نییە سزایەك بسەپێت توندتر بێت لەو سزا جێبەجێکەرە لە کاتی ئەنجامدانی کارێکی تاوانکاریدا، بۆیە هەر تاکێك پێویستە پێشوەخت بزانێت چی لەسەر

---

<u>ڕوونکردنەوەی بابەتەکە</u>: ڕێسای گشتی لەزانستی میراتیدا ئەوەیە ئەگەر لەنێو میراتگرەکاندا چەند خاوەن پشکێکی دیاریکراو هەبوون و ژێرەی دوانیان جیاواز بوو ئەوا یەکێکیان لەویتریان دەدرێت (لێکدان)و ئەنجامی لێکدانەکە دەبێتە بنچینە بۆ دابەشکردنی میراتییەکە، خۆ ئەگەر پشکەکانی هەندێکیان دابەش نەدەکرا بەسەریانداو لەنێوان ژمارەکانیان و پشکەکانیاندا جیاوازی هەبوو (بەوەی تاك بن یاخود یەکێکیان تاك و ئەویتریان جوت بێت) ژمارەیان لەگەڵ بنچینەی بابەتەکە لێك دەدرێت، ئەنجامی لێکدانەکە دەبێتە بنچینەی دابەشکردنی میراتیەکە، لەم بابەتەدا ژێرەی پشکی کچەکان ٣/٢ لەگەڵ پشکی ژنەکە ٨/١ جیاوازن، یەکێکیان لەویتریان دەدرێت (٣×٨)= ٢٤ بۆ دایکەکە شەش یەك (٢٤/٤) هەشت یەکیش بۆ ژنەکە (٢٤/٣) دوو لەسەر سێ بۆ کچەکان (٢٤/١٦) ئەوەی مایەوە بۆ خوشك و براکان (للذکر مثل حظ الانثیین) ئەوەشی ماوەتەوە بریتییە لە (١) ئەوەش جیاوازە لەگەڵ ژمارەیان (٢٥) پاش دانانی هەر برایەك بەدوو خوشك، ژمارەکەیان لەگەڵ بنچینەی بابەتەکە لێك دەدرێت (٢٤×٢٥) = ٦٠٠ ئەنجامەکەی دەبێتە بنچینەی دابەشکردنی میراتیەکە، پشکی دایك(٤×٢٥)=١٠٠ ژنەکەش (٣×٢٥) =٧٥ دوو کچەکەش(١٦×٢٥) = ٤٠٠، ئەوەی دەمێنێتەوە ٢٥ پشکە هەر برایەك دوو پشك دەدات و هەر خوشکێك یەك پشك.

بڕوانە: کتاب کشف الغامض منظومة قطر العارض للشیخ معروف النودهي البرزنجي: ص٢٥٢-٢٥٣.

قەدەغەکراوە لە کار و کردەوە و رەفتارەکان تاکو لای رۆشن بێت لە پشت ئەوانەوە بۆی موباحن لەسەر بنچینەی: (بنەڕەت لە شتی بەسوددا موباحکردنە) بۆیە قازی خاوەنی دەسەڵاتی داهێنانی تاوانی نییە بە هەمان شێوە مافی داهێنانی سزای نییە.

شایانی باسە یاسا ئەم بنەمایەی نەزانیوە لەدوای شۆڕشی فەرەنسی نەبێت بۆ مافی مرۆڤ دەرچوو لە ساڵی ١٧٨٩ز، دەقی مادەی حەوتەم لەو جاڕنامەیە لەسەر بنەمایەکی بنچینەیی راستبوەتەوە کە بریتییە لە: تۆمەتبار کردنی تاك یان راگرتنی یان بەندکردنی دروست نییە مەگەر لەو بارانەی کە یاسا قەدەغەی کردوون بەپێی ئەو بنەڕەتانەی کە دیاری دەکات[1].

پاشان جاڕنامەی مافی مرۆڤ لە ساڵی ١٩٤٨ز دانییادانا لە مادەی (١١)یدا، هەروەها رێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکان تایبەت بە مافی مەدەنی و سیاسی لە ساڵی ١٩٦٦ لە مادەی (١٥) کە لە دەستوورە دانراوەکاندا هاتووە، لەوانە دەستووری عێراقی کاتی (م/٢٠ و م/٢١)[2].

شەریعەتی ئیسلام بە سەدان ساڵ پێش ئەم یاسا و جاڕنامە و دەستوورانە کەوتووە، راگەیاندی ئەم بنەمایە لە ئایەتی: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً﴾[3]، ﴿...وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ الْقُرَى حَتَّى يَبْعَثَ فِي أُمِّهَا رَسُولاً يَتْلُوا عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا﴾[4].

---

[1] الحريات العامة وحقوق الانسان للدكتور محمد سعيد مجذوب: ص ٥١.

[2] مادەی (٢٠) لە دەستوور ٢٩ی نیسان ١٩٦٤ دەقەکەی: (تاوان و سزا تەنها بینا لەسەر یاسا بوونیان هەیە، سزاش تەنها لەسەر کاروکردەوەی دوائرە بە دەرچوونی یاساکە کە بە دەق ئاماژەی پێدەکات) دەستووری ئامازەبۆکراو بە دەق هێناویەتی لە مادەی (٢١) کە (سزاکە تاکە کەسییە).

[3] سورة الإسراء—الآية ١٥.

[4] سورة القصص: ٥٩.

**دووەم: بنەمای کەسایەتی تاوان:** واتە هیچ مرۆڤێك لە رووی سزاییەوە پرسیاری لێ ناکرێت و سزا نادرێت لەسەر کاری تایبەت بە خۆی نەبێت، بۆیە پرسیارکردن لە کەسێك لەسەر کاری کەسێکی تر لە خێزانەکەی و کەسانی تر دروست نییە، بۆ گرنگی ئەم بنەمایە قورئان لە پێنج سورەتدا پێداگری لەم بنەمایە کردۆتەوە لە"سورة الأنعام"[1]: ﴿وَلاَ تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلاَّ عَلَيْهَا وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾ هەر کارێك کارێکی تاوانکاری بێت ئەو بەتەنها دەچێتە ژێر بەرپرسیارێتی و دەرئەنجامەکانی و هیچ نەفسێك شان ناداتە ژێر بەرپرسیارێتی تاوانکاری کەسێکی تر کەسەکە هەر کەسێك بێت و هەر جۆرە پەیوەندییەکی لەگەڵیدا هەبێت.

هەروەها لە"سورة الأسراء"[2]: ﴿مَنِ اهْتَدَى فَإِنَّمَا يَهْتَدي لِنَفْسِهِ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾، واتە: هەر کەس لایدا بەلای ئاکاری تاوانکاریدا ئەو بەتەنها دەرئەنجامەکەی دەگرێتە ئەستۆ، هەروەها لە"سورة فاطر"[3]: ﴿وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾، لە "سورة الزمر"[4]: ﴿وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾، لە کۆتایشدا لە "سورة النجم"[5]: ﴿أَلاَّ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾.

**سێیەم: بنەمای نەگەڕانەوەی یاسا:** هەر کەس کارێك ئەنجام بدات بەر لەوەی یاسا بە تاوانی دابنێت و بە قەدەغە ئەژماری بکات لەرووی مەدەنی و سزاییەوە پرسیاری لێ ناکرێت، بۆ گرنگی ئەم بنەمایە قورئان لە چوار ئایەتدا باسی لەبارەوە کردووە:

---

[1] الآية: ١٦٤

[2] الآية ١٥

[3] الآية ١٨

[4] الآية ٧

[5] الآية ٣٨

له "سورة النساء"[1]: ﴿وَلاَ تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ آبَاؤُكُم مِّنَ النِّسَاء إِلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ﴾ بەندوباوی کۆمەڵگەی عەرەبی وابوو کە کوڕ بۆی هەبوو ژنی باوکی(دایکی خۆی نا) مارە بکاتەوە لە دوای مردنی باوکەکە، بەو مانایەی ژنەکەی باوکی بەشێکە لە لێبەجێماو، قورئان ئەمەی حەرام کرد و بە تاوانی دانا، بەڵام فەرمووی لە رووی سزاییەوە پرسیار لە کەس ناکرێت کە پێش حەرام کردن ئەو کارەی ئەنجام دابێت، هەروەها لە "سورة النساء" [2]: ﴿وَأَن تَجْمَعُواْ بَيْنَ الأُخْتَيْنِ إَلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ﴾، قورئان کۆکردنەوەی دوو خوشکی لەگەڵ یەکتر لە هاوسەرگیریدا بە حەرام داناوە، لە "سورة المائدة"[3]: ﴿عَفَا اللّهُ عَمَّا سَلَف وَمَنْ عَادَ فَيَنتَقِمُ اللّهُ مِنْهُ﴾، هەروەها لە "سورة الأنفال"[4]: ﴿قُل لِلَّذِينَ كَفَرُواْ إِن يَنتَهُواْ يُغَفَرْ لَهُم مَّا قَدْ سَلَفَ﴾.

**چوارەم: بنەمای بنەڕەت ئەستۆپاکییە:** هەموو مرۆڤێك كە لەدایك دەبێت ئەستۆی پاکە لە هەموو پابەندبوونێکی مەدەنی و سزایی، گەر لە کاتی پێگەیشتن و ساڵی باڵغبووندا تۆمەتێکی سزایی یان مەدەنی درایە پاڵ ئەوا لەسەر قازی پێویستە کەسەکە بە بێتاوان تەماشا بکات هەتا تاوانبارکردنی دەسەلمێت، زانایانی ئوسوڵ فیقە لە سەرەتای ئیسلامەوە ئەم رێسا ئوسوڵییەیان راگەیاندووە و یاسای ئەم رێسایەی لێ وەرگیراوە: (تۆمەتبار بێگوناهە تا تاوانبارکردنی دەسەلمێت) [5]

زانایانی موسڵمان ئەم رێسایەیان لە دەقەکانی قورئانەوە وەرگرتووە، لەو دەقانە: لە "سورة الحجرات"[6]: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيراً مِّنَ الظَّنِّ إِنَّ

---

[1] الآية ٢٢
[2] الآية ٢٣
[3] الآية ٩٥
[4] الآية ٣٨
[5] مادەی (٢٣) لە دەستووری ئامارەبۆکراو دەڵێت: (تۆمەتبار بێگوناهە تا تاوانبارکردنی دەسەلمێت).
[6] الآية ١٢.

بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ﴾، هەروەها لە "سورە النجم"[1]: ﴿وَإِنَّ الظَّنَّ لَا يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئًا﴾.

**پێنجەم: بنەمای دانانی نەزانی(ئاگادارنەبوون) بە یاسا بیانوویەکی رێگرە لە بەرپرسیارێتی سزایی:** ئەمەش ئەوەیە کە قورئان رایگەیاندووە، لە سورەتی "قصص"دا[2] ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ الْقُرَى حَتَّى يَبْعَثَ فِي أُمِّهَا رَسُولاً يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا﴾، ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە مرۆڤ بەرپرسیار نییە لە هەر کارێکی تاوانکاری ئەنجامی دەدات گەر ئاگادار نەکرابێتەوە لەلایەن پێغەمبەرێکەوە، بە بەڵگەی ئەو بەشەی ئایەتەکە: ﴿يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا﴾، لە کاتێکدا یاسا ئەم نەزانینە بە پاساو و بیانوو دانانێت لەدوای بڵاوکردنەوەی لە هۆکارەکانی راگەیاندنی رەسمیدا مەگەر ئەوەی بە یاسا هەڵاوەردە دەکرێت.

**شەشەم: بنەمای وەرنەگرتنی هەواڵی هەواڵدەر هەتا دوای دڵنیابوونەوە لە دروستی هەواڵەکە:** دروست نییە هیچ رێوشوێنێکی قەزایی دژی تۆمەتبار بگیرێتە بەر بینا لەسەر هەواڵی هەواڵدەر مەگەر دوای دڵنیابوونەوەی قازی لێکۆڵەر لە دروستی هەواڵەکە، ئەوەش بۆ ئەوەی خۆی بەدوور بگرێت لە ئازاردانی بێگوناهێك و پەشیمانی کە ناتوانێت لەدوای لەدەستچوونی کات پیابگات و باریبووی بکاتەوە، قورئان لە سورەتی "الحجرات"دا دەفەرموێت: [3]﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن جَاءكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَن تُصِيبُوا قَوْماً بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ﴾.

**حەوتەم: بنەمای سزادانی ئەو کەسەی بوختان بە کەسێك دەکات بە تۆمەتی ئەخلاقی(تاوانی زینا):** گەر ئەو تۆمەتە لەبەردەم قەزادا بە چوار شایەت نەسەلمێنرا، قورئان لە سورەتی "النور"[4] دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ

---

[1] الاية ٢٨.

[2] الاية ٥٩ .

[3] الاية ٦.

[4] الاية ٤.

الْمُحْصَنَاتِ[1] ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَداً وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾، ئەم ئایەتە سێ جۆر سزای راگەیاندووە بۆ هەر کەسێك تۆمەتێکی ئەخلاقی دەبەخشێتەوە بەسەر کەسانی تردا و ناتوانێت بە بوونی چوار شایەت بەسەریدا بسەلمێنێت، سزای یەکەمیان جەستەییە کە بریتییە لە لێدانی هەشتا جەڵد، دووەم و سێیەم سزای نەفسین کە بریتین لە دارمانی کەسایەتی ئەو کەسە بەوەی شایەتی لەبەردەم قەزادا قبوول ناکرێت و بە مۆری "فسق-دەرچوو یان لادەر" مۆردەکرێت.

**هەشتەم: توندکردنەوەی سەلماندنی تاوانی زینا:** ئەم تاوانە تەنها بە چوار شایەتی پیاوی دادپەروەر دەسەلمێت، بە جۆرێك هیچ جیاوازییەك لە نێوان قسەکانیاندا نەبێت، قورئان ئەو راستییەی بەیان کردووە لە "سوره النور"[2]: ﴿لَوْلَا جَاؤُوا عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا بِالشُّهَدَاءِ فَأُوْلَئِكَ عِندَ اللَّهِ هُمُ الْكَاذِبُونَ﴾، بۆیە ئەم تاوانە لە مێژووی ئیسلامدا نەسەلماوە مەگەر تاوانبارەکە خۆی هاتبێت دانی بە تاوانەکەدا نابێت ئەوەش لە کاتی هاتنی پەیامی ئیسلامدا کە سزای ئەم تاوانە بەسەر ژمارەیەکی کەمدا پیادەکراوە کە لەبەردەم پێغەمبەردا چوارجار دانی بە گوناهەکەیدا ناوە.

**نۆیەم: پێغەمبەر-ﷺ- فەرمانی بە قازی کردووە تۆمەتباری تاوانی زینا هانبدات پەشیمان ببێتەوە لە دان پیادانانەکەی:** چونکە تەنها بە دان پیادا نان دەسەلمێت: "أبو هريره" دەفەرموێت: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((پیاوێك لە موسڵمانان هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ کە لە مزگەوت بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا من زینام کردووە، پێغەمبەر پشتی لێ هەڵکرد و رووی لێ وەرچەرخان، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا من زینام کردووە، ئەم جارەش دیسان پشتی

---

[1] ئافرەتی مێرداری خاوەن شەرەف.
[2] الاية: ١٣.

لێکرد، تا چوار جار دووبارە بوویەوە، کە چوار شایەتی لەسەر خۆیدا پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کرد و پێی فەرموو: تۆ شێتی، وتی نەخێر، فەرمووی: ژنت هێناوە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی بیبەن رەجمی بکەن)) [1]

شایانی باسە سزای رەجم لە قورئاندا بوونی نییە، بەڵکو بە کاری پێغەمبەر(ﷺ) جێگیر بووە، هەندێك پێیان وایە بە ئایەتی جەڵد لێدان سڕاوەتەوە، ئایەتەکە: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ﴾ [2]، بە بۆچونی ئێمە ئەم رایە پێکاویەتی و دروستە، چونکە لە جیاکەرەوەکانی تاوانی سنووربەزێنی بریتییە لە کاریگەرنەبوون بە رەوشی توندکراوە، سەرباری ئەوەی لە رووی کردارییەوە ئەو تاوانە لەبوونخراوەو، زیاتر لەگەڵ دادگەری ئیسلامدا یەکدەگرێتەوە.

**دەیەم: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کردووە بە قازی رێگەی ئاشتەوایی بگرێتەبەر:** ئەمەش بۆ چارەسەری ناکۆکی نێوان دوو لایەنە رکابەرەکە بخاتە روو لەو شتانەدا ئاشتەوایی تیایاندا دروستە [3].

**یازدەهەم: ئازادی گفتوگۆکردن و تاوتوێ کردن لەگەڵ قازی بۆ دوو رکابەرەکە لە پرسە سزایی و مەدەنییەکاندا:** ئەوەش کاتێك رکابەرەکە قەناعەتی بە دادپەروەی بڕیارەکەی قازی نەبێت، ئەم ئازادییە قورئان رایگەیاندووە کاتێك "خەولە کچی حەکیم" گفتوگۆی کرد لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) و پێداگری کرد لە گفتوگۆکەیدا لەو بڕیارەی دەریکردبوو لەمەڕ زیهاری (پشت تێکردن و لەخۆ قەدەغە کردن) هاوسەرەکەی لە خەولە، کاتێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، هاوسەرەکەم(ئەوس)ماڵەکەی خواردم، ، گەنجێتی تیابردم، سکم بۆی هەڵچۆڕا تا تەمەنم کرد و لە منداڵ بوون وەستام زیهاری لێکردم، پێغەمبەر وەڵامیدایەوە:

---

[1] صحيح مسلم: ١٣١٨/٣.

[2] سورة النور-الاية: ٢.

[3] صحيح مسلم: ٣\١٣٤٥.

من وا دەبینم تۆ لەو حەرامکراوی، خەولەش جارێکی تر لەگەڵ پێغەمبەر لەسەر ئەو پرسە پێداگری کردەوە و بەو ئەوپەڕی ئازادییەوە گفتوگۆی لەگەڵ دەکرد و دەیوت: ئەی پێغەمبەری خودا منداڵم لێی هەیە، گەر باوکیان بیانگرێتە خۆ تیادەچن، گەر من بیانگرمە خۆم برسیان دەبێت، پێغەمبەر بۆی دووبارە کردەوە و فەرمووی: من وا دەبینم تۆ لەو حەرامکراوی، ئەوەش لەبەرئەوەی زیهار بەر لەوەی حوکمەکەی لە قورئاندا دابەزێت تەلاق بوو، بۆیە خەولە وتی: سکاڵای خۆم دەبەمە لای خودا بۆ خۆم و منداڵەکانم، دیاریوو بە حوکمەکە قەناعەتی نەبوو، پاشان ئایەتە قورئانییەکە دابەزی بۆ بەرژەوەندی خەولە، قورئان حوکمەکەی دیاری کرد بەوەی ئەو کارە تەلاق نییە، بەڵکو لەسەر زیهارکردن سزای پیاوەکە دەدرێت بە سزای بەدەنی و دارایی بەهۆی یاریکردن بە پەیوەندی هاوسەرێتییەوە، بۆیە قورئان حوکمەکەی بە یەکێك لەم سێ سزایە دیاری کرد، ئەوەش بەپێی زنجیرە وەك ئەوەی لە ئایەتەکەدا بەدوای یەکتردا هاتوون: بۆیە یەکەم لەسەر پیاوەکە پێویستە بەندەیەك بکڕێت و ئازادی بکات، گەر بەندەی نەبینییەوە دوو مانگ بەدوای یەکدا بەڕۆژوو بێت، گەر نەیتوانی خواردنی شەست گەدا بدات[1].

**دوازدەهەم: شوبهە لە تاوانی سنووریەزێنیدا سەردەکێشێت بۆ کەوتنی یان وەرچەرخانی بۆ سزایەکی سووکتر لەو سزادانە:** بۆ نموونە، تاوانی دزی لە نێوان بنەڕەت و لقدا(لە رەچەڵەکدا) یان لە نێوان دوو هاوسەردا وەردەچەرخێت بۆ تاوانێکی رووشکێنی گەر تاوان دەرحەقکراو داوایەك پێشکەش بکات لەسەر

---

[1] سورة المجادلة / دەقی ئایەتەکە: ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ، الَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنْكُمْ مِنْ نِسَائِهِمْ مَا هُنَّ أُمَّهَاتِهِمْ إِنْ أُمَّهَاتُهُمْ إِلَّا اللَّائِي وَلَدْنَهُمْ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنْكَرًا مِنَ الْقَوْلِ وَزُورًا وَإِنَّ اللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ، وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا ذَلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ، فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا فَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا﴾. الاية ١-٤.

سزادانی تاوانبار بە سزایەکی رووشکێنی بەبێ دەستبڕین، ئەمە ئەوەیە کە فەقیهەکانی شەریعەتی ئیسلام کۆدەنگیان هەیە لەسەری، برگەی سێیەم لە مادەی سێیەم لە بنەڕەتی دادگاییکردنە سزاییەکان کاریگەری شوبهەی وا لەبەرچاوگرتووە کە کورتهەڵهێنەرە لە وەرچەرخانی تاواندا لە دەستدرێژیکردنە سەر مافێکی گشتی بۆ دەستدرێژی کردنە سەر مافێکی تایبەت، بۆیە دروست نییە داوای سزایی بجوڵێنرێت مەگەر بینا لەسەر سکاڵای تاوان دەرحەقکراو یان ئەو کەسەی لەرووی یاساوە لە جێگەی ئەو راست دەبێتەوە.

**سیازدەهەم: لێبوەشاوەیی سزایی تۆمەتبار:** لە شەریعەتی ئیسلامدا لەرووی سزاییەوە لە تۆمەتبار ناپرسرێت گەر ئەم پێنج مەرجەی تێدا نەبێت، کە ئەمانەن:

١.دەبێت گەیشتبێتە تەمەنی پێگەیین لە کاتی ئەنجامدانی تاوانەکەدا، گەر نەیدەتوانی جیاکاری بکات ئەوا پرسیاری لێ ناکرێت، گەر کەسێك جیاکاری دەکرد ئەوا تەنها هۆکاری چاککردنی لەگەڵ دەگیرێتە بەر.

٢.پێویستە کەسەکە ئاقڵ بێت، بۆیە هەر ناتەواوییەکی ئەقڵی لە کەسی تۆمەتباردا بە رێگر لە بەرپرسیارێتی سزای سەرژمێر دەکرێت.

٣. دەبێ کەسەکە ئازاد بێت لە هەڵبژاردندا واتە خاوەنی ویستێکی ئازاد بێت، گەر کەسەکە زۆرلێکراو بوو یان ناچاربوو ئەوا لەرووی سزاییەوە پرسیاری لێ ناکرێت.

٤. پێویستە کەسەکە خاوەنی توانین بێت بەسەر ئەوەی داوای لێکراوە ئەنجامی بدات یان وازی لێ بهێنێت.

٥.پێویستە زانا بێت بەوەی داوای لێکراوە لە کردن یان نەکردن.

ئەم پێنج مەرجە لەژێر ئەم ئایەتەدا جێگەی دەبێتەوە کە دەفەرموێت: ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا﴾[1].

---

[1] سورة البقرة– الاية: ٢٨٦.

**چواردەهەم: لێوەشاوەیی قازی:** لە شەریعەتی ئیسلامدا تەنها ئەوانە دەکرێنە قازی کە دادپەروەر و پاك و شایستەن بۆ ئیجتیهاد، هەتا ئەو سیفەتە چاك و پاكانە لە قازیدا زۆرتر و زیاتر بێت دەستەبەرکردنی دادپەروەری بڕیارەکەی زۆرتر بەدیدێت.

**پازدەهەم: تەزکیەی شایەتەکان:** دروست نییە قازی بڕیار بدات بینا لەسەر وەڵامگۆیی شاهیدەکان گەر تەزکیەی ئەو شاهیدانە نەکرابێت لە لایەن ئەهلی متمانەوە.

**شازدەهەم: پێویستە قازی لە کاتی دادگاییدا خاوەنی حاڵێکی ئارام و نەفسییەتێکی جێگیر بێت دوور لە گرژیوونێکی دەمارگیرانە:** "عبدالرحمن بن أبی بکره" دەگێڕێتەوە کە گوێی لە پێغەمبەری خودا بووە فەرموویەتی: ((نابێ کەسێك داوەری بکات لە نێوان دوو کەسدا و توورەبێت)) [1]

**حەفدەهەم: گەر تاوانبارکردنی تۆمەتبار سەلمێنرا بە ئەنجامدانی تاوانی کوشتنی هەڵە سزاکە بریتییە لە پێدانی خوێن لە لایەن کەسوکاری تۆمەتبارەوە:** ئەو هیچ جۆرە بەرپرسیارێتییەکی ئەو سزایە هەڵناگرێت، کەسوکاری کەسەکە واتە عەشرەت و هۆز و بنەماڵەکەی گەر هەیبوو، ئەگەر نا، لەسەر ئەو دامەزراوەیە کە تاوانبار خۆی داوەتە پاڵ وەك یەکێتییەکان.

**هەژدەهەم: قازی دەتوانێت بڕیار دەربکات بە بێتاوانی کەسی تۆمەتبار و شوێنکەوتووەکان لە سەرپەرشتیار و وەسێتدار و کەسانی تر شان بخەنە ژێر بەرپرسیارێتی کاری تاوانکاری:** عومەری کوڕی خەتاب بەمە قەزاوەتی کردووە کاتێك چەند کۆیلەیەکی "حاطب المزني" تاوانی دزییان [2] کردبوو لە گەورەکەی خۆیان، یەکەمجار حوکمی دەرکرد بە بڕینی دەستی بەندەکان، پاشان پێش

---

[1] صحیح مسلم: ١٣٤٣/٣.

[2] وشترێکیان دزی بوو سەریان بڕی بوو و گۆشتەکەیان خوارد بوو.

جێبەجێ کردن وتی بە "حاطب": وا دەتبینم تۆ ئەم بەندانەت برسی کردبێت، سوێند بە خودا بە سزایەکی دارایی وا سزات دەدەم ئازارت پێ بگەیەنێت، لە کەسێك کە وشتری هەبوو پرسیاری نرخەکەی کرد، وتی لە ٤٠٠ درهەمدا نەمدەفرۆشت، واتە بەو برە پارەیە وشترەکەم لەدەست نەدەبوویەوە، بۆیە عومەر بڕیاری دەرکرد بەسەر "حاطب"دا بە هەشت سەد درهەم سزای دارایی.

**نۆزدەهەم: وەڵامگۆیی کەسی تۆمەتبار وەرناگیرێت گەر لەژێر فشاری هەڕەشەلێکردن و ئازارداندا لە دەمی وەرگیرا بوو:** ئەوەش لەبەر ئەوەی بێباوەری کردن لەدوای باوەڕ لەژێر فشاری زۆرلێکردن و ئازاردان و هەڕەشەدا بە بێباوەڕی ناژمێررێت، بێباوەڕی لە گەورەترین تاوانەکانە، قورئان بە دەق ئەوەی هێناوە و دەفەرموێت: ﴿مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِهِ إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ﴾[1]، گەر بێباوەڕی لەژێر فشاری هەڕەشە لێکردن و ئازارداندا وەرناگیرێت و هیچ ئاسەوارێك لەسەری پەیدا نابێت ئەوا وەرنەگرتنی وەڵامگۆی کەسی تۆمەتبار بە هەڕەشە و ئازاردانی لەپێشترە.

دەیان بنەما و ڕێسای گشتی کە شەریعەتی ئیسلام رایگەیاندون بۆ بەرژەوەندی کەسی تۆمەتبار بەر لە زیاتر لە چواردە سەدە، یاسا زۆربەیانی نەزانیوە و نەناسیوە هەتا سەدەیەك یان دوو سەدە لەمەوبەر، هەشیانە هێشتا یاسا پەیی پێ نەبردووە.

---

[1] سورة النحل–الآية: ١٠٦.

# بەشی پێنجەم

## مافی ئازادی ماڵیی

## (خاوەنداریێتی و کار و گرێبەست)

**( حق الحرية المالية )**
**( الملكية والعمل والتعاقد )**

لێکۆڵینەوە لەم مافانە بۆ سێ دەروازە دابەش دەکەین.

# دەروازەی یەکەم:
# مافی خاوەنداریّتی

## ( حق الملكية )

زۆرێـك لەخـەڵك بانگەشـەی ئـەوەیان دەكـردو ئێسـتاش دەیكـەن كـەمافی خاوەنـداریّتی لەئیسـلامدا مـافێكی پـیرۆزەو هـیچ سـنوورێكی بـۆ دیـاری نـەكراوە، سیستەمی ئابووریش لەئیسلامدا سیستەمێكی سـەرمایەدارییە یـاخود دژ نیـە لەگـەڵ سەرمایەداریدا، لەبەرانبـەر ئـەوەدا بۆچـوونێكی تـەواو پێچـەوانە هەیـە كەسیسـتەمی دارایی لەئیسلامدا بەجۆرێكە كەلەگەڵ بیرۆكەی شیوعیەتدا یەكدەگرێتەوە.

بـەڵام لەواقیعـدا هـەردوو بانگەشـەكە لەگـەڵ سیسـتەمی دارایـی لەئیسـلامدا یەكناگرنەوە، بەڵكو مـافی خاوەنـداریّتی بیرۆكەیـەكی سـەربەخۆیە لەراسـتو چـەپ، چـونكە ئیسـلام لـەبیردۆزەو بنچـینەو بنەماكانیـدا لەسـەروی ئـەو سیسـتەمانەوەیە كەبەرهەمی بیری مرۆڤن، سیستەمی دارایی لەئیسلامدا سیستەمێكی نایابەو لەهەموو سیستەمە كۆنو هاوچەرخەكان جیـاوازە، ئیسـلام دان بـەمافی خاوەنـداریّتی هـەموو مرۆڤێكدا دەنێت تەنانەت كۆرپەش كەلەسكی دایكیدایەو دان بەمافی سوودمەندبوونی خاوەن موڵك لەموڵكەكەیـدا دەنێـت، هـەروەها مـافی بـەكارهێنان بەدرێـژایی ژیـانی، بەهەمان شێوە ئـەو مافانـەی بـەكارهێنانی بـۆ هەیـە كەخراوەتـە پـاش مردنـی وەك وەقفـو راسپاردن (وەسیەت)و بەتەواوەتی دەیپارێزێت لەهەر دەستدرێژیەك بۆ سـەر موڵكەكـەی، بەمـەش ئیسـلام جیـاوازە لـەرێبازی شـیوعیەت كـەدان بەخاوەنـداریّتی

تایبەتدا نانێت لەسەرچاوەکانی بەرهەمهێناندا[1]، کەئەوەش دژیەکە لەگەڵ ئارەزوو (غەریزە)ی فیتری مرۆڤ لەخۆشەویستی خاوەنداریتیو بەشێکی بنەڕەتی لەهۆی گەشەی چالاکی ئابوری لەبەرچاو نەگرتووە.

بەهەمان شێوە خاوەنداریتی لەئیسلامدا جیاوازە لەسیستەمی لەهاوشێوەکەی لەئابووری سەرمایەداریدا کەدان بەپیرۆزی خاوەنداریتیو دەستەڵاتی رەهای خاوەن موڵك لەخاوەندارێتیدا دەنێت بەبێ هیچ کۆتو بەندێك چونکە ئیسلام کاتێ دانی بەمافی خاوەندارێتیدا بۆ تاك ناو لەپێناوی بەدیهێنانی بەرژەوەندی گشتیدا کۆتو بەرپرسیارێتیو پابەندی خستە ئەستۆ.

ئەم کۆتو بەندو ئەرکو پابەندیانە بەپێی پێویستیەکانی ژیانی ئەو کۆمەڵگایەی خاوەن موڵکەکەی تێدا دەژی بۆ فراوانکردنو کەمکردنەوە دەست دەدات، بەجۆرێك لەکۆتو پابەندیانە وایکردووە خاوەنداریتی تاك هاوشێوەو نزیك لەکاری کۆمەڵایەتی بچێت کەخاوەن موڵك بۆ خزمەتی کۆمەڵگە ئەنجامی دەدات، چونکە بەرنامەی ئیسلام گشتگیرە بۆ ژیان، تەنانەت پەرستشەکانی پەیوەندداره بەرێکخستنی ئەو بەرنامەیەوەو کاریگەری راستەوخۆی هەیە لەسەر ئاراستەکانی، هەر ئەوە دەستی مرۆڤ دەگرێتو هانی دەدات لەسەر ئەو رێبازە لەسەر رۆشتووە بڕۆن، لەبەر ئەوە ویستی خوای گەورە وابووە کەکۆتا ئاینو دەستوور گشتگیر بێتو هەموو رەفتاری مرۆڤ تێدا بێت تا هەموو ئاسۆکانی ژیانی تاكو کۆمەڵ لەخۆ بگرێت.

رێنوێنیە ئاکاریەکان لەئیسلامدا یاخود بەدەربڕینێکی تر رێنوێنیە ویژدانی یاخود بیروباوەڕیەکان باڵی کێشاوە بەسەر رێکخستنی ئابووریداو، وابریار دەدات هەمووشتێك کەلەبووندا هەیە موڵکی خوای گەورەیە کەبەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی لەنێوانیاندایەو مرۆڤیش ئەوەی کەهەیەتی لەماڵ بەدەستهێنانی

---

[1] بروانە: مادەکانی: ٩٤–٩٥–٩٦ و دواتر، لەیاسای مەدەنی کۆماری روسیای ئیتیحادی سوشیالیستی سۆڤیەت، وەرگێڕانی دکتۆر ثروت الاسیوطي.

شتێکی خواستراوه کەخوای گەوره خستویەتیە بەردەستی، چونکە خوای گەوره خاوەنی ماڵەکەیەو مرۆڤیش دروستکراوی خوایە لەسەر زەویەکەیدا پابەندە بەسوود وەرگرتن لەو ماڵە هەرکاتێ ئەو سوود وەرگرتنە پێویستیەکانی دابین بکاتو لەگەڵ بەرژەوەندی ئەو کۆمەڵگایەی تێیدا دەژیو بەرژەوەندی مرۆڤدا بەشێوەیەکی گشتی یەك بگرێتەوە.

چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆز ئەم بیروباوەرەیان لەویژدانی مرۆڤدا چاندووە، لەوانە: ﴿ذَلِكُمْ اللَّهُ رَبُّكُمْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ...﴾[1] ، لۆجیکی مرۆڤبوونمان ئەوە دەخوازێت کەئەوکەسەی بەدیهێنەری شتە هەر ئەویش خاوەنی بێت، وەك دەفەرمووێت: ﴿...وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا...﴾[2] ، لەئایەتێکی تردا هاتووە: ﴿آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَأَنْفِقُوا مِمَّا جَعَلَكُمْ مُسْتَخْلَفِينَ فِيهِ...﴾[3] ، هەروەها دەفەرمووێت: ﴿...لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ...﴾[4]، لەئایەتێکی دیکەشدا هاتووە: ﴿...إِنْ يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَسْتَخْلِفْ مِنْ بَعْدِكُمْ مَا يَشَاءُ...﴾[5]، ئەم دەقانە و هی دیکەش بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئەو ماڵەی بەدەستی مرۆڤەوەیە ماڵی خوای گەورەیەو ئەوان تێیدا جێنشین یاخود بریکارن.

ئەو بیروباوەرە ئاینیەی لەم ئایەتانەو هاوشێوەکانی وەردەگیرێت ئەوەیە کەمرۆڤ جێنشینی خوایە لەسەر هەموو ئەو ماڵەی لەبەر دەستیدایە، بەرپرسیارێتی ئەم جێنشینیەی لەسەرە، بۆی نیە دوابکەوێت لەجێبەجێکردنی ئەو ئەرکو پابەندیو کۆتانەی کەلەبابەتی خاوەندارێتیدا لەسەری دانراوە، ئەو کۆتو پابەندیانەش زۆرن، گرنگترینیان تۆدانەیە، هەیانە ئەرێنیەو هەیانە نەرێنیە، وەك لێرەدا دەیانخەینە روو:

---

[1] سورة الانعام: ١٠٢ .

[2] سورة المائدة: ١٧ .

[3] سورة الحديد: ٧ .

[4] سورة النور: ٥٥ .

[5] سورة الانعام : ١٣٣.

**کۆتی یەکەم:** —ئەویش ئەرێنیە—ئازادی خاوەندار لەموڵکەکەیدا بەوە کۆت دەکات کەدەبێت وەبەری بێنێت ئەگەر لەسەرچاوەکانی بەرهەمهێنان بوو، تا کۆسپ دروست نەکات لەبەردەم وەبەرهێنانو گەشە لەچوارچێوەی رووە رەواکاندا بەجۆرێك بەشی پێویستی ئەوانە بکات کەئەم بەخێوکاریانە بەئەمەکداریەکی جوانەوە بەبێ زیانگەیاندن بەبەرژەوەندی کۆمەڵگا.

لەکاتێکدا ئیسلام رقی لەهەژاریەو هەوڵی قەڵاچۆکردنی دەداتو داوا لەمرۆڤ دەکات کۆشش بکات بۆ گەشەپێدانی ئابووری لەچوارچێوەی ئەو هۆکارانەی کەخوای گەورە خستونیەتە بەردەست بۆ بەدەستهێنانی ماڵو وەبەرهێنانی، راگرتنی ماڵ لەلایەن خاوەن موڵکەوە ئەو مافە بەفەرمانرەوا دەدات دەستوەردان بکات ئەگەر بەرژەوەندی وای پێویست کردو موڵکەکە لەو کەسە وەربگیرێتەوەو بدرێتە کەسێك کەوەبەری بێنێت، ئەم کارە لەسەردەمی پێغەمبەرو خەلیفەکانی راشیدین لەسەرەتای هاتنی ئیسلامدا جێبەجێ کراو پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((لیس لمحتجر حق بعد ثلاث سنوات))[1]، واتە: دەستبەسەراگر پاش سێ ساڵ هیچ مافێکی نیە، مەبەست لە (متحجر) دەستگرتنە بەسەر زەوی مردوودا بەمەبەستی زیندووکردنەوەو بوژاندنەوەی.

عومەری کوری خەتابیش (خوا لێی رازی بێت) لەکاتی فەرمانرەوایەتیەکەیدا فەرمووی: هەرکەس زەوییەکی مردوو ببوژێنێتەوە ئەوا بۆ خۆی دەبێتو پاش سێ ساڵ دەست بەسەراگر (کەبەکاری ناهێنێت) مافی بەسەرەوە نیە[2])، پاشان جێبەجێکرانەکەی گشتاند کاتێ وتی: هەرکەس زەویەکی بۆ سێ ساڵ لەکارخستو هیچی تیا نەچاندو کەسێکی تر هاتو بەکاری هێنا ئەوا بۆ بەکاربەرەکەیەتی[3]).

---

[1] بڕوانە: نصب الراية— للزيلعي: ٤\٢٩٠ .

[2] بڕوانە: ژێدەری پێشوو.

[3] بڕوانە: الدراية في تخريج احاديث الهداية ، للحافظ ابن حجر العسقلاني: ٢\٢٤٥ (برقم٢٨٤).

بیلالی کوری حارسی مزنی کەپێغەمبەر (ﷺ) زەوی (عقیق)ی پێدابوو خەلیفە عومەر (خوا لێی رازی بێت) پێی وت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو زەویەی پێنەداویت تا لەخەڵکی دابڕیت، بەڵکو بۆ ئەوەیە تاکاری تێدا بکەیت، جا ئەوەندەی کەتوانات بەسەر بوژانەوەیدا دەشکێت بیبەو ئەوی تری بدەرەوە پێمان[1]).

رووکاری فەلسەفەی ئەم جێبەجێکرانە سووربوونی ئیسلام لەسەر دەستاودەستکردنی خاوەندار بۆ ئەوماڵەی کەهەیەتی دووپات دەکاتەوە، چونکە لەبنەڕەتدا ئەو ماڵە هی خوای گەورەو ماڵی کۆمەڵگایە، سوودی بەردەوامی وەبەرهێنانی یەکەم بۆ خۆی دەگەڕێتەوە پاشان بۆ کۆمەڵگاکەی، چونکە دەبێتە هۆی زیاتربوونی بڕی داهاتی نەتەوەیی‌وسەرمایەی نەتەوەیی، هەروەها پێویستە باشترین رێگا لەوەبەرهێنانی‌دا بگیرێتە بەر، چونکە رێنوێنیە ئاکاریەکانی ئیسلام لەسەر هەموو کەسێك کەکارێك ئەنجام دەدات پێویست دەکات کەبەجوانترین‌و چاکترین شێوە ئەنجامی بدات.

ئەگەر خاوەن موڵك بەئەنقەست بەجۆرێ بەکاری هێنا کەبەروبوومی نەبێ یاخود ببێتە هۆی تیاچوونی سەرمایەکەی، بۆ وەلی ئەمر دروستە لەو شێوە خراپە بیگێڕێتەوە کەلەسەری دەڕوات‌و بیخاتە سەر رێگایەکی تێگەیشتووانە کەڕەوشی کۆمەڵگاو ئاستی بژێویان ئەوەی دەخواست کەشێوەی زۆرباش لەشێوەکانی وەبەرهێنانی‌دا بەکاربهێنرێت.

بەهەمان شێوە ئەگەر سامان لەدەست پیرێکی کەمی گەلدا کۆبوویەوەو، ئەو سەرمایەش لەسەرچاوەکانی وەبەرهێنان بوو کەقوتی کۆمەڵگای لەسەر بوو، پاشان سەلمێنرا دەستەوسانن لەوەبەرهێنانی بەشێوەیەکی شیاو، ئەو کارەشیان بووە هۆی بێبەش بوونی کۆمەڵگا لەسوودەکانی ئەو وەبەرهێنانە بەو شێوەیە، ئەوا بۆ فەرمانڕەوا هەیە دەستێوەردان بکات تا ئەو زیانە گشتیە لەو کۆمەڵگایە

[1] صحيح ابن خزيمة: ٤\٤٤ (برقم ٢٣٢٣) .

دووربخاتەوە، ئەمەش وەك جێبەجێکردنی ڕێسا گشتیەکان، لەوانە: (يتحمل الضرر الخاص لدفع الضرر العام)[1] ، (يتحمل الضرر الادنى لدفع الضرر الاعلى).[2] ، واتە: (لەپێناوی لادانی زیانی گشتیدا زیانی تایبەت لەئەستۆ دەگیرێت)، (بۆ لادانی زیانی زیاتر زیانی کەمتر لەخۆ دەگریت)، سروشتی ئەم دەستێوەردانەش بەناچارکردنی ئەو کەسانە دەبێت تا شێوەی پێگەیشتووانە لەوەبەرهێنانی سەرچاوەکانی بەرهەمهێناندا پەیڕەو بکەن، یاخود هەندێك لەزەویەکان ئەوەندەی کەتواناییان بەسەریدا دەشکێت وەبەری بهێنن لەژێر دەستی خۆیاندا بهێڵنەوەو ئەوەی تری بدەنە دەست کەسانی تر تابەو شێوەیەی پێویستیەکانی کۆمەڵگا دابین دەکات بەشێوەیەکی باش وەبەری بهێنن، ئەمە پاش ئەوە دێت کەقەرەبوویەکی دادپەروەرانەیان پێ دەدرێت، چونکە قورئانی پیرۆز تەنها داوای چاکەکردن لەگەڵ هەژارو هەتیوو نەدارانی نەکردووە جاری بەسەرنج ڕاکێشان بۆ لای پاداشتی خوای گەورە لەبەرانبەر ئەو کارەداو، جاری بەترساندنیان، تەنها بەوە وازی هێنابێت و کاروباری ئابووری بەو جۆرە خراپ وشکەی کەهەیە لێ گەڕابێت، بەڵکو قورئانی پیرۆز گرنگی پێدانی خۆی بەرەو چاکسازی سیستەمی دارایی و ڕەوشی سیستەمی ئابووری دادپەروەر ئاراستە کردووە.

ئەمەش لەسەر ئەو گریمانەیە کەئەو سەرمایە کەڵەکەبووەی پێی گەیشتووە بەهۆکاری ڕەوا بووە، بەڵام ئەگەر هەندێکی یاخود هەمووی لەرێی هۆکاری نارەواوە —وەك بەدزی و دەستبەرداگرتن— یاخود وەرگرتنی بەشێوەیەکی نارەوا بەدەست هێنابوو، پێویستە هەمووی یاخود هەندێکی بەبێ قەرەبووکردنەوە لێ وەربگیرێتەوە، نمونەی ئەمەش وەك ئەو زەویە فراوانانەی کەلەژێر دەستی ئاغاکاندایە لەعێراقداو لەلایەن دەوڵەتی عوسمانیەوە پێیان دراوە، پاشان لەلایەن ئینگلیزەوە لەسەردەمی

---

[1] الاشباه والنظائر لابن نجم زين العابدين ابراهيم: ١\١٥٧ .

[2] سەرچاوەی پێشوو: ١\١٢٠ .

داگیرکاریداندا بۆ بەرژەوەمدی ئەم وڵاتو ئەو وڵات پێیان داون، چونکە ئەو زەویانە موڵکی دەوڵەت بوونو بۆ سەرۆکی وڵات یاخود هیچ بەرپرسێکی تر نیە بیبەخشێتە هیچ کەسێك ئیتر ئەو کەسە هەر سیفەتێکی هەبێت، چونکە ئەگەر زەویەکە موڵکی گەل بوو ئەوا بەدەستبەسەردا گیراو (غصب) دادەنرێت.

لەپاڵ ئەوانەدا زەویەکانی عێراق بەسامانی گشتی دانرا کاتێك کەوتە ژێر دەستەڵاتی حوکمی ئیسلامیدا عومەری کوری خەتاب (خوا لێی رازی بێت) -بەو پێیەی خەلیفەی موسڵمانان بوو- کردیە وەقفو مافی گەل هەموو بەبێ تایبەتکردنی دەستەیەك پێیانەوە.

**کۆتی دووەم**: -ئەویش ئەرێنیە- کۆتکردنی ئازادی خاوەن موڵك بەناچارکردنی بەدانی زەکات لەماڵەکەی ئەگەر گەیشتە ئاستی زەکات پێویستبوون، ئەو کاتە لەسەری پێویستە رێژەیەکی سەدی لێی بدات بەهەژارانو نەدارانو کەسانی تر، ئەگەر خاوەندار ئامادە نەبوو بیدات ئەوا فەرمانرەوا بۆی هەیە ناچاری بکات بەزۆر بیدات.

**کۆتی سێیەم**: ئەویش ئەرێنیە- کۆتکردنی ئازادی خاوەن موڵك بەناچارکردنی کەلەپێناوی خوا لێی خەرج بکات بەو جۆرەی کەخواستو داواکاری کۆمەڵگاکەی دەیخوازێت.

بەخشین لەپێناوی خوا واتە بەخشین لەپێناوی بەرژەوەندی گشتیداو فەرزێکی پابەندکارە لەبنەرەتیداو لەچوارچێوەیدا سەرپشك کراوانەیە، بەو واتایەی کەدیاریکردنی ئەو بەشەی مرۆڤ لەماڵەکەی لەپێناوی خوداو بەرژەوەندی گشتیدا دەیبەخشێت دەکەوێتە ژێر ویستی تەواوی خۆیو ویژدانیەوە.

جیهادکردن بەگیانو ماڵ لەپێناوی خواداو بەبەخشینی خۆراكو دوورخستنەوەی برسێتی لەخەڵکیو ئازادکردنی کۆیلەو چاکەکردن لەگەڵ دایكو باوكو خزمان، هەموو ئەوانەلەئەرکەکانی سەرشانی دەوڵەمەندەکانە لەئیسلامدا ئەویش لەرێگەی بەخشینو زەکاتەوە جێبەجێ دەبێت.

بەڵام بەخشین (انفاق) لەخۆیدا بەجۆرێك لەسەری فەرزە کەدەستبەرداربوونی نیە، هەروەك چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆز ئەو مانایە دەبەخشن، لەوانە لەم ئایەتەدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلاَ تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ..﴾[1]، ئەو باجانەی کەدەوڵەت بۆ بەرژەوەندی کۆمەڵگا وەریاندەگرێت بەگشتی دەچێتە چوارچێوەی بەخشین لەپێناوی خوا، چونکە کۆمەڵگای ئیسلامی بونیاتێکی یەکتر تەواوکارە و بەشێکی بەشەکەی تری تەواو دەکات، لەپێویستیەکانی ئەو یەکتر تەواوکردنەش لەخزمەتگوزارییە گشتیەکاندا کە بۆ هەموو کۆمەڵگا گرنگەو دەوڵەت پێی هەڵدەستێەوە، پێویستە هەموو کەسێك لەکۆمەڵگادا کەتوانای هەبێت لەدابینکردنیدا بەشدار بێت، پاشان لەروانگەی ئیسلامەوە مەبەست لەو باجانە تەنها ئامادەکردنی سامانی پێویست نیە بۆ بەڕێوەچوونی ئەو خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتیانەو دابینکردنی خەرجیەکانی دەوڵەت، بائەوە بەشێکی گەورەی مەبەستی دارێژرانی یاسای باج بێت بەڵام لەوە گرنگتر ئەوەیە هۆکارێکە لەرێی یاساوە بۆ وەرگرتنەوەی ئەوە بۆ کۆکردنەوەی سامانی زیادە لەدەستمایەی چینەکان بۆ هەژارەکان یاخود بۆ خزمەتگوزارییە گشتیەکان کەلەپێناوی بەرژەوەندی هەژاراندا دروست کراون، ئەمەش دەبێتە هۆی دابەشبوونی سەرمایە لەوڵاتدا بەشێوەیەکی دادپەروەرانەو بەدیهێنانی دادپەروەری کۆمەڵایەتی لەدابەشکردندا.

لەپاڵ ئەوەدا باجە داراییەکان هۆکارێکی سروشتین بۆ رێگری لەکەڵەکەبوونی سامان لەکۆمەڵگادا، لەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزیشدا ئاماژە بۆ ئەمە کراوە: ﴿مَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ كَيْ لاَ يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الأَغْنِيَاءِ مِنْكُمْ...﴾[2].

---

[1] سورة البقرة: ١٩٥ .

[2] سورة الحشر : ٧ .

**کۆتی چوارەم:** –ئەرێنیە– وەرگرتنەوەی خاوەندارێتی لەپێناوی بەرژەوەندی گشتیدا: شەریعەتی ئیسلامی فەرمانرەوای سەرپشك کردووە کە دەستەلآتەکانی بەکاربێنێت لەپێناوی بەدیهێنانی بەرژەوەندی گشتی بەدەستخستنی سوودمەندی (مەنفەعە)و دوورخستنەوەی خراپە، نمونەی بەدەستخستنی سوودمەندی گشتی وەرگرتنەوەی خاوەندارێتی بەشێك لەو موڵکەی تاکەکان هەیانە ئەگەر لەرووی کۆمەڵایەتیەوە پێویستی کرد، وەك کردنەوە یاخود فراوانکردنی شەقامو بونیاتنان یان فراوانکردنی دامەزراوەیەکی گشتی.

ئەمەش بەپێی رێسا گشتیەکان لەشەریعەتی ئیسلامیدا ئەنجام دەدرێت، لەوانە: (یتحمل الضرر الخاص لدفع الضرر العام)، واتە: زیانی تایبەتی لەئەستۆ دەگیرێت لەپێناوی دوورخستنەوەی زیانی گشتی)، هەروەها رێسای: (الضرورات تبیح المحظورات)، واتە: پێویستەکان دەبنە رێپێدەری قەدەغەکراوەکان، لێرەدا وای دەبینم وشەی (تبیح) بگۆردرێت بۆ وشەی(تجیز)، چونکە (تبیح) لەگەڵ قەرەبوودا پێچەوانەیە (ینافي التعویض).

بەهەمان ئەو شێوەیەی کەپێغەمبەر (ﷺ)و خەلیفەکانی راشیدین ئەنجامیانداو زانایانی موسڵمان لەسەری کۆدەنگن: پێغەمبەر خاوەندارێکی تایبەتی زەویەکی وەرگرتەوە کەناوی (مرید)[1] بوو کردیە خزمەتگوزاری گشتی بۆ موسڵمانان تا دروشمە ئاینیەکانیانی تێدا ئەنجام بدەن لەلایەك، لەلایەکی دیکەوە بۆ ئەوەی پێغەمبەر لەو کاروبارانەی تایبەت یاخود گشتین لەگەڵ هاوەڵانیدا لەو شوێنەدا کۆببێتەوە، عومەری کوری خەتابیش خاوەندارێتی چەند خانوویەکی وەرگرتەوە کەدەکەوتنە دەوروبەری (مسجد الحرام) کەپێویستی گشتی وای دەخواست فراوان بکرێت، هەندێك لەو خاوەن ماڵانە نارازی بوون، ئەویش بەزۆر لێی وەرگرتنەوەو نرخەکەیانی خستە گەنجینەی کەعبەوە تا ئەو کاتەی خاوەن خانووەکان هاتن

---

[1] احمد جمال الدین، نزع الملكية في الاحكام الشرعية ونصوص القانون:ص: ۳۰ .

وەریان گرت، وەرگرتنەوەی خاوەندارێتی موڵك بۆ بەرژەوەندی گشتی لەسەردەمی هەموو خەلیفەکاندا دووبارە بۆتەوە[1]، وەرگرتنەوەی خاوەندارێتیش پێویستە بۆ بەرژەوەندی گشتی بێتو قەرەبوویەکی دادپەروەرانە هەبێت لەبەرانبەریدا، ئەوەی لەبرگە (ج)ی مادەی (١٦)ی دەستووری کاتی عێراقی ساڵی ١٩٧٠ هاتووە کە: خاوەندارێتی تایبەت وەرناگیرێتەوە بەپێی پێویستیەکانی بەرژەوەندی گشتی نەبێتو بەپێی قەرەبوویەکی دادپەروەرانە نەبێت بەپێی رێکارێك کەیاسا دیاری دەکات) ئەمە لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامیدا یەك دەگرێتەوە، لەدەستوری هەمیشەیی عێراقی ئیتیحادی ساڵی ٢٠٠٥ لەبرگەی دووەمی مادە (٢٣)دا هاتووە: ( وەرگرتنەوەی خاوەندارێتی تایبەت رێگە پێدراو نیە تەنها بۆ مەبەستی بەرژەوەندی گشتیو لەبەرانبەر قەرەبوویەکی دادپەروەرانەدا دەبێت، ئەمەش بەیاسا رێکدەخرێت)، ئەوەی لەمادە (١٠٥٠)ی یاسای مەدەنی عێراقیدا هاتووە: (رێگەپێدراو نیە هیچ کەس لەموڵکی خۆی بێبەش بکرێت تەنها لەو حاڵەتانەدا نەبێت کەیاسا بریاری لەسەر دەداتو بەو شێوەیەی بۆی داناوەو ئەوەش لەبەرانبەر قەرەبوویەکی دادپەروەرانەدا دەبێت کەلەپێشدا پێی دەدرێت).

**کۆتی پێنجەم**: –نەرێنیە– کۆتی ناچارکردنی ملکدار کەبەشێوەیەك ملکەکەی بەکار نەهێنێ کە زیان بە کەسانیتر لە دەرودراوسێ و کۆمەڵگا بگەیەنێ. لەسەری پێویستە رێگەنەدرێت موڵکەکەی بەو جۆرە بەکار بێنێت یاخود بەجۆرێك هەڵسوکەوتی تێدا بکات کەزیان بەتاك یاخود کۆمەڵگا بگەیەنێت، ئەم پەبەندیە نەرێنیە لەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) وەرگیراوە: (لاضرر ولا ضرار))[2].

---

[1] الشيخ علي الخفيف، الملكية في الشريعة الإسلامية، ص: ١٠٤ .

[2] أخرجه الامام احمد واصحاب السنن، والحاكم في مستدركه، وقال عنه: صحيح الإسناد على شرط مسلم ولم يخرجاه، ووافقه الذهبي.

**کۆتی شەشەم:** -نەرێنیە- کۆتکردنی ئازادی خاوەن موڵك کەناچار بگرێت سامانەکەی لەرێگەی سوو (ربا)وە یاخود گزیو قۆرغکاریو رێگای نەشیاوی ترەوە گەشە پێنەدات، واتە پێویستە رێگری لێ بکرێت لەوەی سامانەکەی لەمامەڵەیەکدا بەکاربێنێت کەئەو تاوانانە یاخود تاوانی دیکەی باو لەئێستای سەردەمی شارستانیەتی مادیدا بەکارهاتوو کەدەبنە هۆی گەشەی دارایی تێدا ئەنجام درابێت، لەنمونەی بەکارهێنانە قەدەغەکراوەکانی سامانو مامەڵەی سووو قۆرغکاریو گزی تیا کراو:

أ. **سوو لەگەشەی ئابووریدا:** لەسەردەمی نەفامیدا سوو لەقەرزەکانی بەکارهێنانانو بەرهەمێناندا بڵاو بوو، گرنگترین پێکهێنەری ئابووری سەردەمی نەفامی بوو، وەك ئەوەی ئێستاش لەئابووری هاوچەرخدا هەیە، ئیسلام بەچەند قۆناغێك کۆتایی پێهێنا.

ب. **حەرامکردنی گزی (غەش):** لەو کۆتانەی کەئیسلام سەپاندنی رێگری لە مرۆڤ کرد لەبەکارهێنانی گزی لەمامەڵەدا، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((من غشنا فليس منا)) [1] ، واتە: ئەوەی گزی بکات لەئێمە نیە، مرۆڤ بۆی هەیە بکڕێتو بفرۆشێت بەڵام نابێت لەکاڵاو مامەڵەکەیدا گزی بکات، ئەگەر خراپیەك هەبوو دەبێت بیخاتە روو ئەگەرنا مامەڵەکەی گزی تێدایەو قازانجەکەی حەرامە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((البيعان بالخيار مالم يتفرقا فان صدقا وبينا [2] بورك لهما في بيعهما وان كذبا وكتما محقت بركة بيعهما)) [3] ، واتە: کڕینو فرۆشتن بەسەرپشکێتیە ئەگەر جیا نەبووبنەوە، ئەگەر لەگەڵ یەك راستیان

---

[1] پێغەمبەرﷺ بەلای کۆمەڵە خواردنێکدا تێپەڕی، دەستی خستە ناوی دەستی تەڕ بوو. گوتی: ئەمە چییە؟ خاوەنی خواردن گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا باران لێی داوە! ئەویش گوتی: ئەی نەدەکرا بیخەیتە سەرەوە تا خەڵك ببینن؟! هەر کەس گزی بکا لە من نیە. بڕوانە: سبل السلام: ٣/٣٧.

[2] واتە لەهەریەکەیاندا ئەوەی پێویستە لەخراپیو نەنگی کەتێیدا بێت روونی بکەرەوە.

[3] صحيح مسلم: ٣\١١٦٤.

كردو روونيان كردەوە ئەوا بەرەكەت دەچێتە مامەڵەكەيان، ئەگەر درۆيان كردو شاردیانەوە ئەوا بەرکەتی مامەڵەکەیان نامێنێت.

ج. **حەرامكردنی قۆرغكاری:** قۆرغكاری لەرووی زمانەوانیەوە واتە: گلدانەوەی شتو چاوەروانكردنی گرانبوونی، لەرووی شەرعیشەوە واتە كڕینی خۆراك یاخود هەر كاڵایەكی دیكە كەگەل پێویستی پێی بێتو هەڵگرتنی بۆ كاتی گرانی، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((الجالب مرزوق والمحتكر ملعون))[1] واتە: شتهێنەر رۆزی دراوەو قۆرغكار نەفرین لێكراوە، هەروەها دەفەرمووێت: (لا يحتكر إلا الخاطئ)[2]، واتە: تەنها بەهەڵەدا چوو قۆرغكاری دەكات، دەقی دیكە زۆرە كەلەبارەی حەرامكردنی قۆرغكاریەوە هاتوون.

**كۆتی حەوتەم:** —نەرێنیە— كۆتكردنی ئازادی خاوەن موڵكی دارایی بەوازهێنان لەدەستبلاوی‌و چروكی، هەریەك لەم دووانە دژی بەرژەوەندی كۆمەڵگایە، چروكی‌وكۆكردنەوەی نەختینەی كانزاو كاغەز وادەكات مامەڵەی دراوو پێویست بۆ بوژانەوەی ژیانی ئابووری لەهەر كۆمەڵگایەكدا پێ نەكرێت، چونكە گلدانەوەی سامان راگرتنی ئەركەكەیەتی لەفراوانكردنی مەیدانەكانی بەرهەمهێنان‌و ئامادەسازی هۆكارەكانی كاركردن بۆ كرێكاران، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿...وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾[3]، مەبەست لەزێرو زیو لێرەدا هەموو دراوێكی كانزایی یاخود كاغەزییە سەرەڕای هەڵگرتنی زێرو زیو لەسەرشێوەی دیكەی جیاواز لەدراو.

---

[1] صحيح مسلم: ٣\١٢٢٨(برقم ١٦٠٥).

[2] رواه مسلم، سبل السلام: ٣\٣٢.

[3] سورة التوبة : ٣٤ .

هەروەها چروکی یەکناگرێتەوە لەگەڵ ڕێنوێنیەکانی ئیسلامدا کەداوا دەکات مرۆڤ بەشی خۆی لەدونیا ببات و بەشێوەیەکی شیاو چێژ لەباشیەکان وەربگرێت، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿..وَلاَ تَنسَ نَصِيبَكَ مِنْ الدُّنْيَا﴾[1].

بەهەمان شێوە دەستبڵاوی و ئیسراف لەژیاندا دەبێتە هۆی دروستبوونی ڕق و کینە لەناو ئەو چینانەی کەنەدارن و ئەو مەترسیە سەرهەڵدەدات کەئاگادارکردنەوەیە بۆ تیاچوونی، لەبەر ئەوە دروستە بۆ فەرمانڕەوا ڕێگە نەدات بەبەکارهێنانی دەستبڵاوانەی ئەو دەستبڵاوانە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلاَ تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ أَمْوَالَكُمْ الَّتِي جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ قِيَامًا...﴾[2]، ئیسلام ڕێگایەکی مامناوەندی لەنێوان ئەو دوو ڕێگا دژ بەیەکەدا بۆ هەڵسوکەوتی ئابووری مرۆڤ داناوە.

ئەم مامناوەندێتیە (میانرەوی لەئابووریدا) لەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزدا تۆمار کراوە کەدەفەرمووێت: ﴿وَلاَ تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَى عُنُقِكَ وَلاَ تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَحْسُورًا﴾[3].

دەقەکانی شەریعەتی ئیسلام دەستبڵاوی بەهۆکاری خراپە بۆ خاوەنەکەی و ئەو کۆمەڵگایەش کەتێیدا دەژی داناوە، وادەکات خاوەنەکەی سەرپێچی خوا ئەنجام بدات و شکۆی نەمێنێت و هێزی لاواز بێت، پاشان ئەو تیاچوون و سزایە تەنها تاکەکە ناگرێتەوە، بەڵکو ئەو کۆمەڵگایەش دەگرێتەوە کەڕێگەیداوە ئەو جۆرە کەسانە لەناویدا بژی، هەروەك قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێ کردووە: ﴿وَإِذَا أَرَدْنَا أَنْ نُهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُوا فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيرًا﴾[4]، ویست لێرەدا بەمانای ناچارکردن (جبر) نایەت، بەڵکو مەبەست

---

[1] سورة القصص : ٧٧ .
[2] سورة النساء: ٥ .
[3] سورة الاسراء : ٢٩ .
[4] سورة الاسراء : ١٦ .

بەستنەوەی ئەنجامەکانە بەهۆکارەکانیەوە، واتە ئەگەر هۆکارەکانی لەبوونی دەستبلاّواندا هاتەدی لەولاّتداو کۆمەلّگا بێدەنگ بووە لێیان، ئەوا بەدلّنیاییەوە بەپێی سوونەتی خوا لەدروستکراوەکانیدا دەبێتە هۆی تیاچوونو لەناوبردن، سوونەتی خوداش بێگومان ناگۆڕدرێت، واتە بەستنەوەی ئەنجام بەهۆکارەکانەوەو دروستکردنی ئەنجام پاش تەواوبوونی پێشەکیەکانی.

**کۆتی هەشتەم:** -نەرێنیە- کۆتکردنی ئازادی خاوەن موڵك بەوەی سامانەکەی بۆ بەرژەوەندی دەستەڵاتێکی سیاسی لەبەرێوەچوونی کاروباری دەوڵەتدا بەکارنەیەنێت بەمەبەستی ئاراستەکردنی بەوشێوەیەی خزمەتی بەرژەوەندییە داراییەکانی خۆی بکاتو دەزگاکانی حکومەت بۆ تێرکردنی ئارەزووە خراپەکانیو بەدەستهێنانی زیاتر لەسەر حسابی چینەکانی تری کۆمەڵگا بەکار بێنێت، قورئانی پیرۆز جەختی لەم حوکمە کردووەو دەفەرموێت: ﴿وَلاَ تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ وَتُدْلُوا بِهَا إِلَى الْحُكَّامِ لِتَأْكُلُوا فَرِيقًا مِنْ أَمْوَالِ النَّاسِ بِالآثْمِ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ﴾[1].

پێدانی پارە بەدەستەڵاتداران کەلێرەدا رێگری لێکراوە بەشێوە دەربڕینی گشتی بەرتیلدان بەو دەزگایانەش دەگرێتەوە کەپشتگیری کردنیان هۆکارێك بێت بۆ بەدەستهێنانی دەستەڵات.

**کۆتی نۆیەم:** -ئەمیش نەرێنیە- کۆتکردنی ئازادی موڵکدار بەدەرنەچوون لەفەرزەکانی میراتو راسپاردن (وەسیەت)، دروست نیە بۆ مرۆڤ ئەو کاتەی لەژیاندایە میراتیەکەی بدات بەهەندێك لەمیراتگرەکانیو ئەوانی تری لێ بێبەش بکات، ئەگەر ئەو کارەی ئەنجامدا ئەوا پوچەڵ دەبێت کارەکەیو پاش مردنی جێبەجێ ناکرێت، ئەمەش پێچەوانەی هەندێك لەیاساکانە، لەوانە یاسای

---

[1] سورة البقرة : ١٨٨ .

یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو[1]، بەهەمان شێوە بۆی نیە راسپاردن بەزیاتر لەسێ یەکی میراتیەکەیەوە بکات، ئەگەر کردی ئەوا جێبەجێ کردنی ئەوەی لەسێ یەکەکە زیاترە لەسەر رازی بوونی میراتگرەکانی رادەوەستێت، ئەمەش بۆ دوورخستنەوەی زۆرلێکرانی رووگیرانەیە ئەو کاتەی کەلەژیاندایە، بەهەمان شێوە بۆی نیە راسپاردن بۆ لایەنێکی ناڕەوا بکات.

ئەمە گرنگترین ئەو کۆتانەیە کەخراوەتە سەر مافی خاوەنداریێتی تایبەت، لەپاڵ ئەمەدا ئەو مافە کۆتی دیکەشی دەکەوێتە سەر، وەك رێگری لەکێبرکێی ناڕەوا لەکاری بازرگانیداو، حەرامکردنی دروستکردنی خانوو بەجۆرێك کەزیانی مادی یان ئەدەبی بەدراوسێکانی بگەیەنێت لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی ئەو رێنوێنیە رەوشتیە ئیسلامیانەی دیکە کەخراوەتە سەر خاوەنداریێتی تاك.

پوختەی قسە: خاوەنداریێتی رەها لەشەریعەتی ئیسلامیدا بوونی نیەو یەکناگرێتەوە لەگەڵ رۆح و رێساو ئامانجەکانیدا، لەبەر ئەوە هیچ جێگایەك نیە بۆ خۆویستی (ئەنانیەت)ی تاك کەبەزۆری لەپشت بەکارهێنانی مافیەوەتی لەموڵکداریەکەیدا، هەموو مرۆڤێکیش مافی ئازادی خاوەنداریێتی هەیە، بەڵام ئەو ئازادیە لەپێناوی رەچاوکردنی مافەکانی کەسانی تر بەستراوەتەوە بەکۆت و مەرجەوە.

---

[1] بڕوانە: مادە (٥٣٤)ی یاسای مەدەنی کۆماری روسیای ئیتیحادی سۆشیالیستی سۆڤیەتی پێشوو کە بەمجۆرەیە: دروستە بۆ هەر هاوڵاتیەك کەهەموو ماڵەکەی یاخود بەشێکی بکات بەراسپاردن (وەسیەت) لەنێویاندا راخەرو پێویستیە ئاساییەکانی ماڵ بۆ کەسێك یا زیاتر، ئیدی ئەو کەسە بەپێی یاسا لەنێو میراتگرەکانیدا بێت یا تێیاندا نەبێت، بەهەمان شێوە بۆ دەوڵەت یا هەندێك دەستەی هاریکاری یا دامەزراوەی کۆمەڵایەتی، دروستە بۆ راسپاردەکار کەمیراتگرێك یا زیاتر لەمیراتیەکەی بێبەش بکات لەسەر بنەمای یاسا یا هەموویان بێبەش بکات.

# دەروازەی دووەم:
# مافی کارکردن لەقورئان و فەرموودەدا

## ( حق العمل في القرآن والسنة النبوية )

گرنگیدانی نێودەوڵەتی بەرێکخستنی کارو کاروباری کرێکاران لەپاش جەنگی جیهانی یەکەمەوە دەستی پێکرد، یەکەمین دامەزراوەی کرێکارانیش لەسایەی یاسادا ساڵی ١٩٢١ز دامەزرا[١].

لەکاتێکدا ئیسلام لەپێش زیاتر لەچوارده سەدەوە گرنگی بەکار داوەو گەیشتۆتە پلەیەك پەیوەستی کردووە بەئیمانەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالْعَصْرِ، إِنَّ الإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ، إِلاَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾[٢]، قورئانی پیرۆز لە (٣٥٦) ئایەتدا گرنگی بەکار داوە، لەو ئایەتانە: ﴿وَقُلْ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ...﴾[٣]، ئەمەش لەبەر ئەوەیە ئیسلام دەستوورو سیستەمو بیروباوەڕو شەریعەتێکە داوا لەمرۆڤ دەکات لەیەك کاتدا دوو کاری پەیوەست بەیەکی تەواوکاری یەك بکات، کەئەمیان ئەویتریات تەواو بکات، کاری دونیایی (مامەڵەکان)و کاری قیامەتی (پەرستشەکان).

---

[١] ابو هيف في القانون الدولي العام بند (١٥٥).

[٢] سورة العصر:

[٣] سورة التوبة: ١٠٥ .

## مافی کارکردن (حق العمل):

کارکردن مافێکی بڕیار لەسەر دراوە لەئیسلامدا بۆ هەموو مرۆڤێك کەتوانای ئەنجامدانی هەبێتو بەجۆرێك بێت لەگەڵ تواناو لێهاتوویی و رەوشیدا بگونجێت، هیچ کۆتێك لەسەر ئەم مافە نیە کەبڵێت لەبەر ئەوەی سەر بەچینێکی دیاریکراو یا خاوەن پلەیەکی دیاریکراو نیە بۆی نیە ئەو کارە بکات، بەڵکو بناغەی ئەو مافە بریتیە لەلێهاتوویی و توانا، بەوەش ئیسلام بنەمای هێنانەدی یەکسانی دەرفەتی کاری بۆ هەمووان دەستەبەر کردووە.

#### فەلسەفەی کارکردن لەئیسلامدا (حكمة العمل في القرآن):

کارکردن لەراستی و واقیعدا ماف نیە، بەڵکوئەرکە لەسەر هەموو کەسێك کەتوانای هەبێت، بەم بەڵگانە:

١. قورئانی پیرۆز: قورئان بەشێوەی پێویستو پابەندکار لەچەندین دەقدا فەرمان بەکارکردن دەکات، لەوانە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمْ الأَرْضَ ذَلُولاً فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ...﴾[1]، لەئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿فَإِذَا قُضِيَتْ الصَّلاَةُ فَانتَشِرُوا فِي الأَرْضِ وَابْتَغُوا مِنْ فَضْلِ اللَّهِ...﴾[2].

٢. هەستان بەجێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوای گەورە لەسەر توانای جەستەیی و عەقڵی راوەستاوە، ئەو دووانەش لەسەر ئەو شێوە ژیانە راوەستاوە کە ئەو بەدەستی هێناوە، هەر شتێك پێویست (واجب)ی لەسەر بوەستێت ئەوا خۆیشی پێویست (واجب)ە، کەواتە کاسپی حەڵاڵ پێویست (واجب)ە.

---

[1] سورة تبارك : ١٥ .

[2] سورة الجمعة : ١٠ .

٣. بژێویدانی ماڵو هاوسەر لەسەر ئەو کەسەی بەرپرسە لێیان پێویستە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿...وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ...﴾[1]، لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِنْ سَعَتِهِ وَمَنْ قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ فَلْيُنفِقْ مِمَّا آتَاهُ اللَّهُ لاَ يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَّ مَا آتَاهَا سَيَجْعَلُ اللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا﴾[2]، کەواتە کارکردن بۆ دابینکردنی ئەو بژێویش پێویست (واجب)ە.

**پێگەی کارکردن لەفەرموودەکانی پێغەمبەردا (مكانة العمل في السنة النبوية):**

کارکردن لەئیسلامدا شکۆو رێزە بەپێی ئەو پیاهەڵدانو هاندانانەی لەچەندین فەرموودەی پێغەمبەری خوادا (ﷺ)هاتووە، لەنمونەیان: (ما اكل احدكم طعاما قط خيراً من عمل يده)[3]، واتە: هیچ کەس لەئێوە خواردنێکی هەرگیز نەخواردووە باشتر بێت لەوەی بەرهەمی دەستی خۆیەتی، هەروەها دەفەرموێت: (ان الله يحب العبد المؤمن المحترف)[4]، واتە: خوای گەورە مرۆڤی بڕواداری خاوەنکاری خۆش دەوێت، لەفەرموودەیەکی تردا هاتووە: (من امسى آكلا من عمل يده امسى مغفوراً له)[5]، واتە: هەرکەسێك شەوی بەسەردا هاتوو بەرهەمی دەستی خۆی خوارد، ئەوا بەلێخۆشبوونەوە شەوی بەسەردا هاتووە، لەفەرموودەیەکیشدا هاتووە: (طلب الحلال فريضة بعد الفريضة)[6]، واتە: داواکردنی رۆزی حەڵاڵ فەرزە پاش فەرز (واتە پاش ئیمانو نوێژ).

---

[1] سورة البقرة : ٢٣٣ .
[2] سورة الطلاق : ٧ .
[3] الصنعاني: سبل السلام : ٢\٧ .
[4] المناوي : فيض القدير ، شرح الجامع الصغير للسيوطي: ٢٩٠\٣ .
[5] سەرچاوەی پێشوو: ٨٨\٦.
[6] سەرچاوەی پێشوو: ٢٧٠\٤ .

مافی کارکردنی ئافرەت لەقورئاندا (حق المرأة في مزاولة العمل في القرآن):

قورئانی پیرۆز لەکارکردن‌و کرێی کارو هاندان لەسەر کارکردن جیاوازی نەکردووە لەنێوان نێرو مێدا، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿...أَنِّي لاَ أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِنْكُمْ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى...﴾[1]، لەئایەتێکی تردا دەفەرموویت: ﴿...لِلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِمَّا اكْتَسَبُوا وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ مِمَّا اكْتَسَبْنَ...﴾[2]، (عائیشە خوا لێی رازی بێت) دەڵێت: (المغزل في يد المرأة احسن من الرمح بيد المجاهدين في سبيل الله)[3]، واتە: قولاپی چنین بەدەستی ئافرەتەوە باشترە لەرمی دەستی موجاهید لەرێی خوادا .

ئافرەت مافی هەڵبژاردنی هەموو کارێکی هەیە کەدژ نەبێت لەگەڵ پێگەی وەك دایك لەکۆمەڵگادا، زانایانی موسڵمانیش بەپشت بەستن بەدەقەکانی قورئان‌و فەرموودە لەسەر ئەمە هاودەنگن.

کرێی کرێکار لەقورئان و فەرموودەدا (أجر العامل في القرآن والسنة النبوية):

بۆ هەموو کارێك پێویستە کرێیەك هەبێت بەپێی رێسا گشتیەکانی قورئان‌و فەرموودە هاوتای بێت، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿...وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُمْ بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾[4]، وقوله تعالى: ﴿...وَلِكُلٍّ دَرَجَاتٌ مِمَّا عَمِلُوا وَلِيُوَفِّيَهُمْ أَعْمَالَهُمْ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ﴾[5]، لەئایەتێکی تردا دەفەرموویت: ﴿وَلاَ تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ﴾[6]، پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموویت: (اعطوا الاجير حقه قبل ان يجف عرقه)[7]، واتە: کرێی کرێکار بدەن پێش ئەوەی ئارقەکەی وشك ببێتەوە.

---

[1] سورة ال عمران : ١٩٥

[2] سورة النساء : ٣٢ .

[3] لبن عبد ربه، العقد الفريد: ٢\٤٦٨ .

[4] سورة النحل : ٩٧ .

[5] سورة الاحقاف: ١٩.

[6] سورة الاعراف: ٨٥.

[7] النسائي، السنن، كتاب(٣٥) باب(٤٤).

شایانی باسە کەئەمەکداری (وەفا) پێدانی کرێی کرێکار بەئەمەکداری بەرانبەر گرێبەست دادەنرێت کەلەفەرمایشتی خوای گەورەدا فەرمانی پێکراوە: ﴿وَلاَ تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ...﴾[1]، هەروەها بەگێرانەوەی سپاردە (ئەمانەت) بۆ خاوەنەکانیان لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا...﴾[2].

**دیاریکردنی کرێ:**

پێویستە کرێی کرێکار پێششتر دیاری بکرێت لەبەر ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) کەدەفەرموێت: (من استأجر اجيراً فليسم اجرته)[3]، واتە: هەرکەس کرێکارێکی بەکرێ گرت با کرێیەکەی دیاری بکات، پێوەری ئەم دیاری کردنەش لەئیسلامدا فەرموودەی پێغەمبەرە (ﷺ) کەدەفەرموێت (لاضرر ولا ضرار)، پێویستە دیاریکردنەکە لەلایەن لایەکیانەوە کرێکارو خاوەنکار زیانی نەبێت بۆ لایەکەی تر.

**نەریت و کار (العرف والعمل):**

نەریتی دروستی باو بەبۆچوونی زانایانی موسڵمان بۆ ئەم کاروبارانە سەرچاوەیە:

١. دیاریکردنی کاتەکانی کارکردن [4].
٢. دیاریکردنی سروشتی کاری کرێکار لەماڵدا.
٣. دیاریکردنی پێودانگەکانی بەرهەم [5].
٤. هەستان بەتەواکاریەکانی کار (توابع العمل)، ئەنجامنەدانی ئەگەرهاتوو نەکرابووە مەرج لەگرێبەستەکەدا.

---

[1] سورة المائدة: ١

[2] سورة النساء: ٥٨.

[3] بروانە: الشوكاني، نيل الاوطار: ٥\٢٩٣.

[4] الفتاوى البزازية على هامش الحضرية: ٥\١٢٦.

[5] قاضيجان، الفتاوى التتار خانية على هامش الفتاوى: ٥\٣٤٣.

٥. دیاریکردنی لایەنی بەرپرس لەئامرازەکانی کار لەلایەن خاوەنکار یا کرێکارەوە [1].

٦. دیاریکردنی رادەی گرەنتی کرێکار لەو کارەی دەیکات [2].

٧. بریاردان لەرادەی مافی کرێکار لەسەر دابینکردنی خواردنی لەلایەن خاوەن کارەوە.

**قەلاچۆکردنی بێکاری لەفەرموودەکانی پێغەمبەردا (مكافحة البطالة في السنة النبوية):**

ئیسلام —هەروەك باسمان کرد— کاری بەماف‌و ئەرك‌و رێز بۆ هەرکەس داناوە کەتوانای هەبێت، لەبەر ئەوە لەسەر دەوڵەت پێویستە کاری رێزدارانە بۆ هەموو مرۆڤێك کەلەسایەی دەستەڵاتیدا دەژی لەسنووری توانایدا دابین بکات.

ئەنەسی کوری مالیك (خوا لێی رازی بێت) دەڵێت: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)و سکاڵای لەدەست نەبوونی کرد، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لە ماڵێکەوە هاتووم وایدەبینم کەدەگەرێمەوە بۆ لایان هەندێکیان مردوون (مەبەستی ئەوەبوو لەبرسا مردوون)، فەرمووی: برۆ بزانم شتێك دەدۆزیتەوە؟ رۆشت‌و پارچەیەکی هێنا (کورتانی پشتی حوشتر یاخود پارچە قوماشێکی سادە) لەگەڵ جامێك، وتی: ئەی پێغەمبەری خوائەم قوماشە پارچەیەکیان رادەخست‌و ئەویتریان لەبەردەکرد، ئەم جامەش ئاویان تێدا دەخواردەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: کێ بەدرهەمێك لێی دەکرێت؟ پیاوێکی وتی: من دەیکرم ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: کێ لەدرهەمێك زیاتری پێدەدات؟ پیاوێك وتی: من بەدوو درهەم دەمەوێت، فەرمووی فەرموو بیبە، دەڵێت، پیاوەکەی بانگکرد، پێی فەرموو: بەدرهەمێکیان پاچێك بکرەو بەدرهەمەکەی تر خواردن بۆ خێزانەکەت بکرە، دەڵێت پیاوەکەش

---

[1] سەرچاوەی پێشوو: ٤\٤٥٦.

[2] قاضيجان، المرجع السابق: ٢\٣٢٥.

وایکرد، پاشان گەڕایەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: بڕۆ بۆ ئەو دۆڵە هیچ پـوش‌و درك‌و داری تیـا مەهێڵـەو دوای پـازدە ڕۆژ بگـەڕێرەوە بـۆ لام، پیاوەکـەش ڕۆشت‌و دە درهەمی پەیدا کرد، پاشان هاتەوە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) ئـەو هەواڵـەی پێ ڕاگەیاند، پێی فەرموو: بـڕۆ، بـەپێنج درهـەمیان خـۆراك‌و بەپێنجەکـەی تـر جـل‌و بەرگ بۆ خاوخێزانت بکـرە، وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا بەڕاسـتی خـوا بەرەکـەتی خستە ئەو کارەی فـەرمانت پـێ بکـردم جێبـەجێی بکـەم، فـەرمووی: ئەمـە باشـترە لەوەی ڕۆژی قیامەت بێیت‌و پەڵەی سواڵکردن بەناوچەوانتەوە بێت، سواڵکردن تـەنها بۆ ئەمانە دروستە: کەسێك داوای خوێنبایی بەدەر لەتوانای لێکراوە، یاخود قـەرزێکی زۆری لەسـەر بێـت، یـاخود هەژارییـەکی زۆر زۆر[1]، لەگێڕانەوەیـەکی تـردا وا هـاتوە کەپێغەمبەر داوای دەمە پاچێك‌و دارێکی کردو دارەکەی کردە دەمە پاچەکەوە[2].

**دەرئەنجام:** دەتوانین لـەناوەڕۆکی ئـەم ڕووداوە سـادەو گرنگـە چـەندین بنـەمای کاری پەیوەندار بەنەهێشتنی بێکاری دەربهێنین بەمجۆرە:

١. کەسـی بێکـار سـکاڵا بـۆ بـەرپرس (نوێنـەری حکومـەت) بـەرز دەکاتـەوە بەمەبەستی چارەسەری کێشەکەی.
٢. دەستبەجێ لەگەڵ گەیشتنی سکاڵاکەی پێویستە لێـی بکۆڵنـەوەو کـاری بـۆ پەیدا بکرێت.
٣. دەوڵەت بەکرداری لەپەیداکردنی کاردا بەشداری بکات.
٤. دەوڵەت کاریکات بۆ سوودوەرگرتن لەتوانای کرێکاری بێکار تا ئەوپەری توانا.
٥. دەوڵەت هۆکارەکانی کارکردن بدات بەکرێکار.
٦. دەوڵەت کارو شوێنی گونجاوی کار دیاری بکات‌و پلانی بۆ دابنێت.

---

[1] بروانە: محمد بن حسن الشيباني ، الرزق المستطاب، هامش، ص٢٢ ، وحديث "ان المسألة...." رواه احمد في مسنده عن لنس، ورواه لبو داود والترمذي والنسائي وابن ماجة، بروانە: فيض القدير: ٢\٣٩ .

[2] بروانە: لبيب السعيد، دراسة اسلامية في العمل والعمال، العدد(٢٤٠). ص: ٩٥–٩٨ .

٧. دەوڵـەت چـاودێری جێبـەجێکردنی ئـەو پلانـە لـەکاتێکی گونجـاودا بکـاتو هەڵیبسەنگێنێت.

٨. دەوڵەت لەبەر ڕۆشنایی ئەوەی بەدەست هـاتووە بودجـە بـۆ کرێکـار دابنێـت کەبتوانێت بەبێ کەمو کورتیو دەستبڵاوی پێداویستیەکانی پێ دابین بکات.

٩. دەوڵەت دیاردەی سواڵکردن بەتەواوەتی قەدەغە بکات [١].

لەکۆکردنەوەی داردا کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێکرد هەموو کارێك دەگرێتـەوە کەژینگەکە ڕێی پێ بداتو کرێکارەکە توانـای ئەنجامـدانی هـەبێت، لەسەرچـاوەکانی نەهێشتنی بێکاری زەکات کەئەمیش گرنگی هەیـە لەنەهێشـتنی هـەژاریو بێکاریـدا، پێویستە هێندە زەکات بەهـەژار بـدرێت کەبەشـی ئـەوە بکـات ببێتـە دسـتمایە بـۆی بیخاتە کار.

**نەهێشتنی سواڵ و تەمبەڵی (مكافحة التسول والكسل):**

قورئـانی پـیرۆزو فـەرموودەی پێغەمبـەر جـەخت لەسـەر ئـەوە دەکەنـەوە کەپێویستە هەموو مرۆڤێك لەبەرهەمی کاری خۆی بخوات ئەگەرنا ئـەوا بـارە بەسـەر کەسانی ترەوە، خوای گەورە دەفـەرموێت: ﴿وَأَنْ لَيْسَ لِلإِنسَانِ إِلاَّ مَا سَعَى﴾[٢]، هەروا دەفەرموێت: ﴿...فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ...﴾[٣].

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (أشد الناس عذابا يوم القيامة المكفي الفارغ)[٤] واتە: (ئەو کەسەی لەڕۆژی قیامەتدا لەهەمووکەس سزاکەی توندترە کەسێکە بڕی پێویست هەبووی بەتاڵە)، مەبەستی ئەو کەسەیە کەخەڵکی تر پێویستیەکانی ژیانی بـۆ دابـین دەکەن، مەبەست لەوشەی بەتاڵ (فارغ): کەسی بێکارە کەپاڵی لێداوەتـەوەو حـەزی

---

[١] بڕوانە: دراسة اسلامية في العمل والعمال، سەرچاوەی پێشوو.

[٢] سورة النجم: ٣٩ .

[٣] سورة الملك : ١٥ .

[٤] الفردوس بمأثور الخطاب: ١\٣٦١ (برقم١٤٥٩)

لەبێکاری وتەمبەڵیە، پێغەمبەر (ﷺ) لەئەنجامەکانی بێکاری ئاگادارمان دەکاتەوەو دەفەرموێت: (اذا قصَّرَ العبد في العمل ابتلاه الله بالهم)[1]، واتە: هەرکەس کەمتەرخەمی بکات لەکارکردندا خوای گەورە تووشی خەم و خەفەتی دەکات، هەروەها دەفەرموێت: (ان اخشى ما خشيت على امتي كبر البطن ومداومة النوم والكسل)[2]، واتە: ئەوەی لەئومەتەکەمدا زیاتر لێی دەترسم گەورەبوونی ورگو زۆرخەوتن و تەمبەڵییە.

**کرێکار بەرپرسە لەچاک ئەنجامدانی کارەکەی (العامل مسؤول عن اتقان عمله):**

قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەر بڕیاریان لەسەر بەرپرسیارێتی کرێکار لەو کارەی ئەنجامی دەدات داوەو لەمبارەیەوە چەندین دەق هەیە، لەوانە ئەم ئایەتەی کەخوای گەورە دەفەرموێت: ﴿...وَلَتُسْأَلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾[3]، پێغەمبەریش (ﷺ) لەفەرموودەکانیدا جەختی لەسەر ئەم بەرپرسیارێتیە کردۆتەوەو دەفەرموێت: (إن الله يحب اذا عمل احدكم عملاً ان يتقنه)[4]، واتە: خوای گەورە پێی خۆشە کاتێ یەکێك لەئێوە کارێك ئەنجام دەدات بەچاکترین شێوە ئەنجامی بدات.

**کرێ مافەو هیچ منەتێکی تێدا نیە (الأجر حق لا منة فيه):**

قورئانی پیرۆز ئەمەی لەچەندین ئایەتدا راگەیاندووەو دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ﴾[5]، لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ لَكَ لَأَجْرًا غَيْرَ مَمْنُونٍ﴾[6].

---

[1] فيض القدير: ١\٤١٧.
[2] سەرچاوەی پێشوو: ١\٢١٥.
[3] سورة النحل: ٩٣ .
[4] مجمع الزوائد، باب نصح الاجير واتقان العمل : ٤\٩٨ .
[5] سورة فصلت : ٨ .
[6] سورة القلم: ٣

**دەوڵەت بەرپرسیارە لەپاراستنی مافی کرێکار (الدولة مسؤولة عن حماية حق العامل):**

ئەمەش لەبەر ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿...أَنِّي لاَ أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِنْكُمْ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى...﴾[1]، ئەوەشی لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) جەختی لەم حوکمە کردۆتەوە ئەم فەرموودەیەیە: (اعطوا الاجير اجره قبل ان يجف عرقه)[2] واتە: کرێی کرێکار بدەن پێش وشکبوونەوەی ئارەقەکەی.

**کار بەپێی توانایە (العمل على قدر الطاقة):**

لەئیسلامدا دروست نیە کەکارێك لەسەروی توانای کرێکارەوە بێت پێی ئەنجام بدرێت، قورئانی پیرۆزیش بریاری لەسەر ئەمە داوەو دەفەرمووێت: ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَ وُسْعَهَا...﴾[3] پێغەمبەرش (ﷺ) جەختی لەمە کردۆتەوەو فەرموویەتی: (لا تكلفوهم ما لا يطيقون) واتە: کارێکیان پێ مەسپێرن کەلەتواناياندا نەبێت.

**لایەنی مرۆیی پەیوەندییە کرێکاریەکان لەئیسلامیدا (الجانب الانساني في العلاقات العمالية في الإسلام):**

یاسا بگرە دەستوورە هاوچەرخەکان ئازادی کاریان بۆ هەموو تاکێك زامن کردووە، پێشتر کرێکاران بەهۆی سیستەمی چینایەتیو کۆیلەو جیاوازی ئاینەوە ناڕەحەتیو ستەمی زۆریان بینی، بەمجۆرە:

أ. سیستەمی چینایەتی لەرووی کرێکارانەوە وای دەخواست کەپیشەکان میراتین، قەدەغە بوو بۆ تاك جگە لەپیشەکەی باوکی پیشەیەکی تر هەڵبژێرێت، ئیسلام هەر لەسەرەتای هاتنیەوە ئەو دیاردەیەی رەت کردەووە، رایگەیاند مرۆڤەکان وەك ددانەکانی شانە یەکسانن، جەختی لەبرایەتی مرۆڤایەتی کردەوە،

---

[1] سورة ال عمران : ١٩٥ .

[2] سنن البيهقي الكبرى : ٦\١٢٠(برقم ١١٤٣٤) . وسنن ابن ماجه : ٢\٨١٧ (برقم ٢٤٤٣) .

[3] سورة البقرة: ٢٨٦ .

جیاوازی چینایەتی تێکشکاندو، ئەوەی ڕاگەیاند کەهەموو خەڵکی یەکێتیەکی کۆمەڵایەتین‌و مرۆڤەکان بەشەکان پێکەوە دەبەستنەوەو هەموویان لەیەك بنەرەتەوەن.

ب. سیستەمی کۆیلایەتی –بەپێی ئەم سیستەمە کەلە سەدەکانی ناوەڕاستدا لەئەورووپاو شوێنەکانی تردا بڵاوبووبووەوە– خاوەن موڵکەکان شوێنکەوتەکانیان کە کۆیلەکان بوون لەزەویەکانیان بێ بەش کردبوو، لەکاتێکدا ئیسلام دیاردەی کۆیلایەتی‌و جیاوازی نەهێشتبوو وبنەمای یەکسانی لەم ئایەتەدا ڕاگەیاندبوو: ﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ...﴾[1]، پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێت: (خير الناس انفعهم للناس)[2]، واتە: باشترین مرۆڤ ئەو کەسەیە زیاتر سوودی بۆ خەڵکی هەبێت.

ج. سیستەمی تایفەگەری (نظام الطوائف): کرێکاران ڕووبەڕووی ستەم‌و زوڵم دەبوونەوە کاتێ ئاینیان یاخود مەزهەبیان لەگەڵ ئاین یاخود مەزهەبی فەرمانڕەوادا جیاواز بووایە، ئیسلام بەتوندی ئەوەی ڕەت کردەوەو بڕیاری لەسەر ئازادی هەڵبژاردنی کار لەسەر بنەمای تواناو لێهاتوویی‌و شارەزایی وەك مرۆڤ کردەوەو هیچ کۆت‌و بەندێکی لەسەر ئەو مافە قبوڵ نەکردوو بەدیهێنانی بنەمای یەکسانی دەرفەتی کاری لەنێوان هەمووواندا زامن کرد.

---

[1] سورة الحجرات : ١٣ .

[2] المعجم الأوسط : ٥٨\٦ (برقم ٥٧٨٧).

# دەروازەی سێیەم:
# مافی ئازادی ئەنجامدانی گرێبەست

## ( حق حرية التعاقد )

قورئانی پیرۆز ڕێگەی بەهەموو گۆڕینەوەیەك داوە بۆ مرۆڤ کەهاوسەنگی لەنێوان هەردوو گۆڕینەوەکەدا هەبێتو بەفرۆشتن ناوی بردووە: ﴿وَأَحَلَّ اللّهُ الْبَيْعَ﴾، مەبەستیش لەفرۆشتن هەموو گۆڕینەوەیەکی داراییە کەپایەو مەرجەکانی تێدا بێت، هەموو گۆڕینەوەیەکیشی حەرام کردووە کەهاوسەنگی لەنێوان ئەو دوو شتەدا نەبێت کەدەگۆڕدرێنەوە، بەجۆرێك یەکێك لەلایەکانی گرێبەستەکە لەسەر حسابی زەرەری لایەکی تر بەنارەوا دەستکەوتی زیاتری دەست بکەوێتو، قورئان ئەوەی بەسوو (ریبا) ناوبردووەو دەفەرمووێت: ﴿...وَحَرَّمَ الرِّبَا...﴾[1]، مەبەست هەموو ئەو گۆڕینەوە داراییانەیەکەقازانج دەست لایەکیان دەکەوێت لەسەر حسابی زەرەری لایەکەی تریان.

قورئانی پیرۆز تەنها ئەو پێکهێنەرە سەرەکیی‌و بناغەو حوکمانەی لەخۆ گرتووە کەبەگۆڕانی کاتو شوێنو گەشەی ژیانی ئابووری گۆڕانیان بەسەردا نایەت، لەوانە:

أ. ڕازیبوون (ڕەزامەندی هەموو لایەنەکانی گرێبەستەکە) لەگرێبەستەکانی گۆڕینەوە (عقود المعاوضات)دا، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ

---

[1] سورة البقرة: ٢٧٥ .

آمَنُوا لاَ تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلاَّ أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ...﴾[1].

ب. دەروون باشی لەبەخشینەکاندا واتە ڕەزامەندی ئەو کەسەی دەبەخشێت بەئازادی خۆی بەخشیبێتی، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَآتُوا النِّسَاءَ صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً فَإِنْ طِبْنَ لَكُمْ عَنْ شَيْءٍ مِنْهُ نَفْسًا فَكُلُوهُ هَنِيئًا مَرِيئًا﴾[2].

ج. فەرمانی کردووە بەئەمەکداری بەرانبەر ئەو پابەندیانەی کەبەهۆی ئەنجامدانی گرێبەست یاخود هەڵس‌و کەوتی تاك لایەنە (ارادة منفردة) دێنە ئاراوە، خوا گەورە لەبارەی گرێبەستەوە دەفەرموویێت: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ...﴾[3]، لەبارەی هەڵس‌و کەوتی تاك لایەنە (ارادة منفردة)ش دێنە ئاراوە دەفەرموویێت: ﴿...وَأَوْفُوا بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْئُولاً﴾[4].

د. فەرمانی بەهەموو ئەو کەسانەش کردووە کەمافی دارایی یاخود نادارایی کەسانی تریان لەئەستۆدایە بیگێڕنەوە بۆ خاوەنەکەی، خاوەنەکەی داوای کردبێت یان نا، بەڵگەی بەدەستەوە بێت یان نا، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا...﴾[5].

هـ. فەرمانی بەتۆمارکردنی قەرزەکان کردووە ئەگەر هاتوو بڕەکەی زۆربووو جێگەی ئەوەبوو ناکۆکی دروست بکات، لەمبارەیەشەوە دەفەرموویێت: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا تَدَايَنتُمْ بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى فَاكْتُبُوهُ وَلْيَكْتُبْ بَيْنَكُمْ كَاتِبٌ بِالْعَدْلِ...﴾[6]، بەمەش قورئان یەکەمین سەرچاوەیە دادبین (کاتب

---

[1] سورة النساء: ٢٩ .

[2] سورة النساء: ٤.

[3] سورة المائدة : ١ .

[4] سورة الإسراء: ٣٤ .

[5] سورة النساء : ٥٨ .

[6] سورة البقرة: ٢٨٢ .

عدل)ی باس کردبێتو، لەو فرۆشتنانەدا کەبەهاکەیان پارەیەکی زۆر و بەنرخ بێت فەرمانی کردووە بەئامادەبوونی شاهێد بێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿...وَأَشْهِدُوا إِذَا تَبَايَعْتُمْ...﴾[1].

و. فەرمانی کردووە کەلەبەرانبەر قەرزەکاندا بارمتە(رهن)هەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنْ كُنتُمْ عَلَى سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُوا كَاتِبًا فَرِهَانٌ مَقْبُوضَةٌ...﴾[2].

ز. قورئانی پیرۆز ئازادی بەعەقڵی مرۆڤ داوە لە داهێنانی گرێبەستی تازەو پابەندی نوێ و رێکخستنیان لەبەر رۆشنایی گەشەسەندنەکانی ژیانی ئابووریدا بەو مەرجەی ئەو گرێبەستو پابەندیانە لەچوارچێوەی ئەو بازنە رەوشتیەدا بن کەخوای گەورە بۆ ئیجتیهادەکانی مرۆڤ دایناوە.

---

[1] سورة البقرة: ٢٨٢.

[2] سورة البقرة :٢٨٣ .

# بەشی شەشەم

# مافی ئازادی خێزانی

# (هاوسەرگیری و تەلاق)

لێکۆڵینەوە لەم بابەتە بەسەر سێ دەروازەدا دابەش دەکەین:

یەکەمیان تایبەت دەکەین بەهاوسەرگیری.

دووەمیش بەرەوایەتی تەلاق.

سێیەمیش بۆ قۆناغەکانی کۆتایی هێنانی پەیوەندی هاوسەرێتی.

# دەروازەی یەکەم:
# هاوسەرگیری

## (الزواج)

پەیماننامەیەکی[١] پەیوەندی شەرعی نێوان ژن‌و پیاوە لەسەر شێوەی مانەوە[٢] و مەبەستەکەی پاکێتی[٣] و ئارامی ژیان[٤] و پێکهێنانی خانەیەکی بەسوودە بۆ کۆمەڵگایەکی چاك، قورئانی پیرۆز بریاری ئازادی هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێك یان زیاتر تا چوار داوە، بەڵام ئەو ئازدییە بەچەند کۆتێك کۆتکراوەو رەها نیە، گرنگترینی ئەو کۆتانە: جێبەجێکردنی دادپەروەری لەهەڵس‌وکەوت‌و مامەڵەی ژن‌و مێردایەتیدا،

---

[١] ناونرانی بەگرێبەست مەجازیە، چونکە ئافرەت بابەتی گرێبەست نیە، هەروەها مارەیی نرخ نیە بەرانبەر ئافرەتەکە، چونکە زۆر لەمادە بەنرخترە، ئەوەی رۆژهەڵاتناسان بانگەشەیان بۆ کردووە کەئافرەت لەئیسلامدا کاڵایەو کرین‌و فرۆشتنی پێ دەکرێت‌و نرخەکەی مارەییەکەیەتی قسەیەکی هەڵبەستراو درۆیە، چونکە مارەیی نەپایەی دروستی هاوسەرگیرییە نەك مەرجی دروستی، بەڵکو دیارییەکی سیمبولێیە لەمێردەوە بۆ ژنەکەی وەك هۆکارێك بۆ سەرەتای یەکتر ناسینی نێوانیان، هاوسەرگیریش خوای گەورە ناوی ناوە پەیماننامە: ﴿...وَأَخَذْنَ مِنكُمْ مِيثَاقًا غَلِيظًا﴾(سورة النساء :٢١).

[٢] هاوسەرگیری کاتی لەئیسلامدا نیەو، هەموو کات دانانێك بۆ ماوەی هاوسەرێتی لەئیسلامدا هاوسەرگیریەکە پوچەڵ دەکاتەوە.

[٣] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ إِلاَّ عَلَى أَزْوَاجِهِمْ...﴾ (المؤمنون: ٥-٦) [٣] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلْيَسْتَعْفِفْ الَّذِينَ لاَ يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّى يُغْنِيَهُمْ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ...﴾(النور: ٣٣).

[٤][٤] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾(الروم:٢١).

هـەبوونی توانـای جەسـتەیی بـۆ چـوونەلای هاوسـەری‌و توانـای مـادی بـۆ بـژێوی، بەپێچەوانەی ئەوەوە پێویستە تەنها یەك هاوسەر بهێنێت، هەروەك لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە: ﴿...فَانكحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنَ النِّسَاءِ مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً...﴾[1].

## فەلسەفەی فرەژنی(حكمة تعدد الزوجات):

هـەروەك پێشـتر باسمـانكرد هاوسـەرگیری بەڵێننامەیەكـە لـەنێوان ژن‌و مێـرددا كەهاوبەشایەتیەكی رۆحیە سەرمایەكەی خۆشەویستی‌و رێزی بەرانبەر یەكەو قازانجی ئـەو هاوبەشـایەتیە بریتیـە لەپێگەیانـدنی نەوەیـەكی نـوێی چـاكەكار بـۆ ئەنـدامێتی كۆمەڵگا تا بەشدار بێـت لەگەشەسـەندنی شارسـتانێتیەكەی بەسـوودمەند بـوون لـەو میراتیەی لەباوو باپیرانیانەوە بۆیـان ماوەتـەوە لـەوەی پەیوەنـدداره بەگەشـەكردنی ژیان لەهەموو بوارەكاندا.

لەم روانگەیەوە بۆمان روون دەبێتەوە كەویسـتی زایەنـدی (الغریـزة الجنسـیة) بـۆ ئەوە دروست نەبووە كەخودی خۆی ببێتە مەبەست، بەڵكو هۆكارێكە بۆ مەبەستێكی باڵاتر كەئـەویش مانـەوەی نـەوەی مرۆڤـە، بـەڵام ئـەم غەریزەیـە بـۆ سـێ غـەریزەی لاوەكی دابەش بووە:

یەكەمیان: غەریزە شەهوەتیە ئاژەڵیە مادیەكەی نێوان ژن‌و مێردە، ئەو ئاشوبەی كەمەیلی یەكێكیان بەلای ئەوی دیكەیاندا رادەكێشێت.

دووەمیان: غەریزەی سێیەمیان: غەریزەی خۆشەویستی خێزانـی كـە لەلایەكـەوە ژن‌و مێرد بەیەكەوە دەبەستێتەوە، لەولاشەوە ژن‌و مێردو منداڵەكانیان بەیەكەوە.

بۆیە ملكەچبوون بـۆ یـەكێك لـەو سـێ غەریزەیـە بـەبێ ئـەوانی دیكـە دەرچـوونە لەسـونەتی ژیـان، هـەروەها بـەكارهێنانی غـەریزەی زایەنـدی بـەدەر لـەو مەبەسـتە

---

[1] سورة النساء : ٣ .

سروشتیەی بۆی دروستکراوە پێکدادانە لەگەڵ سروشتی مرۆیی‌و دەرچوونە بەرەو ژیانی ئاژەڵی.

لێرەوە بۆ هەموو خاوەن عەقڵێکی ساغ روون دەبێتەوە کەفرە ژنی لەبەر چەند هۆکارێکە، گرنگترینیان ئەمانەیە:

١-لەوانەیە ژنەکە تووشی شتێك ببێت کە رێگری بکات لەوەی بەئەرکە شەرعیەکان هەستێت وەك نەخۆشی‌و پیری‌و هاوشێوەکانی، مێردەکەشی ساغ بێت‌و بەرگەی ئەو بێبەشبوونە لەپەیوەندی هاوسەرێتی نەگرێت، لێرەدا دوو رێگای لەبەردەمدایە: یان ئەوەتا بەلاریدا دەچێت‌و تووشی لادانی سێکسی ناڕەوا دەبێت، یاخود ژنە تووشبووەکەی بەنەخۆشییەك کەرێگرە لەسەرجێی تەڵاق بدات، لەترازووی شەرعدا هەردوو رێگاکە رەتکراوەیە، لەبەر ئەوە دروستە بۆی ژنێکی دیکە بهێنێت بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە.

٢-لەوانەیە پیاوەکە باری سێکسی نائاسایی بێت‌و تەنها یەك ژن بەشی نەکات، بەتایبەت کەئافرەت خوێنی مانگانەی هەیە، لەکاتی ئەو خوێنە مانگانەیەدا بەمەبەستی پاراستنی تەندروستی ژن‌و مێردەکە چوونە لای حەرامە، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذىً فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ وَلا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّى يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ)[1]، لەبەری ئەوە خوای گەورە رێگەی داوە ژنێکی دیکە بهێنێت تا لەکەوتنە هەڵە پارێزراوبێت.

٣- لەوانەیە ژنەکە تووشی نەزۆکی ببێت‌و، توانای منداڵ بوونی نەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ( الْمَالُ وَالْبَنُونَ زِينَةُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا )[2]، بۆ قەرەبوو

---

[1] سورة البقرة: الاية٢٢٢.

[2] سورة الكهف: الاية ٤٦.

کردنەوەی مێرد لەبێبەشبوونی لەو جوانیەی ژیان قورئـان ڕێگـەی داوە زیـاتر لەژنێك بهێنێـت.

٤-لەوانەیە سروشتی کاری پیاوەکە یاخود پێگە کۆمەڵایەتیەکەی ئەوە بخوازێت زیـاتر لـەژنێکی هـەبێت، هـەروەك ئـەم راسـتیە لـەژیانی عەشـایەری‌و ئـەو کۆمەڵگایانـەدا دەبیـنین کـەگرنگی بەسـامانی ئـاژەڵی‌و کشـتوکاڵی دەدەن، ئەمەش یەکێکە لەهۆکارەکانی ئەوەی خوای گەورە فرەژنی بـەڕەوا دانـاوە، لەبەر ئەوەی یەك ژن یاخود دوو ژن لەو کۆمەڵگایانەدا بەس نیە.

٥-لەوانەیە ئارەزووی ئافرەت پاش منـاڵبوون بـۆ پەیوەنـدی ژن‌و مێـردی کـەمتر ببێت‌و مێردەکەش چالاکی‌و ئارەزووی سێکسی وەك خـۆی مابێتـەوە، لەبـەر ئەوە بۆی هەیە ژنێکی دیکە بهێنێت.

٦- لەوانەیـە لەبەرانبـەر ژمـارەی ئافرەتانـدا ژمـارەی پیـاو کـەمتر بێـت بـەهۆی ڕەوشـی جـەنگ یـاخود سروشـتی ژینگەکـە یـان شـتێکی تـری لـەو جـۆرە، دادپەروەری ئەوە دەخوازێت ڕێگـە بـەپیاو بدرێـت لەیـەك ژن زیـاتر بهێنێـت بەمەبەستی رزگارکردنی ئەو بێوەژنانەی مێردەکانیان لەدەسـت داوە بـەهۆی جەنگ‌و کارەساتەوە تابێبەش نـەبن لەچـێژ وەرگـرتن لـەژیانی هاوسـەرێتی‌و پەیوەندی ژن‌و مێردایـەتی بەرێگەیـەکی ڕەوا لـەبری ئـەوەی تووشـی لادانـی سێکسی ناڕەوا ببن.

٧- لەوانەیە پیاو لەبەر هۆکارێك ژنەکەی تەڵاق بدات‌و ژنێکی دیکە بهێنێت پاشان وای دەبینێـت بەرژەوەنـدی لەوەدایـە ژیـانی هاوسـەرێتی لەگـەڵ ژنەکـەی پێشتریدا دەست پێبکاتەوەو بیگەڕێنێتەوە بەبێ گرێبەند ئەگـەر تەڵاقەکـەی گەڕانەوەیی (رجعی)بوو ماوەی چاوەڕوانی (عـدە)ی تـەواو نـەبووبوو، یـاخود

بەگرێبەنـدێکی تـازە ئەگـەر تەڵاقەکـەی جیاکـەرەوە بـوو[1] یـاخود مـاوەی چاوەڕوانیەکەی تـەواو بووبـوو، ئەگـەر ڕێگـە بـەفرەژنی نـەدرێت ئـەوا ناچـار دەبێت ژنە نوێیەکەی تەڵاق بدات تا ژنە تەڵاقدراوەکەی پێشتری بهێنێتەوە.

٨- خوای گەورە ڕێژەی هەرە زۆری فرەژنی بەچـوار ژن دانـاوە تـا ڕێگـە بگرێـت لەزیادە ڕەوی کەلەرووی شەرعو عەقڵیشەوە بێزراوە. چونکە ئەو ژمارەیەش زۆرتـرین ژمارەیـە کـەبتوانرێت دادپـەروەری لـەنێوان ژنەکانـدا لـەماف و پابەندیـەکان بـەدی بهێنرێـت دوور لەسـتەمی مـادی یـاخود مەعنـەوی بەرانبەریان.

٩-قورئانی پیرۆز فەرمان دەکات تەنها یەك هاوسەر بهێنرێت لەهەموو حاڵەتەکاندا ئەگەر هاتوو فرەژنی بووە هۆی ستەمکردن لـەمافی ژنەکـەی پێشـتر یـاخود ئەوەی دواتر یان هـەردووکیان هـەروەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت: (فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً )[2]، واتـە: تـەنها یـەك ژن بهێـنن لەحەڵەتێکـدا کەگومانتان وابوو کەناتوانن دادپەروەری لەنێوان ژنەکاندا لەحاڵەتی فرەژنیـدا بکەن.

لەو کۆتو بەندانەی لەقورئانی پیرۆزدا هاتووەو هاوسـەرگیری لەگـەڵ هەنـدێك ئافرەتدا بکاتو بەشێوەیەکی بەردەوام بەهۆی رەچەڵەك یاخود هاوسەرگیری یان شیرپێدانەوە حەرامن بۆی، هەروەك خوای گـەورە دەفـەرموێت: (وَلَا تَنْكِحُوا مَا

---

[1] تەڵاقی گەڕانەوەیی بریتیە لەو تەڵاقەی کەپاش چوونەلا دەبێتو هەموو سێ تەڵاقەکە تەولو نەبووە، وەك ئەوەی تەڵاقی یەکەم بێت یان دووەمو، بەرانبەر بەقەرەبوو نەبێت، ئەگەر کۆتێك لەو کۆتانە نەهاتـەدی ئەوا تەڵاقەکە جیاکەرەوە دەبێت، ئەویش هەموو تەڵاقێکە پـێش چـوونەلا یـاخود پـاش چـوونەلاو بـۆ جاری سێ یەم بێت، یاخود بەرانبەر قەرەبوو بێت، ئەمەش گرنگترین پێـوەری جیاکردنەوەیـە لـەنێوان تەڵاقی گەڕانەوەییو جیاکـەرەوەدا، یاسـادانەری عێراقـی هـەموو جیاکردنەوەیـەکی لـەدادگا بەتـەڵاقی جیاکردنەوە (بائن)ی جیاکەرەوەی بچوك داناوە، ئەم جیاکردنەوەیە لەنێوان گەڕانەوەییو جیاکەرەوەدا ڕاست نیەو پێویستە پێداچوونەوەی بۆ بکرێت.

[2] سورة النساء: الاية ٣.

نَكَحَ آبَاؤُكُمْ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَمَقْتاً وَسَاءَ سَبِيلاً )[1]، لەئایەتێکی تردا دەفەرموویێت: (حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ وَخَالاتُكُمْ وَبَنَاتُ الأَخِ وَبَنَاتُ الأُخْتِ)[2].

پێغەمبەر (ﷺ) هێنانی دوو خوشك بەیەكەوەو كۆكردنەوەی نێوان هاوسەرو پوری (خوشكی دایك هەروەها خوشكی باوك) حەرام كردووەو دەفەرموویێت: (لاتجمع بين المراة وخالتها ولابين المراة وعمتها)واتە: ژن لەگەڵ پوری (خوشكی باوكی، خوشكی دایكی) بەیەكەوە بهێنن.

لەو كۆتانەی تر لەسەر ئازادی ژن هێنان حەرامبوونێكی كاتی وەك هێنانی ژنێك كەپەیوەندی بەهاوسەرگیریەكی پێشترەوە هەیە وەك ئەوەی ئافرەتەكە ژنی كەسی تر بوبێت، یاخود لەرووی حوكمەوە وەك ئەوەی لەماوەی چاوەڕوانی جیابوونەوەدا بێت یاخود بڕوای نەبێت بەئاینێكی ئاسمانی یان هێنانی زیاتر لەچوار ژن،

لەكۆتەكانی دیكەی سەر ئازادی هاوسەرگیری لەسوونەتی پێغەمبەری(ﷺ) لەبەرچاوگرتنی خەسڵەتی ئاینداری‌و رەوشتی كردووە لەكاتی هەڵبژاردنی هاوسەری ژیانداو، هەڵنەخەڵەتانە بەجوانی یاخود سامان یان رەچەڵەك‌و بنەچە، لەو بارەیەوە پێغەمبەر (ﷺ)) دەفەرموودەێت: ((تنكح المرأة لأربع، لمالها ولحسبها ولجمالها ولدينها، فاظفر بذات الدين تربت يداك))[3]، واتە: ئافرەت لەبەر چوار شت مارەدەكرێت، سامانەكەی، جوانیەكەی، بنەچەو رەچەڵەكی، ئاینداركەیان هەڵبژێرە دەستت دەبەسترێتەوە بەخاكەوە، هەروەها دەفەرموویێت: (اياكم وخضراء الدمن) واتە: خۆتان دوور بگرن لە (خضراء الدمن)، وتیان ئەی پێغەمبەر خوا (وخضراء

---

[1] سورة النساء /٢٢.

[2] سورة النساء:٢٣.

[3] نيل الاوطار ١١٩/٦،سنن أبي داود مع حاشية عون المعبود ١٢٤/٢.

الدمن) چيه؟ فەرمووی: (المراءة الحسناء في منبت السوء) واتە: ئافرەتێکی جوانە لەماڵێکی خراپ.

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ﴿تزوجوا من حُجر صالح فإن العرق دساس﴾.[1] واتە: لەماڵی چاك هاوسەرگیری بکەن، چونکە منداڵ دەچێتەوە سەرباوانی .

سۆزداری رۆحی پاکخوو (یاخود خۆشەویستی مەعنەوی) لەنێوان هەردوو پۆلەکەدا کەلە پەیوەندی هاوسەرێتیەوە سەرچاوەی گرتووە.

لەئێستادا بە (العرق الدساس) دەوترێت (جين الوراثي)، ئەمەش بەڵگەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) کاریگەری بۆماوەیی لەسەر ئاکاری منداڵەکانی زانیوە بەسەدان ساڵ پێش ئەوەی لەسەدەی هاوچەرخدا ئەوە بزانرێت.

---

[1] طبقات الشافعية الكبرى ٦/٣١٠.

# دەروازەی دووەم:
# ڕەوایەتی تەڵاق

## (مشروعية الطلاق)

قورئانی پیرۆز دانی بەئازادی تەڵاقدا ناوەو بۆ مێرد هەیە سێ جار ژنەکەی تەڵاق بدات، بۆ ئافرەتیش هەیە ئەگەر لەلایەن مێردەکەیەوە ئەو دەستەڵاتەی پێدرابوو دەتوانێ تەڵاق بەکار بێنێت، دادوەریش ئەگەر پێویستی کرد ئەو مافەی هەیە.

هەروەها قورئانی پیرۆز دانی ناوە بەئازادی مێرد لەتەڵاقدانی ژنەکەی، بەڵام ئەم ئازادیە رەها نیە، بەڵکو کۆتکراوە بەهەبوونی کێشەی خێزانیەوەو تەڵاق کۆتا چارەسەر بێت، چونکە هاوسەرگیری -هەروەك باسمانکرد- پەیماننامەیەکە لەهیچ پەیماننامە یاخود گرێبەستێکی تر ناچێت، چونکە بابەتی هاوسەرگیریەکە (محل الزواج) مافێکی مادی نیە بەڵکو بریتیە لەحەڵاڵبوونی چێژ لێك بینین، شوێنەوارەکانیشی تەنها مافی مادی نیە، بەڵکو هاوسۆزیو ئەوینو پێکەوە گونجانو ژیانئارامیو هاوبەشێتیە لەخۆشیو ناخۆشیدا، مەبەستیش لەپێکهێنانی بەدەستهێنانی قازانجی مادی یاخود خۆ دوور گرتن لەزیانی مادی نیە، بەڵام لەگەڵ ئەو گرنگیو مەترسیەی هاوسەرگیریدا لەوانەیە هاوسەرگیریەکە سەرکەوتوو نەبێت، لەوانەیە لەهەڵبژاردنی هاوبەشی ژیاندا چاو بەباشی نەبینێت، هەست بەتەواوەتی کاری نەکردبێت، مارەبرین بۆی هەیە لەسەر بنەمای هەڵە ئەنجام درابێت، یاخود مەزەندەیەکی ناتەواو کەدواتر رۆژگار لەکاتی ژیانی هاوسەریاندا بۆ هەریەکەیان لەوی تریاندا هەڵسوکەوتو رەفتاری وا دەردەخات کەئەم پێی رازی نیە، دەرفەتو

هەڵوێستەکان رووی راستی هەریەکەیان بەویتریان نیشان دەدات، لەوانەیە پاش هاوسەرگیری کارێکی بەدەر لەویستیان رووبداتو ژیانی هاوسەریان بترازێنێت، لەوانەیە ناکۆکیو بەکژیەکا چوون رووبدات بەهۆی دەستێوەردانی خزمانو کەسانی نزیکو هاورێیانەوە بەناوی بەرژەوەندی یان ئامۆژگاریەوە، بەوەش بناغەی ژیانی هاوبەشیان بەرەو وێرانبوون بچێتو دڵیان لەیەك دوور بکەوێتەوەو، خۆشەویستی نێوانیان بگۆرێت بۆ رق لێ بوون، پێکەوەگونجانیان بۆ ململانێ، خۆشەویستیو ژیانئارامی بۆ ئاژاوە، لەوانەیە گومانی جۆراو جۆر بکەوێتە دڵیانەوەو، متمانەیان بەیەك نەمێنێت، قسە بۆیەك هەڵبەستنو گومانی خراپ جێگای راستیەکان بگرێتەوەو هەموو شتێك لەبیرکردنەوەیاندا پێچەوانە ببێتەوەو، لەهەموو شتێکی گەورەو بچوکدا راستی لەدەست بدەن.

پاش ئەمەو ئەوە هیچ دانایەکی تێدا نیە لایەکیان ناچار بکرێت دان بەخۆیدا بگرێتو لەم ژیانە هاوسەرێتیە داروخاوە بەردەوام بێت کەرۆژ بەرۆژ بەرەو خراپەو تێکچوونی زیاتر دەرواتو لەوانەیە وابکات یەکێکیان یاخود هەردووکیان کاری تاوانکارانە یان لادانی رەوشتی یا هاوشێوەیان ئەنجام بدەن ، لەبەر هەموو ئەمانە تەڵاق بۆتە کارێکی پێویستو نەتەوە کۆنو نوێیەکان پەنایان بۆ بردووەو ئاینە ئاسمانیەکان بریاریان لەسەر داوەو یاسا زەمینیەکانیش وەریانگرتووە، ئیسلامیش لەو روانگەیەوە کەئاینی فیترەتە ئاساییە کەبریار لەسەر ئەم سیستەمە بداتو لەهەمان کاتدا بەبێزراوترین حەڵاڵ لای خوای گەورەی دابنێت.

## کێ مافی تەڵاقدانی هەبێت (من له حق الطلاق):

ئەگەرە پێشبینی کراوە عەقڵیەکان ئەم پێنجەیە:

١-یان ئەوەتا تەنها بەدەستی ژن بێت.

٢-یاخود تەنها بەدەستی پیاو بێت.

٣- یاخود بەپێکهاتنی هەردوولایان.

٤-یاخود لەرێگەی دادگاوە بێت.

٥-یان ئەوەتا بەدەستی پیاوەو هەندێ دەرفەتی تەڵاقدان دەدرێتە دەست ئافرەت.

**یەکەم/ لەیەکەمدا لەبەر ئەم هۆیانە سەقامگیر نابێت:**

١- تەڵاقو هاوسەرگیری دوو سیستەمن لەکۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا لەسەر نەریتی فیترەت بونیات نراون: کوڕ دەچێتە خوازبێنی کچ، نەك کچ بێتە خوازبێنی کوڕ، پیاو ژن داخوازی دەکات نەك ژن خوازبێنی پیاو بکات، بۆ وازهێنانیش بۆچوونەکە لەرووی فیتریەوە بەو جۆرەیە بدرێتە ئەوەیان کە چووەتە داوای هاوسەرگیری، ئیسلامیش لەسەر ئەم نەریتە فیترەیە رۆشتوەو مافەکەی تەنها نەداوەتە دەست ئافرەت.

٢- تەڵاقدان هەڵس و کەوتێکە لێکەوتەی دارایی لێدەکەوێتەوەو، مێردەکە هەموو مارەییەکە دەداتە ژنەکەو هەموو بژێویەکانی ماوەی چاوەڕوانی و منداڵەکان و خەرجی لەخۆگرتن و سەرەڕای خەرجیەکانی هاوسەرگیری نوێ ئەگەر ئەوەی ویست لەسەر پیاوەکەیە.

هیچ دادوەری و ویژدانێکی تێدا نیە کەسێك پابەند بکرێت بەقەرەبووی زیانی هەڵس و کەوتی کەسێکی دیکە.

٣- ئافرەت بەحوکمی سروشتی دروستبوونی لەو رەوش و کێشانەی لەژیانیدا بەرەورووی دەبێتەوە لەپیاو زیاتر هەڵدەچێت و تووڕە دەبێت، بۆیە ئەگەر مافی تەڵاقدان تەنها بەدەستی ئەو بێت خراپ بەکاری دەهێنێت.

**دووەم/ تەنها بەدەستی پیاو بێت:**

هەندێکجار ژیانی هاوسەرێتی بەرەو رووی رووداوی لەناکاو یاخود بەویست دەبێتەوە کەزیان بەبەرژەوەندی ژنەکە دەگەیەنێت ئەگەر حاڵەتەکە بەوجۆرە بەردەوام بوو، وەك رۆشتنی پیاوەکە یاخود بەهۆی تاوانێکەوە کەئەنجامی داوە

فەرمانی بەندکردنی بدرێت، یان تووشبوونی بەنەخۆشیەکی درێژخایەن کەچاوەڕوانی چاکبوونەوەی نەکرێت یاخود وەك ئامادەنەبوونی بۆ خەرجکردنی بژێویان، یان خراپ هەڵسوکەوتکردنی لەگەڵ ژنەکەی... ئەگەر تەنها مافی تەڵاقدان بەدەست پیاو بوو هیچ بەدەستی ژنەکە نەبوو ئەوا لەو حاڵەتانەدا ژنەکە دەبێتە قوربانی ڕووداوەکان.

لەبەر ئەوە ئیسلام لەم حاڵەتانەدا دەسەڵاتی داواکردنی تەڵاقی لەدادگا داوەتە ئافرەت.

**سێیەم/ بەدەستی هەردووکیان بێت پێکەوە:**

ئیسلام دانی ناوە بە هاودەنگی پیاوو ئافرەت هەروەك لە شێوەی خولعدا هەیە ئەمە ئەگەر دوور بوو لە خراپ بەکارهێنان، لەگەڵ ئەوەشدا هاودەنگی هەردوولا لەسەر تەڵاقدان لەهەموو حاڵەتەکاندا لەوانەیە چاوەڕوان نەکراو بێت، زۆرجار لایەکیان لەپێناوی زیان گەیاندن بەبەرانبەرەکەی ڕازی نەبێت.

**چوارەم/ تەلاقدان لەدادگا:**

ئەم ڕێگایە لەهەردوو شەریعەتی (موسەویو مەسیحی)و زۆرێك لەیاسا دانراوەکانیشدا ماندووکارە، لەبەر ئەوەی دروست نیە تەڵاقدان لەو حاڵەتەدا نەبێت کەلەبەردەم دادگای تایبەتمەندو بەسەرپەرشتی ئەو بێت.

بەڵام ئیسلام لەبەر هەندێك خراپە بڕیاری لەسەر ئەوە نەداوە، لەوانە: ئاشکراکردنی نهێنیەکانی هاوسەرگیری لەبەردەم دادگاو پارێزەری هەردولادا، لەوانەیە ئەو نهێنیانە ئابڕوبەر بنو زیان بەناوبانگی خێزانەکە بگەیەنێتو، ئایندەی ئافرەتەکە بفەوتێنێتو بەوجۆرە.

**پێنجەم/ بەدەستی پیاو بێت و لەکاتی پێویستدا دەرفەت بدرێتە دەست ئافرەت:**

ئیسلام دانی بەم ڕێگا دروستەدا ناوەو تەڵاقدانی بەمافێکی سروشتی پیاو زانیوە، چونکە لەگەڵ پەیوەندیەکانی بەرانبەر بەژنو منداڵو ماڵەکەی دەگونجێت. بەڵام

لەهەمان کاتدا مافی تەڵاقدانیشی داوەتە ژنەکە ئەمەش یان لەڕێگەی دادگاوە یاخود لەڕێگەی ڕێپێدانیەوە لەلایەن مێردەکەیەوە بەوەی ژنەکە بتوانێت خۆی تەڵاق بدات، لەگەڵ ئەمەدا کە ئیسلام مافی تەڵاقدانی داوە بەمێرد بەئازادانە وازی لێ نەهێناوە کەبەویستی خۆی هەڵس و کەوتی پێ بکات، بەڵکو سنوورێکی لەقۆناغەکان و کاتدا بۆ داناوە.

# دەروازەی سێیەم:
# چارەسەری کێشەکانی پەیوەندی هاوسەرێتی و قۆناغەکانی کۆتای پێ هێنانیان

## (معالجة مشكلة العلاقة الزوجية ومراحل انهائها)

ئیسلام لەسەر مێرد پێویستی کردووە کە چارەسەرکردنی کێشەکانی خێزانی بەم قۆناغانەدا تێپەڕ ببێت:

**قۆناغی یەکەم : ئامۆژگاری کردن (فعظوهن):**

قورئان فەرمانی بەپیاو کردوە لەحاڵەتی لاسار بوونی ژنەکەی دەست پێشخەری بکات بە ڕێگای ئامۆژگاری و ڕێنمایی و ئاراستەکردن و هۆشیاری کردنەوە لەسەر هەڵەکان لەبری پەنا بردن بۆ تەڵاقدان، خودای گەورە دەفەرموێت: ( وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ )[1].

ئەم ڕێگایە یەکەم ئەرکی سەرۆك خێزانە بەمەبەستی چاکسازی هەموو ئەوەی دووچاری خراپبوون بۆتەوە.

---

[1] ﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ بِمَا فَضَّلَ اللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنفَقُوا مِنْ أَمْوَالِهِمْ فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ حَافِظَاتٌ لِلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ اللَّهُ وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيّاً كَبِيراً﴾ النساء : ٣٤

## قۆناغی دووەم: بەجێ هێشتن لەناو جێگای هاوسەریتی (واهجروهن في المضاجع):

جێگای هاوسەریەتی شوێنی ورووژاندنە، بەجێ هێشتنی شێوازێکی دەروونیە پیاو پەنای بۆ دەبات لەپێناوی هۆشیارکردنەوەی ژنەکەی لەسەر ئەوەی کەدووچاری چارەنووسی بێ بەش بوونی پێکەوە خەوتن دەبێتەوە کە لوتکەی پەیوەندی ژن و مێردە لەخۆشەویستی و بەزەیی و ئارامیدا، بەڵام پەروەردەی ئاکاری ئیسلامی فەرمان بەمێرد دەکات کەپابەندبێت بەمانەی لای خوارەوە:

١- بەجێ هێشتن (پشت لێکردن) دەبێت تەنها لەشوێنی پەنهانی هەردوو هاوسەرەکە بێت.

٢- نابێت لەپێش چاوی مناڵەکانی (پشتی لێ بکات) بۆ ئەوەی ئەوە کاریگەری نەبێت لەسەر ڕەفتاریان و خراپە و خراپەکاری لەدەرونیان دروست نەکات.

٣- نابێت پشت لێکردن لەپێش کەسانی بێگانە بێت و ژنەکە سووک بکات و لەبەهای کەم بکاتەوە یاخود شکۆمەندی لەکەدار بکات، زیاتر لاساری بکات.

## قۆناغی سێیەم: بەکارهێنانی ڕێگەی لێدان (واضربوهن):

ئەگەر ڕێگەی یەکەم و دووەم ئەنجامی نەبوو ئەوا مێرد پەنا بۆ ڕێگەیەك دەبات کەگونجاوە لەگەڵ نەفسیەتی ژنەکە، لەوانەیە هەندێك کەس بڵێن شێوازی لێدان هەڵبژاردەیەکی دروست نیە.

بەڵێ لێدان بەتێکەیشتنی دڵڕەقانەی ئەوان بەکاریکی باش دانانـدرێت، بەڵام ئەم ڕێگایە جەنگێك نیە لەنێوان ژن وپیاودا کە مەبەست لەم شێوە ڕەفتارە شکاندنی پێگەی ئافرەتەکە بێت، چونکە لێدانیش بەهەمان شێوەی تەلاق بێزراوە بەڵام لەوانی دیکە خراپەی کەمترە.

پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرمووێت: (ولا يضرب الا اشراركم)[1] ، واتە: تەنها خراپەکانتان لێدان بەکار دەهێنن.

بەڵام کەسی وا هەیە پێویست دەکات ئەم ڕێگەی لەگەڵ بەکاربهێنرێت، بەو مەرجەی لێدانەکە بریندار کەر نەبێت و، هەڵبژاردنی لێدانیش خراپەی کەمترە لەتەڵاق.

شایانی باسە کەلێدان لەو کاتەدا بەکاردەهێنرێت کەژن کارێکی ناڕەوای ئەنجام دابێت دژبێت لەگەڵ ڕەوشت و ئادابی گشتی، لەم حاڵەتەدا مێرد سێ ئەگەری لەبەردەمدایە: یان ئەوەتا پەنا بۆ دادگا دەبات، ئەمەش خراپەی هەیە بۆ ناوبانگی خێزانەکە، یان پەنا بۆ تەڵاقدان دەبات ئەوەش دەرئەنجامی خراپی دەبێت، یاخود پەنا بۆ لێدان دەبات ئەمەیان پاراستنی ناوبانگی خێزانەکەو بەردەوامی ژیانی هاوسەرێتیانی تێدایە.

## قۆناغی چوارەم: ئاشتەوایی (ئاشتەوایی باشترە) (الصلح) (والصلح خیر):

هەرکاتێك نیشانەکانی لاساری بەدەرکەوتن قورئانی پیرۆز هەردوو هاوسەرەکەی ئاڕاستەکردوە بۆ ئاشتەوایی و گفتوگۆ ولێك تێگەیشتن، خودای گەورە دەفەرمووێت: (وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِن بَعْلِهَا نُشُوزاً أَوْ إِعْرَاضاً فَلاَ جُنَاْحَ عَلَيْهِمَا أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحاً وَالصُّلْحُ خَيْرٌ)[2].

ئەم ڕێگایە وا دەکات پەنا بۆ تەڵاق نەبرێت کەبێزراوترین حەڵاڵەو دەرئەنجامی خراپی بۆ ژن و مێردو منداڵەکان لێدەکەوێتەوە، خودای گەورە دەفەرمووێت: (وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِنْ كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا)[3].

---

[1] الطبقات الكبرى ١٤٨/٧.

[2] النساء: ١٢٨.

[3] النساء: ١٢٨.

## قۆناغی پێنجەم: ناوبژیوانی (هەرلایەکیان لای خۆیەوە ناوبژیوانێک بنێرێت (التحكيم) (فابعثوا حكما من اهله وحكما من اهلها):

لەکاتی دەرکەوتنی نیشانەکانی ناخۆشی و ناکۆکی لەنێوان هەردوو هاوسەرەکەدا، لەسەر خێزانەکانیان یاخود سەرپەرشتیار یاخود دادوەر یاخود هەر کۆمەڵێکی ئیسلامیە بچنە ناو بابەتەکەوە بەپێشکەشکردنی یارمەتی و هاوکاری بۆ لابردنی زیانی ناکۆکیەکە بەو شێوازەی کە خودای گەورە فەرمانی پێکردوە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: (وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَمًا مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِنْ أَهْلِهَا إِنْ يُرِيدَا إِصْلَاحًا يُوَفِّقْ اللَّهُ بَيْنَهُمَا إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا)[١].

جێبەجێکردنی ئەم فەرمانەی خوای گەورە بۆ لێکۆڵینەوە لەناکۆکی ژن و مێرد وادەخوازێت ئەمانەی تێدا بێتەدی:

أ- ناوبژیوانێك لەکەس و کاری ژنەکە ڕەوانە بکرێت کەپێی ڕازی بێت و ناوبژیوانێك لەکەس و کاری پیاوەکە کەپێی ڕازی بێت.

ب- ئەبێت هەردوو ناوبژیوانەکە دادپەروەرین و شارەزا بن لەکاروباری خێزانی و کێشەکانی.

ج- ئەوەندەی لەتوانادا بێت ئەبێت لەخزمانی هەردوو هاوسەرەکە بن، ئەگەر کەس و کاریان نەبوو یاخود هەبوو بەڵام کەسیان بۆ ئەم کارە شیاو نەبن لەبەر نا شارەزایی یاخود نا دادپەروەری یاخود جگە لەوانە باشتر وایە لەدراوسێکان بن[٢].

دانایی ئەوەی هەردوو ناوبژیوانەکە لەکەس وکاربن لەوە دایە بەتەواوی ئاگاداری کێشەکانی هەردوو هاوسەرەکەن و، پەرۆشیان بۆ ناوبانگی هەردوو خێزانەکە و بەزەیی پێ هاتنەوە بەمناڵەکان و کاریگەریان لەسەریان زۆر جاردەبێتە هۆی

---

[١] سورة النساء:٣٥.

[٢] بروانە: احكام القران لابن العربي (ابي بكر محمد بن عبدالله)تحقيق علي محمد البجاوي، الطبعة الثانية. عيسى البابي الحلبي ٤٢٤/١.

سەرکەوتنی ئەرکەکانیان.

د- ئەبێت هەردووکیان بێ لایەن بن و مەبەستیان چاکسازی بێت بەبێ جیاکاری و جیاوازی و لاگیری.

هـ- ئەبێت هەردوو ناوبژیوانەکە لەکەشێکی ئارام ودوور لەهەڵچوونی دەروونی و کێشەکانی مەعیشەتو ئەو هۆکارانەی دیکە کەلەوانەن ببنە تێکدەری ژیانی هاوسەرێتی لەگەڵ هاوسەرەکان کۆببنەوە.

و- ئەبێت راپۆرتێکی راست و سەرراستانە و پاك بەرزبکەنەوە کەهۆکارە راستەقینەکانی ناکۆکی و جیاوازییەکان لەنێوان هاوسەرەکاندا لەخۆ بگرێتو تێیدا لایەنی کەم تەرخەم دیاری بکەن.

لەکاتی باسکردنی بابەتی جیابوونەوە لەدادگا قسە لەرادەی پابەندبوون بەراپۆرتی ئەم دوو ناوبژیوانە دەکەین.

ئەگەر ئەم پێنج هەنگاوە سەرکەوتوو نەبوو، لەو کاتەدا دەردەکەوێت کەشێك هەیە رێگرە لەوەی ژیانی هاوسەریەتی راستەڕێ و ئارام ببێت، لەم حاڵەتە ژیریبێژی ئەوە دەخوازێت بچێتە ژێر ئەو بارودۆخە ناخۆشەی کەبەناچاری پەنای بۆ دەبردرێت کە تەلاقە وەك کارێکی ناپەسەند و نەخوازراو لەلایەن ئیسلامەوە، چونکە بێزراوترین حەلاڵە لەلای خودای گەورە.

## قۆناغی شەشەم: تەلاقی یەکەم (الطلاق للمرة الاولى):

لەکاتی بوونی پێویستی زۆر ئاینی ئیسلام رێگەئەدات بەپەنا بردن بۆ تەلاق کە بەسێ جار لە فەرمایشتی خودای گەورەدا دیاری کراوە: (الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ)[1].

واتە ئەو تەلاقەی لەدوای ڕوودانی دەکرێت جارێکی تر ژیانی هاوسەرێتی بەردەوام

---

[1] البقرة : ٢٢٩.

بێت بەگێڕانەوە لەتەلاقی گێڕانەوەیدا وبەگرێبەست ومارەیی تازە لەتەلاقی لێکترازان(دووجار)، لەهەردوو حاڵەتی گێڕانەوە و گرێبەستی تازە سەرپەرشتیارەکەی مافی پەلپ پێ گرتنی نیە بەگوێرەی فەرمایشی خودای گەورە: (وَإِذَا طَلَّقْتُمْ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ أَنْ يَنكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ إِذَا تَرَاضَوْا بَيْنَهُمْ بِالْمَعْرُوفِ) [1].

زۆرێك لەزانایان و ڕاڤەکاران بۆ ئەو چوون کەمەبەست ئەوەیە تەلاقی گێڕانەوەیی دووجارە، لەدوای هەر جارێك (بەچاکە دەست پێوگرتن – إِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ –) گێڕانەوەی ژنەکەیە بەبێ گرێبەست یاخود (دەست هەلگرتن بەچاکەکاری – أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ –) واز هێنانە لەتەلاقدراو بەبێ گێڕانەوەی بۆ ئەوەی ببێتە جوداکەرەوە بە بەسەرچوونی ماوەی چاوەڕوانی.

لەگەڵ ڕێزی بێ پایانم بۆ پێگەی ئەو زانا بەڕێزانە بەڵام ئەم قسانەیان پێچەوانەی دەقی ئاشکرای ئاماژە بۆ کراوە، لەبەر ئەم هۆکارانەی لای خوارەوە:

١–دەربڕینی (دەست لێ هەلگرتن – تسريح – ) لەدەستەواژەی قورئانی پیرۆزدا هیچ واتایەکی تر ناگەیەنێت جگە لەتەلاقدان نەبێت بەبەلگەی ئەوەی لەسورەتی ئەحزاب ئایەتی(٢٨) هاتووە: (يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لأَزْوَاجِكَ إِنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلاً).

هەروەها ئایەتی (٤٩): (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمْ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلاً).

باوەڕ بەوە ناکرێت کەدەست هەلگرتن لەم دوو دەقەدا بەوشێوەیە ڕاڤەبکرێت بەوازلێهێنان تاکو ماوەی چاوەڕوانی بەسەردەچێت، بەشێوەیەکی تایبەت لەدەقی دووەم کەتەلاق جوداکەرەوەیە، لەبەر ئەوەی لەپێش چوونەلایەو،

---

[1] ﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمْ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ أَنْ يَنكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ إِذَا تَرَاضَوْا بَيْنَهُمْ بِالْمَعْرُوفِ ذَلِكَ يُوعَظُ بِهِ مَنْ كَانَ مِنْكُمْ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكُمْ أَزْكَى لَكُمْ وَأَطْهَرُ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾(البقرة: ٢٣٢).

ئاشکرایە کەقورئان هەندێکی هەندێکی تری ڕاڤەدەکات.

٢- جێگیربوونی بۆچوونی کۆمەڵی زانایانی موسڵمانان لەسەر ئەوەی تەلاق و دەستهەڵگرتن و جیابوونەوە و دەرهاویشتەکانی لەشێوازە ڕوونەکانی تەلاقن.

٣- دەست هەڵگرتن کارێکی ئەرێنیە کەلەمرۆڤەوە بەویستی تاك لایەنەی خۆی دەدرێت، بەڵام وازهێنان کاریکی نەرێنیە کەناکرێت یەکەم بە دووەم ڕاڤەبکرێت.

٤- ئەگەر مەبەست لە(تەلاق دووجارە- الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ -) تەلاقی گێڕانەوەیی بێت، ئەی حوکمی جوداکەرەوە لەکوێیەو، حوکمی ئەوە چیە ئەگەر هاتوو تەلاقی یەکەم لەپێش چوونەلا بێت؟

٥- قورتبی دەڵێت: (ئەبو عومەر وتویەتی و زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی فەرمایشی خودای گەورە: (یاخود دەست هەڵگرتنی بەچاکەکاری - أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ -) بریتیە لەتەلاقی سێیەم لەدوای دوو تەلاقەکە[1]. کامیان گرنگی داوە بەفەرمایشی خودای گەورە: (فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ).

هەروەها دەڵێت: (لە ئەبی رزین دەگێڕنەوە وتویەتی پیاوێك هات لای پێغەمبەر (ﷺ) ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئەم فەرمایشتەی خودای گەورەت بینیوە: (الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ)، ئیدی تەلاقی سێیەم کوا؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (إِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ)[2].

هەروەها لەکتێبی (احکام القران)ی (جصاص)[3] و (احکام القران)ی (ابن

---

[1] احكام القران لابي عبد الله محمد بن احمد الانصاري القرطبي، الطبعة الثالثة ٣/١٢٧.

[2] عمدة القاری بشرح صحیح البخاري ٢/٢٣٤.

[3] الامام ابو بكر احمد بن علي الرازي الجصاص، احكام القران تحقيق محمد صادق قمحاوي نشر دار المصحف القاهرة ٢/٨١.

العربی)[1] وا هاتووه كه‌ئه‌وه دووپات ده‌كه‌نه‌وه.

كه‌واته ئه‌م فه‌رمایشته‌ی خوای گه‌وره: (أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ) حه‌قیقه‌تی ته‌ڵاقی سێیه‌مه‌و هیچ شتێك نیه له‌و مانا راسته دووری بخاته‌وه، ئه‌و فه‌رمایشته‌ی خوای گه‌وره‌ش: (فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ)، خستنه رووی ئه‌و حوكمه‌یه كه‌به‌هۆی ته‌ڵاقی سێیه‌مه‌وه دێته ئارا نه‌ك شتێكی دیكه، ئه‌م حوكمه‌ش بریتیه له‌حه‌ڵاڵ نه‌بوونی بۆ مێردی یه‌كه‌می تا شوو به‌پیاوێكی دیكه نه‌كاتو ئه‌و پیاوه ده‌بێت بچێته لای چوونه‌لایه‌كی شه‌رعی، ئه‌گه‌ر به‌هۆی مردن یاخود ته‌ڵاقه‌وه یان جیاكردنه‌وه له‌دادگا لێك جیابوونه‌وه‌و ماوه‌ی چاوه‌ڕوانی كۆتایی هات ئه‌و كاته ئه‌گه‌ر ویستی له‌سه‌ر بوو دروسته شوو به‌مێردی یه‌كه‌می بكاته‌وه.

### پابه‌ندییه‌كانی ته‌ڵاقده‌ر له‌كاتی ته‌ڵاقداندا (التزامات المطلق حين الطلاق)

ئیسلام كه ڕێگای داوه به‌پیاو به‌په‌نابردن بۆ ته‌ڵاق وه‌ك دوا چاره‌سه‌ر، به‌ڵام ڕێگای پێ نه‌داوه هه‌ركاتێك و هه‌ر چۆنێك مه‌به‌ستی بێت هه‌ڵسوكه‌وت به‌م مافه‌وه بكات، به‌ڵكو پابه‌ندی كردوه به پابه‌ندبوون به‌مانه‌وه:

**یه‌كه‌م: جیاكردنه‌وه له‌نێوان سێ ته‌ڵاقه‌كه‌و** دابه‌شكردنی به‌سه‌ر سێ جاردا (التفريق بين الطلقات الثلاث وتوزيعها على ثلاث مرات):

ئه‌مه‌ش به‌ده‌قی ئه‌م ئایه‌ته: (الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ).

(جصاص) ده‌ڵێت: خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: (الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ) ئه‌وه‌ش جیابوونه‌وه (تفريق) ده‌خوازێت، چونكه ئه‌گه‌ر به‌یه‌كه‌وه دوو ته‌ڵاقیدا، ئه‌وا دروست نه‌بوو بوترێت دووجار ته‌ڵاقیداوه، به‌هه‌مان شێوه ئه‌گه‌ر پیاوێك دوو درهه‌م بدات نابێت بوترێت دووجار پێی داوه تا پێدانه‌كه به‌دووجاری جیا بێت ئه‌و كاته وا ده‌وترێت).

---

[1] سه‌رچاوه‌ی پێشوو ١٩١/١.

هەروەها دەڵێت: (واتاکەی فەرمانە)، هەموو فەرمانێکیش بۆ جێبەجێکردنە[1].

**دووەم: کات (التوقیت):** لەسەر پیاو پێویستە پابەند بێت بەو کاتەی لەقورئانی پیرۆزدا بۆی دیاری کراوە، خوای گەورە دەفەرموویێت: (يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمْ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ)[2]، ئەم ئایەتە گوتارە بۆ پێغەمبەرەکەی بەمەبەستی گرنگی پێدانو بەبایەخ وەرگرتنی.

کاتی ماوەی چاوەڕوانی ئافرەتیش جگە لەم ماوانە لەسوننەتی پێغەمبەردا دیاریکراوە:

أ- کاتی بێنوێژی (وقت الحيض): دروست نیە تەڵاقدانی هاوسەر ئەگەر لەماوەی بێنوێژیدا بوو.

ب- کاتی زەیستانی (وقت النفاس): لەکاتی زەیستانیشدا تەڵاقدانی هاوسەر دروست نیە.

ت- کاتی پاکبوونەوەیەك تێیدا چووبێتەلای (وقت طُهرٍ عاشرها فيه): دروست نیە تەڵاقدان لەوکاتەدا چونکە ئەگەر دووگیانی[3].

**سێیەم: وەدەرنەنانیان لەماڵی هاوسەرێتی (عدم إخراجهن من بيت الزوجية):**

ئەگەر تەڵاقدانەکە گەڕانەوەیی بوو تا ئەو کاتەی ماوەی چاوەڕوانیەکەی تەواو

---

[1] (احكام القران)ی (جصاص)، سەرچاوەی پێشوو ٢/٧٣، ٧٤.

[2] ﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمْ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لاَ تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلاَ يَخْرُجْنَ إِلاَّ أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ لاَ تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْرًا﴾ الطلاق: ١.

[3] بۆ زیاتر ئاگاداربوون بڕوانە: فتح الباري بشرح صحيح البخاري، سەرچاوەی پێشوو ٩/٣٤٥ كتاب الطلاق باب قوله تعالى: ﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمْ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ﴾ و بڕوانە: زاد المعاد في هدي خير العباد محمد خاتم النبيين وامام المرسلين للامام العلامة ابن القيم الجوزية ٤/٤٣ و دواتر لەژێر ناونیشانی (حكم رسول الله ﷺ في تحريم طلاق الحائض والنفساء والموطوءة في طهرها وتحريم ايقاع الثلاث جملة)- المدونة الكبرى في الفقه المالكي ٥/١٠٤ - المحلى في الفقه الظاهري ١٠/١٦٤ - الشوكاني نيل الاوكار ٦/٢٢٦.

دەبێت، دەبێت لەبەر ئەوەی لەماوەی چاوەڕوانیدایە ئەوەی پێویستیەتی لەخواردن و جل و بەرگ و خواردنەوە و شوێنی نیشتەجێبوون لەبەر ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە بۆی دابین بکات: (وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لاَ تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلاَ يَخْرُجْنَ إِلاَّ أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ لاَ تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْرًا)[1].

لەئایەتەکەدا فەرمان بە تەقوا پێش فەرمانکردن بە دەرنەکردنیان هاتووە ئەمەش ئاگادارکردنەوەیەکە ئاراستەی هاوسەرەکان کراوە، هەروەها لە (وتلك حدود الله) دواتر دەستەواژەی ( من بیوتهن) بۆ جەختکردنەوەیە لەمافی مانەوەیان تێیدا لەماوەی چاوەڕوانیدا.

لەبڕگەی کۆتایی: (لاَ تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْرًا)، دیاریکردنی هۆکاری دەرنەکردنیانە ئەوەش بۆ ڕەخساندنی دەرفەت بۆ گێڕانەوە و دووبارە دروستکردنەوەی سۆز و خۆشەویستی و هۆگری و بیرکردنەوە لەدەرئەنجامەکانی جودابوونەوە و بیرەوەریەکانی ژیانی هاوبەش، بەشێوەیەك کەژنەکە بەحوکمی تەلاقەکە دوورە بەڵام لەبەر چاوان نزیکە.

لەماوەی چاوەڕوانی مافی ئەوەی هەیە بیگێڕێتەوە بەبێ گرێبەستی تازە بەکردەوە وبە ووتە وەك (تۆم گێڕایەوە) لەلای هەندێکی تر لەزانایانو، تەنها بەکردار وەك جووت بوون لەگەڵیدا بەنیازی گێڕانەوە.

ئەگەر ماوەی چاوەڕوانی تەواو بوو بۆی نیە بیگێڕێتەوە بەگرێبەستی تازە نەبێت.

**چوارەم :– شایەتیدان لەسەر تەلاق و گێڕانەوە (الإشهاد على الطلاق والرجعة):**

لەسەر پیاو پێویستە بەئامادەبوونی دوو شایەت ژنەکەی تەلاق بدات و ژنەکەی بگێڕێتەوە لەبەرانبەر دوو شایەت بۆ ئەوەی دوور بێت لە تۆمەتبارکردن: شایەتیدان

---

[1] (الطلاق: ١).

لەم دوو حاڵەتەدا بەدەق لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە: (فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَى عَدْلٍ مِنْكُمْ)[1].

فەرمانکردن بەئامادەبوونی دوو شایەتی دادپەروەر بۆ پێویستبوونە لەبەر ئەوەی پێویستیەکە بەگوێرەی فەرمانی خودای گەورەیە ئەگەر هاتوو بەڵگەیەك نەبێت بەپێچەوانەی ئەوە، فەرمانەکە بکرێتە رێنمایی هەڵەیەکە لێخۆشبوونی بۆ نیە چونکە حەقیقەتە بۆ پێویستبوون‌و بەبەڵگەیەك نەبێت لەسەری لاناچێت ئەوەش لەئارادا نیە.

**پێنجەم :- زۆرنەکردن لەژن :** زۆر لەژن نەکرێت لەوەی شتێك لەمارەیی یاخود ئەو بژێوییەی لەکاتی ژیانی هاوسەریەتی پیاو کردویەتی بۆی بگەڕێنێتەوە لەبەرانبەر دەستهەڵگرتن لەژنەکە ئەگەر ژیانی نەگونجێت لەگەڵیدا، بەڵام ئەگەر شتێکی لەوە گێڕایەوە بەڕەزامەندی خۆی بۆ پیاوەکە لەبەزانبەر تەڵاق لەبەر ئەوەی ڕقی لێدەبێتەوە ودەیەوێت ئەگەر نرخەکەی هەرچیەك بێت لەدەستی ڕزگاری ببێت لەوەدا گرفتێك نیە، ئەم تەڵاقە لەدەستەواژەی زانایان پێی دەوترێت خلع (جیابوونەوەی ئارەزوومەندانە).

خودای گەورە لەدوای فەرمایشتەکەی دەفەرمووێت: (الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ)، (وَلاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا إِلاَ أَنْ يَخَافَا أَلاَ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلاَ تَعْتَدُوهَا وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ)[2].

---

[1] ﴿فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَى عَدْلٍ مِنْكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ ذَلِكُمْ يُوعَظُ بِهِ مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا﴾الطلاق:٢

[2] ﴿الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ وَلاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا إِلاَ أَنْ يَخَافَا أَلاَ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلاَ تَعْتَدُوهَا وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾البقرة: ٢٢٩

سەبارەت بەپێویستبوونی شایەتەکان بڕوانە: التفسير الكبير للامام فخر الرازي ٤٣/٣ واحكام القران للقرطبي سەرچاوەی پێشوو، وتفسير الطبري ١٣٧/٢٨.

ئەم دەقە نیشانەی پەرۆشی ئیسلامە لەسەر پاراستنی ئافرەت لەو ستەمەی کەلەوانەیە تووشی ببێت لەکاتی تەلاقدان، ئەگەر لەدوای تەلاقی یەکەم ژیانی هاوسەریەتیان دەست پێکردەوە دواتر ناکۆکی و نارەحەتی و خراپ تێگەیشتن جارێکی تر گەڕایەوە نێوانیان، ئەوکاتە لەسەر پیاو پێویستە ئەو پێنج هەنگاوە بگرێتەبەر کەلەپێش تەلاقی یەکەم هەیە بەهەمان ریزبەندی، ئەگەر هەوڵەکان سەرکەوتوو نەبوو بۆ پیاو هەیە ژنەکەی تەلاق بدات بۆ جاری دووەم (تەلاقی دووەم).

## قۆناغی حەوتەم: - تەلاقدانی جاری دووەم:

لەسەر پیاو پێویستە بەهەمان شێوە ئەم جارەش سەرجەم ئەو کۆتانە رەچاو بکات کەلەسەر ویستی سەپێندراوە لەتەلاقی یەکەم لەجیابوونەوەو، کاتو، شایەتیدانو، دەرنەکردنی ژنەکەی لەماڵ ئەگەر هاتوو تەلاقەکە گێڕانەوەیی بێت تاکو ماوەی چاوەڕوانیەکەی تەواو دەبێت.

گەڕانەوە بۆ ژیانی هاوسەریەتیان لەدوای تەلاقی دووەم، ئەگەر بەگێڕانەوەیی بوو کاتێ تەلاقەکە گێڕانەوەیی بێت، یاخود بەگرێبەستی تازە ئەگەر هاتوو جوداکەرەوە بێت، دواتر بگەڕێنەوە بۆ هەمان ناخۆشی، لەو کاتەدا لەسەر پیاو پێویستە بەهەمان شێوە پەیرەوی پێنج هەنگاوەکەی یەکەم بکات، ئەگەر هیچ سوودێکی لێ نەبینی بۆی هەیە پەناببات بۆ تەلاقی سێیەم و کۆتایی.

## قۆناغی هەشتەم: تەلاقی جاری سێیەم:

ئەگەر داواکارییەکانی هەر سێ تەلاقەکە هاتە دی، ئەوا ئەم حوکمانەی لێدەکەوێتەوە:

١. رێگە نەدان بە مانەوەی ژنەکە لەو ماڵی هاوسەرایەتیدا، چونکە ئەو ژنە (بائنە)یە، و نامەحرەمە.

٢. رێگە نەدان بە گەڕانەوەی ژنەکە، نە بەگەڕانەوەیی(رەجعی)، و نە بەگرێبەستی

نویێ، لەجیابوونەوەی گەورە (البینونە الکبری)دا.

٣. بۆ ژنەکە دروستە، لە دوای تەواو بوونی ماوەی چاوەڕوانیەکەی، کە پیاوێکی تر هەڵبژێرێت، وەك هاوسەری ژیانی خۆی .

٤. دروستە بۆ ژنەکە، بگەڕێتەوە، بۆ لای پیاوە پێشووەکەی، بەم مەرجانەی لای خوارەوە:

أ. ئەگەر شووی بە پیاوێکی تر کرد بێت، هاوسەرگیریەکی شەرعی سروشتی نەك حەڵاڵکەرەوە.

ب. دەبێت پیاوی دووەم چوو بێتە لای، چوونەلایەکی شەرعی.

ج. دەبێت جیابووبنـەوە لە یەکتـر، ئیتر بە مردنی پیاوەکە بێت، یان بە تەڵاقدان بێت، یان بە جیاکردنەوە لە دادگادا.

د. دەبێت دوای جیابوونەوە لە پیاوی دووەمیش، دیسان ماوەی چاوەڕوانـی، تەواو کردبێت.

ئەگەر ئەم مەرجانە هاتنە دی، ئەوا دروستە بۆ پیاوی یەکەم، دیسان هاوسەرایەتی لەگەڵدا بکاتەوە، و ئەگەر هەردوولا حەزیان لێبوویەوە، چونکە هەردوولایان بە ئەزموونێکی کرداریدا تێپەڕیان کردووەو، دوای ئەو ئەزموونە گومان دەبرێت، ژیانی هاوسەرایەتی سەرکەوتوو دەست پێبکەنەوە.

**فەلسەفەی ئەم ڕێکارە:**

١-تەڵاقدانی سێیەم، وەك دەرئەنجامێکی حەتمی دێتە ئەژمار، بۆ ڕیشەکێشکردنی گرفتەکانی نێوان ژن و پیاو، لەلایەن خوای گەورەوە لە بەردەم ژن و پیاودا ڕێگا واڵاکراوەو زیاتر لەمەش (تەڵاقدان، یەکگرتنەوە، جیابوونەوە، گەڕانەوە، ئینجا وازلێهێنان ئەمەش، داننانە بە نائومێدیو بەردەوامی نەهامەتیەکی بێ کۆتایی.

٢- هەڵپەساردنی دروست بوونی گەڕانەوەی ژن، لە دوای تەڵاقی سێیەم، بەوەی کە بچێت شوو بە پیاوێکی تر بکات، ئەمەش یەکێکی ترە، لەو کۆتو بەندانەی کە

شەریعەت، وەك ســەربــارێك زیادی كردووە، تا خواستنو ئیرادە لە تەلاقدا بسەلمێنێتو، تەنگ بە بازنەی تەلاقدانیش بچوك بكاتەوە.

٣- ئەزموونی ئەو ژنە لە گەڵ مێردە تازەكەیدا، زۆر ڕاستی بۆ ڕوون دەكاتەوە، پاش بەراووردكردنی نێوان ئەو دوو ژیانە جیاوازە، دروستو نادروستی بۆ ڕوون دەبێتەوە، كە ئەم ئەزموونەش دیسان بۆ پیاوەكەش باشە.

لە كۆتایی ئەم بەشەدا، دەگەڕێمەوەو بە خوێنەرانی بەڕێز دەڵێم: ئەم بنەما گشتییانە لە ڕێكارەكانی تەلاقدا قورئانی پیرۆزدا زۆر بە ڕوونی دانی پیاداناونو بێگومان قورئانیش زۆر كاربەجێیانەو تەندروستانە هاتووەو، ڕێگا نادات بە پیاو كە بە پەلەو هەر لە سەرەتاوە لە سەر بێ ماناترینو هیچترین هۆكار، هەڵسێت پەیوەندی هاوسەرایەتی بپچڕێنێتو، ناشهێڵێت، ئەو پەیوەندییە ڕۆحییە پیرۆزە كۆتایی پێ بێت، مەگەر دوای ئەوپەڕی هەوڵو كۆششو ئەوپەڕی نائومێدی، هەر ئەویش هاوار لە پیاوان دەكات: ﴿...وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِنْ كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا﴾[1]، بەڵام لە نێوان ئەوەدا كە قورئانی پیرۆز فەرمانی پێ دەكات، و ئەوەی ئەمڕۆ مسوڵمانان لە جیهانی ئیسلامیدا لەسەر بنەمای مەزهەبگەرایی كاری پێ دەكەن، جیاوازی زۆر هەیە، جیاوازییەكی زۆر هەیە لەنێوان ئیسلامی قورئانو ئیسلامی مەزهەبو تایەفەگەریدا.

---

[1] سورة النساء :١٩ .

# بەشی حەوتەم

## مافی ئازادی بەرگری

## ( حق الحرية الدفاعية )

لێکۆڵینەوەی بابەتەکە بەسەر دوو دەروازەدا دابەش کراوە:

یەکەمیان تایبەتە بە توخمەکانی بەرگری شەرعی و سەرچاوەکانی و چۆنیەتی گونجاندنی.

دووەمیشیان بۆ روونکردنەوەی گەشەسەندن و بناغە و شوێنەوارەکانی.

# دەروازەی یەکەم
# توخمەکانی بەرگری شەرعی و سەرچاوەکانی و گونجاندنی

بەرگری شـەرعی بریتیـە لەبـەرەنگار بوونـەوەی مەترسیەکی بـێ پاسـاو لـەکاتی رووداندیدا کەمەبەستی زیانگەیانـدن بێـت بـەمافێك کەشـەریعەتو یاسـا بـەهۆکارێکی گونجاو دەیپارێزن [١].

## توخمەکانی بەرگری شەرعی (عناصر الدفاع الشرعي):

تـوخمی هـەموو شـتێك بریتیـە لـەوەی شـتەکەی لەسـەری راوەسـتاوە لەپایـەو مەرجەکان، پایەکانی هەروەك لەپێناسەکەیەوە دەردەکەوێت سیانە: مەترسی، مـافێ: دەستدرێژی دەکرێتە سەر، بەرەنگاربوونەوەی بە هۆکارێکی گونجاو.

**پایەی یەکەم: مەترسی یەکەو، مەرجەکانی:**

مەترسـی بریتیـە لـە هەڕەشـەی زیانگەیانـدن بەبەرژەوەندییـەك کەشـەرعو یاسـا دەیپارێزنو، بەمەترسی دانانرێت تا ئەم شەش مەرجەی تێدا نەیەتەدی:

---

[١] چەندین پێناسەی جیاوازی بۆکراوە، ئەویش بەدەر نیە لەناڕوونیو کەمو کورتی، لەوانە: بریتییە لەرێگری روودانی دەستدرێژییەکی ناڕەوا لەکاتی رووداندیدا بەهێز، هەیە واپێناسەی کردووە: دوورخستنەوەی تاوانە بەتاوان، هەشیانە دەڵێت: وەڵامدانەوەی هێزە لەرێی هێزەوە، هەروەها وتراوە: ئەو مافەیە کەیاسای بڕیاری لەسەر داوە لەبەرانبەر هەڕەشەی دەستدرێژیدا کەبەهێزی پێویست وەڵامی بداتەوە.

١. دەبێ مەترسی یەکە کارێکی ناڕەوا بێت بەوەی هیچ پاساوێکی نەبێت، لەسەر ئەم بنەمایە سەرباز ئەو مافەی نیە کەلەسەر فەرمانی گەورەکەی کەداوای لێکردووە بەرەو هێڵی پێشەوە بڕوات لەگۆڕەپانی شەڕدا لەدژی دوژمنی دەستدرێژیکار، بیانووی ئەوەیە کەڕووبەڕووی مەترسی کوشتن یاخو بەدیلگرتن یان هاوشێوەی دەبێتەوە، چونکە ئەو کەسەی لەوکاتەدا فەرمانی پێدەکات لەحاڵەتێکدایە ئەو کارەی فەرمانی پێکراوە لەسەری پێویستەو، ڕێسای شەرعیش وا پێویست دەکات ئەگەر بەرژەوەندی گشتیو بەرژەوەندی تایبەتی یەکیان نەگرتەوە ئەوا لەپێشترە کەبەرژەوەندی گشتی بخرێتە پێش بەرژەوەندی تایبەتیەوەو بەرگەی ئەو زیانەتایبەتە بگرێت لەپێناوی دوورخستنەوەی زیانە گشتیەکە[1].

بەهەمان شێوە ئەو کەسەی فەرمانی سزادانی بەسەردا سەپێنراوە بۆی نیە بەرەنگاری جێبەجێکردنی ببێتەوە، بەبیانوی ئەوەی ڕووبەڕووی مەترسی دەبێتەوە، ئەگەر هاتوو حوکمەکە دادپەروەرانە بوو، بەهەمان شێوە بۆ منداڵ نیە بەبیانووی ڕووبەڕووبوونەوەی مەترسیەوە بەرەنگاری باوکودایکی ببێتەوە لەکاتێکدا تەمبێی دەکەن، لەکاتێکدا تەمبێکردنەکە لەسنووری ڕەوای خۆیدا بوو، کاری دیکەی تری لەو شێوەیە.

٢. دەبێت سەرچاوەی مەترسیەکە بونەوەرێکی زیندوو بێ وەك مرۆڤ یاخود ئاژەڵ[2]، ئەگەر هاتوو سەرچاوەکە بوونەوەرێکی زیندوو نەبوو وەك

---

[1] مجلة الاحكام العدلية: المادة(٢٦).

[2] واتە ئیدی سەرچاوەکەی موسڵمان یا ناموسڵمان بێت، بچوك یا گەورە، عاقڵ یا شێت، نێر یا مێ بێت، بەڵام زانایانی شەریعەت لەبارەی ئەو جێکەوتەی لێی دەکەوێتەوە بۆچوونیان جیاوازە:

کۆمەڵێ زانایان وتوویانە: هیچ گرەنتی تیا نیە، واتە نەلەڕووی مەدەنیەوە نەلە ڕووی تاوانییەوە لێپێچینەوەی لەسەر نیە. الشرح الكبير للدردير مع حاشية الدسوقي: ٣\٣٥٧، مغني المحتاج إلى معرفة ←

لەحاڵەتەکانی ئاگرکەوتنەوەو لافاوو بومەلەرزەو هاوشێوەکانیدا، ئەوا ئەو کەسەی رووبەڕوی مەترسیەکە بۆتەوە لەحاڵەتی پێویستیدایە بەبێ بەرگری شەرعی، ئەگەر لەو کاتەدا ماڵێك (مال)ی بەزایەدا یاخود لەپێناوی رزگارکردنی خۆیدا زیانی بەکەسێکی تر گەیاند ئەوا لەرووی تاوانکاریەوە لەسەر ئەو زیانگەیاندنە لێپرسینەوەی لەگەڵ ناکرێتو سزا نادرێت، بەڵام لەرووی مەدەنیەوە لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکرێت، لەسەری پێویستە ئەو قەرەبووە بداتەوە کەزیان لێکەوتوو داوای دەکات، چونکە پێویستبوون (الضرورة) لەرێگریەکانی بەرپرسیارێتی تاوانکارییە نەك لە هۆکارمکانی رێگەپێدانی بێت.

مەرج نیە مرۆڤەکە عاقڵو باڵغ بێت، چونکە دوورخستنەوەی مەترسی شێت یاخود منداڵی ناهەراش (صبی غیر ممیز) بەرگری شەرعیە ئەگەرهاتوو مەرجەکانی دیکەی تێدا هاتبووە دی، بەهەمان شێوە ئەگەر مرۆڤ رووبەڕووی مەترسی گیانلەبەرێك بوویەوە کەپەلاماری دا، لەو کاتەدا ئەگەر گیانلەبەرەکەی کوشت بەجۆرێك کە جگە لەکوشتن چارەی تری نەبوو بۆ دوورخستنەوەی مەترسیەکە ئەوا لەڕووی تاوانکاریو مەدەنیشەوە لێپرسینەوەی لەگەڵ ناکرێت.

---

القاظ المنهاج للشیخ محمد الشربیني، المبسوط للطوسي—کتاب الدفع: ص٦٢٥، الروض النضیر للعلامة شرف الدین أحمد بن الحسین الصنعاني :١٠١\٣، المغني لإبن قدامة: ١٦٢\٩، ئەبو حەنیفە وتوویەتی : ئەگەر سەرچاوەی مەترسیەکە منداڵ بێ یا شێت یا ئاژەڵ بوو ئەوا لەرووی تاوانکاریەوە لێپرسینەوەی تیا نیە بەڵام لەرووی مەدەنیەوە تێیدایەو لە منداڵو شێتدا خوێنبایی پێویست دەکات لە ئاژەڵدا قەربوو، چونکە کاری ئەو سێ سەرچاوەیە بەتاوان ناونابرێت. تبین الحقائق للزیلعي:١١٠\٦. محەمەد شەیبانی هاوەڵی ئەبو حەنیفە هاوڕایە لەگەڵ کۆمەڵی زانایان، بۆچوونی پەسەند کەلەگەڵ رۆحی شەریعەتدا یەك بگرێتەوە بۆچوونی کۆمەڵێ زانایانە.

٣. نابێت ئەو کەسەی ڕووبەڕووی مەترسیەکە بۆتەوە توانای داوای یارمەتی لەکەسانی تر هەبێت وەك دەسەڵاتی گشتی یان کەسی تر، چونکە مافی بەرگری شەرعی هەڵاوێرد(استثناءٌ)ەو دروست نیە بەکارهێنانی لەو حاڵەتانەدا نەبێت کەدەسەڵاتی گشتی یاخود کەسی تر کەتوانای ڕزگارکردنی هەبێت بەبێ ئەوەی ئەویش تووسی مەترسی ببێت لەوێدا بوونی هەبێت.

٤. دەبێت مەترسی یەکە دەست بەجێ بێت، دەستبەجێی لە یەکێك لەم دوو حاڵەتەدا دەبێت:

أ- لەوەبچێ ڕووبداتو هێشتا ڕووی نەدابێت.

ب- دەستدرێژیەکە بەکردار ڕووبداتو بەردەوام بێو هێشتا کۆتایی نەهاتبێ، ئەگەر ڕوویداو کۆتایی وەك ئەوەی تاوانێکی کاتی بێو بەردەوام نەبوو ئەوا ڕۆڵی بەرگری لەمافی بەرگریدن کۆتایی دێتو، ڕۆڵی دەسەڵاتی گشتی بۆ لێپێچینەوە لەتاوانبارەکەو سزادانی دەست پێدەکات، پاش ڕوودانی تاوانەکە هەرکارێك لەدژی ئەنجام بدرێت بەدەرچوون لەسەر سەروەری دەوڵەت دادەنرێت لەلایەن دەستدرێژی کراوە سەرەوە چونکە بەرگری شەرعی نە سزادانە نە تۆڵەسەندنەوە -دەسەڵاتی سزادان تەنها دەوڵەت هەیەتی- تاوانیش پاش ڕوودانی دەکەوێتە ژێر سایەی دەسەڵاتی دادگا.

٥. دەبێت مەترسیەکە بۆ سەر بەرژەوەندییەك بێت کەبەپێی یاسا پارێزراو بێت، بۆ نمونە بۆ دەرمانساز دروست نیە بەگری لەدەرمانە بەسەرچووەکانی بکات ئەگەر یەکێك لەناوی بردن، بەهەمان شێوە بۆ بازرگان نیە بەرەنگاری ئەو کەسە ببێتەوە کە ئەو خۆراکانەی بەسەرچوونو بەکەڵکی بەکارهێنان نەماون وەك پاراستنی تەندروستی گشتی لەناویان دەبات.

٦. نا بێت مەترسیەکە پـێش کۆتایهـاتنی بەرگریـە شـەرعیەکە کۆتـایی هاتبێـت، ئەگەر دەستدرێژیکارەکە پێش جێبەجێکردنی مەترسیەکە هەڵاتبوو، ئـەوا بـۆ بەرگریکار نیە شـوێنی بکـەوێت، بـەڵکو مـافی بەرزکردنـەوەی سـکاڵای هەیـە لەدژی لەدادگا، بـەڵام ئەگـەر دز هـەڵاتو بەشـێکە لەماڵـە دزراوەکـەی لەگـەڵ خۆی بردبوو ئەوا بۆ ماڵ دزراو بۆی هەیە شوێنی بکەوێت، چونکە لـەو کاتـەدا مەترسیەکە هەیەو تاوانکاریەکە بەردەوامە.

٧. دەبێت مەترسیەکە راستەقینە بێت، ئەگـەر خـەیاڵ (وهـم)ی بـوو ئـەوا نابێـت لەسەر بنەمای ئەو مەترسیە خەیاڵیە زیان بەکەسی تر بگەیەنرێت، بەڵام ئەگەر مەترسیە خەیاڵیەکە لەسەر بنەمای چەند هۆکارێك مـاقوڵی بـڕوا پێهێنـەر بـوو بەدادگا ئەوا بەرگریکار لەحاڵەتی مەترسـیدایە هەرچـەندە لەواقیعیشـدا بـوونی نەبێت.

تەنها ئەوە بەس نیە ئەو کەسەی ئەگەری تووشبوون بەزیانی هەیە کەهـەڵبێت چونکە ئـەوە لەنیشـانەکانی ترسـنۆکیەو ئـەوەش نەویسـتراوە، بـەڵام ئەگـەر دەستدرێژیکار لەخزمان یاخود ژنو مێرد یەکێکیان بێت ئـەوا چـەند لەتوانایـدا بێت باشتر وایە هەڵبێت.

**پایەی دووەم: ئەوەی دەستدرێژی کراوەتە سەر بەرژەوەندیەک بێت لەو بەرژەوەندیانەی شەرع و یاسا دەیپارێزن**

**(أن يكون محل الاعتداء مصلحة من المصالح المحمية في الشرع والقانون):**

ئـەو بەرژەوەندیانـەش وەك ئـاینو ژیـانو نـاموسو مـاڵو عـەقڵ، چـونکە ئـەم بەرژەوەندیانە بەبەرژەوەندیە پێویستەکانی ژیـان نـاوزەد دەکـرێنو لەمەبەسـتەکانی شەریعەتی ئیسلامینو پاراستنیان پێویستە ئیدی بۆ بەرگریکار بگەڕێتەوە یـاخود بـۆ کەسی جگە لەو، لەسەر مرۆڤ پێویسـتە بـەرگری بکـات لـەئاین هـەرکاتێ رووبـەرووی دەسـتدرێژی کرانـە سـەر بوویـەوە بەقسـە یـاخود کـرداروو بـەرگری لـەژیانی خـۆیو

کەسانی ترو ناموسی خۆیو کەسانی دیکەو ماڵی خۆیو ماڵی کەسانی تریش بکات، مەرج نیە پەیوەندی خزمایەتی هەبێت لەنێوان بەرگریکارو ئەو کەسەی یارمەتی دەدات لەبەرگری کردنەکەدا، بەڵکو پێویستە بەرگری لەکەسانی تریش بکرێت ئیدی لەخزمان بوون یان نا جیاوازی نیە[1].

**پایەی سێیەم: وەڵامدانەوە بەهۆکارێک کەگونجاو بێت لەگەڵ رادەو چۆنیەتی مەترسیەکەدا (الدفع بوسیلة تتناسب مع الخطر کماً وکیفاً):**

لەگرنگترین مەرجەکانی:

١. دەبێت بەرگریکار بەکەمترین شت وەڵام بداتەوە، ئەگەر کرا بەقسە وەڵام بدرێتەوە ئەوا دروست نیە کردار بەکار بهێنرێت، ئەگەر توانرا بەلێدانی بریندارنەکار وەڵام بدرێەوە ئەوا نابێت پەنا ببرێت بۆ لێدانی بریندارکار، ئەگەر کرا بەلێدانی بریندارکار وەڵام بدرێتەوە ئەوا ئەو مافەی نابێت بەرگریکار پەنا بۆ هۆکاری کوشتن ببات، زانایانی شەریعەتو یاسا لەسەر ئەمە هاودەنگن، یاساکانی سزادانیش حاڵەتەکانی رێگەپێدانی کوشتنیان لەبەرگریدا دیاری کردووە[2].

---

[1] رد المحتار لابن العابدين: ٥\٤٨١، المحلى لابن حزم الظاهري: ١١\١٣ ، الشرح الكبير مع حاشية الدسوقي: ٤\٣٥٧.

[2] لەو یاسایانەش، یاسای سزادانی عێراقی ژمارە ١١١ی ساڵی ١٩٦٩ز ، لەدەقی مادە (٤٣)دا هاتووە: (مافی بەرگری رەوا لەخۆ رێگە بەکوشتنی بەئەنقەست نادات مەگەر مەبەست دوورخستنەوەی یەکێك لەم سێ کارە بێت:

١. کارێك بێت ترسی ئەوە هەبێت کە ببێتە هۆی مردن یا برینێکی سەخت ئەگەر ئەو ترسە هۆکاری ماقوڵی هەبوو.

٢. چوونەلای ئافرەتێك لەپێشەوە یان پاشەوە یان چولای نێرینەیەك بەزۆرەملێ.

٣. رفاندنی مرۆڤ.)

لە مادە (٤٤)دا هاتووە کە : (مافی بەرگری رەوا لەماڵ رێنادات بەکوشتنی بەئەنقەست مەگەر مەبەست لەوەڵامدانەوەکە دوورخستنەوەی یەکێك لەم دوو کارە بێت:

←

٢. رادەی پێویست بۆ بەرەنگاربوونەوەی مەترسیەکە تێنەبەڕێنرێت، چونکە بەرگری ڕەوا رێگەنادات بەدروستکردنی مەترسیەکی زیاتر لەوەی بەرگریە ڕەواکە پێویستی دەکرد، ئەگەر بەرگریکار بەئەنقەست یاخرد بەفەرامۆش کردن (اهمال) سنووری رادی پێویستی و تێپەراند ئەوا بەدەستدرێژیکار دادەنرێتو بەرپرسە لەوەی کەبەهۆی ئەو تێپەراندنەوە روودەدات، چونکە رێپێدانی کاری تاوانکاری بەکارهاتوو لەبەرگری رەوادا هەڵوێردە بۆ پێویستبوون، پێویستبوونەکانیش بەرادەی پێویست بوونیان مەزەندە دەکرێن[1]، قورئانی پیرۆزیش جەختی لەسەر هاوشێوەیی بەرگریو دەستدرێژی کردۆتەوە لەرووی چەندایەتیو چۆنایەتیەوەو، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿...فَمَنْ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ...﴾[2] ، لەئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿...وَمَنْ جَاءَ بِالسَّيِّئَةِ فَلاَ يُجْزَى إِلاَّ مِثْلَهَا وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ﴾[3].

## سەرچاوەکانی بەرگری رەوا (مصادر الدفاع الشرعي):

سەرچاوەکانی رێپێدانی کاری نارەوا لەبەرگری رەوادا لەشەریعەتی ئیسلامیدا بریتیە لە: قورئانو سوننەتی پێغەمبەرو کۆدەنگیو مەعقول:

---

١. ئاگرخستنەوەی بەئەنقەست.
٢. تاوانکاری دزی.
٣. چونە ژوورەوە بەشەودا بۆ ماڵێك کەخەڵکی تێدا بێت یاخود بۆ یەکێك لەبەشەکانی.
٤. کارێکە ترسی ئەوە هەیە لەکاتی مردندا روویدات یاخود برینی سەخت ئەگەر هاتوو ئەو مەترسیە هۆکاری مەعقولی هەبوو.)

[1] مجلة الاحكام العدلية : المادة (٢٢).
[2] سورة البقرة : ١٩٤ .
[3] سورة الانعام: ١٦٠.

**یەکەم: قورئانی پیرۆز :**

لەقورئانی پیرۆزدا وشەی (دفع)و چاوگەکانی لەچەندین ئایەتدا هاتووە، لەوانە:

أ. خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿...وَلَوْلاَ دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَفَسَدَتْ الأَرْضُ وَلَكِنَّ اللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْعَالَمِينَ﴾[1]، واتە ئەگەر خوای گەورە هەندێك لەمرۆڤەکانی بەرەنگاری هەندێکی تر نەکردایەتەوە بەسەرکەوتنی خەڵکە باشەکان بەسەر خراپەکاراندا ئەوا سەرزەوی خراپ دەبووو ژیان تێکدەچووو خراپەکاری بڵاو دەبوویەوە بەڵام خوای گەورە باشەی هەیە بەسەر بروادان.

ب. خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿...وَلَوْلاَ دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ[2] بِبَعْضٍ لَهُدِّمَتْ صَوَامِعُ[3] وَبِيَعٌ[4] وَصَلَوَاتٌ[5] وَمَسَاجِدُ[6] يُذْكَرُ فِيهَا[7] اسْمُ اللَّهِ كَثِيرًا وَلَيَنصُرَنَّ اللَّهُ مَنْ يَنصُرُهُ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾[8].

ج. خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ السَّيِّئَةَ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَصِفُونَ﴾[9].

د. خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَلاَ تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلاَ السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ، وَمَا يُلَقَّاهَا إِلاَّ الَّذِينَ صَبَرُوا

---

[1] سورة البقرة : ٢٥١ .

[2]: ﴿بَعْضَهُمْ﴾ لەبری (الناس) واتای هەندێکو هەموو دەدات، (لولا)ش (حرف امتناع لوجود)ە. و(دفع)یش ( مبتدأ)یە. (خبر)یش ( محذوف تقديره موجود)، دلنەپاڵی (دفع) بۆ پاش خۆیلەدلنەپاڵی چاوگە بۆ بکەرەکەی.

[3] کۆی (صومعة)یە، بریتییە لەو ماڵانەی کەراهیبەکان بۆ پەرستش خۆیان تێدا پەناگیر دەکەن، وتراویشە مەبەست لێی شوێنی پەرستشی صائبیەکانە.

[4] کڵێسای مەسیحیەکان.

[5] کڵێسای جولەکەکان.

[6] مزگەوتی موسڵمانان.

[7] واتە ئەو شوێنانەی باسکران لەشوێنی پەرستشەکان.

[8] سورة الحج : ٤٠ .

[9] سورة المؤمنون : ٩٦ .

وَمَا يُلَقَّاهَا إِلاَّ ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ﴾[1]، واتە: كردەوەی چاكو كردەوەی خراپ وەك يەك نين، ئەگەر خراپەيەك هاتە سەر ريّت بەچاكەيەك لای بدە، چونكە ئەوە زۆر كاريگەری زياترە لەوەی بەخراپە لابدريّت كەبەزۆری خراپەو خراپەكاری ليّدەكەويّتەوە، قورئانی پيرۆز پاساوی رەتدانەوەی خراپەی بەچاكە بەوە هيّناوە كەئەوەی دوژمنايەتيت هەيە لەگەڵی وەك برايەكی دايكو باوكی ليّ بكات لەگەڵت، پەنديّكی پيّشينانيش هەيە دەڵيّت: خۆشەويستی پاش رق ليّبون شيرينترە لەپاقلاوە.

ئەم ئايەتەو ئايەتەكانی تر لەبابەتی بەرگريدا بەڵگەيەكی روونن لەسەر ئەوەی ئيسلام ئاينی ئاشتيەو ئاينی بانگەشەيە بەوەڵامدانەوەی خراپە بەچاكە نەك ئاينی توندوتيژیو ترساندن، ئاينی بەرگريە نەك ئاينی دەستدريّژی، ئاينيّكە لەبری سزادانو تۆڵەكردنەوە بانگەشە بۆ چاكسازی دەكات، هانی خەڵكی دەدات لەسەر وەڵامدانەوەی خراپە بەچاكە لەبری ئەوەی بەخراپە وەڵامی بدەنەوە، بەڵام ئەگەر هاتوو پەيرەوكردنی ئەم شيّوەيە لەرووی كرداريەوە هيچ سوديّكی نەبوو ئەوا فەرمان دەكات خراپەكە بەخراپە وەڵام بدريّتەوە، خوای گەورە دەفەرموويّت: ﴿...فَمَنْ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ...﴾[2].

لەبەر ئەوە ئيسلام ئاينی ميانرەوە لەنيّوان توندوتيژی ريّنوێنيەكانی ئاينی جولەكەو ليّبوردەيی ئاينی مەسيحی، يەكەمجار فەرمان دەكات بەليّبوردەيی ئەگەر سوودی نەبوو ئەوا پيّويستە پەنا بۆ هيّز ببريّت.

بەرگريكردنيش لەئاين بەو جۆرە نيە كەزۆريّك لەموسڵمانان ليّی تيّگەيشتوون كەلەسەر موسڵمان پيّويستە چەك هەڵبگريّتو بەسەر زەوی خوادا بيّتو بچيّتو

---

[1] سورة فصلت : ٣٤–٣٥ .

[2] سورة البقرة : ١٩٤ .

بەهەموو ئەوانەی موسڵمان نین بڵێت (موسڵمان ببە ئەگەرنا دەتکوژم)، چونکە خوای گەورە رازی نیە بەبەکارهێنانی هێز بۆ سەپاندنی ئاینی ئیسلام بەسەر خەڵکدا، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنْ الغَيِّ...﴾[1]، بەپێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویت: ﴿...أَفَأَنْتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ﴾[2]، هەمزەکە لەم ئایەتەدا بۆ پرسیارکردنی نەرێنیە.

پاشان ئیسلام لەدوو پێکهاتەی مادیو مەعنەوی پێکدێت، پێکهێنەری مەعنەوی باوەڕهێنانی جەخت لێکراوی چەسپاوی هاوتای واقیعە وەك باوەڕهێنان بەخوداو هەموو ئەوەی لێی دەکەوێتەوە لەپەنهان (غەیب)ەکان، پێکهێنەری مادیش بریتیە لە کردەوە چاکەکان.

لەبەر ئەوە ئەگەر زۆرلێکردن زاڵبوو بەسەر جەستەی مرۆڤدا ئەوا ناتوانرێت بەسەر ناواخنیدا زاڵ ببێت، بگرە زۆرلێکردن لەئایندا دەبێتە هۆی پێکهێنانی مرۆڤی دووڕوو کەرووکارەکەی پێچەوانەی ناواخنەکەیەتی، ئەمەش مەترسی لەدوژمن زیاترە، لەبەر ئەوە دەبینین سەدان ئایەتی قورئانی پیرۆز هەیە کەبەرپرسیارێتی پێغەمبەر (ﷺ)و ئومەتەکەی تەنها لەراگەیاندن (تبلیغ)دا کورت دەکاتەوە، لەنمونەی ئەو ئایەتانەش: ﴿...وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاَغُ...﴾[3]، لەئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿...فَإِنْ تَوَلَّيْتُمْ فَاعْلَمُوا أَنَّمَا عَلَى رَسُولِنَا الْبَلاَغُ الْمُبِينُ﴾[4]، هەروەها دەفەرموویت: ﴿مَا عَلَى الرَّسُولِ إِلاَّ الْبَلاَغُ...﴾[5].

---

[1] سورة البقرة : ٢٥٦ .

[2] سورة يونس : ٩٩ .

[3] سورة آل عمران : ٢٠ .

[4] سورة المائدة : ٩٢ .

[5] سورة المائدة : ٩٩ .

هەموو ئەو ئایەتانەی فەرمان بەشەڕکردن لەگەڵ هاوبەش پەیداکاران دەکات بۆ حاڵەتەکانی بەرگری ڕەوان لەئاین و پاراستنی گیان و ناموس و سەروماڵی موسڵمانان کاتێ لەلایەن دوژمانەوە پەلامار دەدرێن.

خوای گەورە فەرمان دەکات لەبانگکردنی خەڵکی بۆ موسڵمانبوون لەڕێگەی دانایی و ئامۆژگاری باشەوەو دەفەرمووێت: ﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾[1].

هیچ ڕۆژێك لەڕۆژان ئیسلام ئاینی دەستدرێژی و ترساندن نەبووە بەڵکو ئاینی لێبوردەیی و ئاشتی بووە، قورئانی پیرۆز بەکارهێنانی هێزو پەنابردنە بەر توندوتیژی بەهەنگاوەکانی شەیتان ناوبردووە، لەمبارەیەبشەوە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ادْخُلُوا فِي السِّلْمِ كَافَّةً وَلاَ تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ﴾[2]، ئەو تۆقاندن (ئیرهاب)ەی لەقورئاندا هاتووە لەم ئایەتەدا: ﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِنْ دُونِهِمْ لاَ تَعْلَمُونَهُمُ اللَّهُ يَعْلَمُهُمْ وَمَا تُنفِقُوا مِنْ شَيْءٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنْتُمْ لاَ تُظْلَمُونَ﴾[3] بەمانای ترساندنە نەك بەو واتایەی کەلەم سەردەمەدا هەیە، چونکە دوژمنەکەت ئەگەر زانی تۆ ئەو هێزەی بەرگریت هەیە کەئەو هەیەتی یاخود زانی کەتر لەو بەهێزتری ئەوا دەترسێت لەوەی دەستدرێژی چەکداریت بکاتە سەر.

باشترین نمونەش لەم سەردەمەدا وڵاتی هیندستانە کەدەهێندەی پاکستان ژمارەی دانیشتوانی زیاترەو ناکۆکی نێوانیان کەبەجەنگی سارد ناو دەبرێت ماوەیەکی زۆرە بەردەوامە، سەرەڕای ئەوە بوێری ئەوەی نیە هێرشی چەکداری بکاتە

---

[1] سورة النحل : ١٢٥ .

[2] سورة البقرة : ٢٠٨ .

[3] سورة الانفال : ٦٠ .

سـەر پاكسـتانو خاكەكـەی لەبـەر ئـەوەی ئـەویش وەك هیندسـتان خـاوەن چـەكی ئەتۆمیە، بەهەمان شێوە سەبارەت بەئەمریكاو كۆریای باكور، ئەم ئایەتـە بەنزیكـەی نۆسەد سـاڵ پـێش دۆزرانـەوەی ئـەمریكا دابـەزیووەو فـەرمان بەموسـڵمانان دەكـات لەهەموو سەردەمو جێگایەك هێزی پێویست ئامادە بكەن، ئەگـەر ئـەم فەرمانـەی خوای گەورەیان جێبەجێ بكردایە ئەوا ئەمرۆ سەرشۆری ژێردەستی بێگانـەی دوژمـن نەدەبوون.

**دووەم: سوننەتی پێغەمبەر:**

سوننەتی پێغەمبەر هاتووە تاجـەخت لـەوە بكـات كەلـەقورئانی پـیرۆزدا هـاتووە لەوەی رێپێدانی بەرگری رەوایە ئەگەر پایەو مەرجەكانی تێدا بوو، لـەو فەرموودانـەی پێغەمبـەر (ﷺ) كەبەڵگـەی بنـبرە دەفـەرموێت: ((لـو ان إمـرأً اطلـع عليـك بغـير إذن فحذقته[1] بحصاة ففقأت عينه لم يكن عليـك جنـاح))[2]، هـەروەها ئـەو فەرموودەیـەی كەدەفەرمووێت: ((من قُتل دون ماله فهو شهيد، ومن قُتل دون أهله[3] فهو شهيد، ومن قُتل دون دينه فهو شهيد، ومن قُتل دون دمه فهو شهيد))[4]، واتـە: هەركـەس لەسـەر بەرگری لـەماڵی كـوژرا شـەهیدە، هەركـەس لەسـەر بـەرگری لـەخزمو كەسـی كـوژرا شەهیدە، هەركەس لەسەر ئاینی كوژرا شەهیدە، هەركەس لـەكاتی بـەرگری لـەخۆی كوژرا شەهیدە.

---

[1] واتە: لێدانی.

[2] بڕوانە: مسند أحمد: ٢\٢٤٣، ٤٢٨، وسنن البيهقي الكبرى: ٨\٣٣٨.

[3] واتە: ناموسی.

[4] مسند الامام احمد: ١\١٩٠، دار الصادر،بيروت، ئەم فەرموودەیە بەگێڕانەوەی تریش هاتووە لە: الترمذي: ٢\٤٣٦،دار الفكر،ط٢، ١٤٠٣هـ، بيروت، وسنن أبي داود، ٢\٤٣٠، تحقيق سعيد محمد اللحام، دار الفكر، ط١، ١٩٩٠، بيروت.

**سێیەم: کۆدەنگی (الإجماع):**

زانایـانی شـەریعەتی ئیسـلام لەسـەرەتای هـاتنی ئیسـلامەوە کـۆدەنگن لەسـەر ڕەوایەتی بەرگری ڕەوا لەدژی دەستدرێژی بۆسەر ئاین‌و ژیان‌و ناموس‌و ماڵ‌و عـەقڵ، ئەمەش بەپشت بەستن بەدەقی ئایەتەکانی قورئانی پـیرۆزو فـەرموودەی پێغەمبـەر، لەسەر ئەوەش کەئەو کـاری تاوانکاریـەی کەلەبـەرگری ڕەوادا بـەکاردێت لەخەسـڵەتە تاونکاریەکەی رادەماڵدرێت چونکە پایەو مەرجەکانی تێدا هەیە.

لەگەڵ ئەوەشدا ناونانی ئەم هاودەنگی (اتفاق)ە بەکۆدەنگی (اجماع) ناولێنـانێکی مەجازییە، چونکە کۆدەنگی لەزاراوەی ئوصولیدا هاودەنگی موجتەهیدەکانی ئومەتی موحەمەدە لەسەردەمێك لەسەردەمەکاندا پاش وەفاتی پێغەمبەر لەسـەر حـوکمێکی شەرعی کەبواری ئیجتیهادی تێدا هەبێت، حوکمەکـەش ئیجتیهـادی نابێـت لەکاتێکـدا نەبێت کەدەقی لەبارەوە نەبێت یاخود هەبوونی دەقێك کەبەڵگەکـەی گومـانی (ظـني الدلالة) بێت لەسـەر حوکمەکـە، لەسـەر بنـەمای ئـەو ڕێسـا شـەرعیەی کـەهاودەنگی لەسەرە: (لامساغ للاجتهاد في معرض النص)[1] واتـە: بـواری ئیجتیهـاد نیـە کـەدەق هەبوو.

**چوارەم: ماقوڵ (المعقول):**

عەقڵی ساغ وا دادەنێت کەبەرگری ڕەوا مافێکی فیترییـە کـەخوای گـەورە لـەکاتی دروسـتکردنی مرۆڤـەوە پێـی بەخشـیووە، لەسـەر مـرۆڤ پێویسـتە بـەکاری بهێنێـت ئەگەرنا ئەوا لای خوا گوناهبار دەبێت، پاشان هەموو ئەوەی قورئانی پیرۆز فـەرمانی پێدەکات بریتیە لەچاکەو هەموو چاکەیەکیش لەڕووی عەقڵیەوە پێویست (واجـب)ە، هەروەها هـەموو ڕێگـری لێکـراوێکیش بیـزراو (قبـیح)ە هـەموو بیـزراوێکیش لـەڕووی عەقڵیەوە قەدەغەکراوە.

---

[1] مجلة الاحكام العدلية :المادة(١٤) . والقانون المدني العراقي ، المادة(٢)

## جۆرەكانی بەرگری رەوا (انواع الدفاع الشرعي):

### بەرگری رەوا دابەش دەبێت بۆ تایبەتو گشتی:

**١- بەرگری رەوای تایبەت (الدفاع الشرعي الخاص):**

بریتیە لەو مافەی دەستدرێژی دەكرێتە سەر مافێكی تایبەت بێت، وەك دەستدرێژی بۆسەر كەسێك یاخود ناموسی یان مالّی، ئیدی ئەوە سەبارەت بەبەرگریكارەكە بێت یا جگە لەو، لەسەر مرۆڤ پێویستە بەرگری لەگیانی خۆیو گیانو مالّو ناموسی كەسانی تر بكات هەروەك چۆن بەرگری لەگیانو مالّو ناموسی خۆی دەكات.

**٢- بەرگری رەوای گشتی (الدفاع الشرعي العام):**

• بریتیە لەو بەرژەوەندییەی دەستدرێژی دەكرێتە سەر گشتی بێت، ئەم بەرگریە رەوایەش سەبارەت بەرەتكردنەوەی مەترسی ناوخۆیی بە (حسیبەو فەرمان بەچاكەو رێگری لەخراپە) ناودەبرێت، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنْ الْمُنْكَرِ وَأُوْلَئِكَ هُمْ الْمُفْلِحُونَ...﴾[1]، بەلاّم سەبارەت بەرەتكردنەوەی مەترسی دەرەكی ئەوا بەجیهاد لەپێناوی خودا واتە لەپێناوی بەرژەوەندی گشتی ناودەبرێت، لەو ئایەتانەی قورئانی پیرۆزیش كەفەرمان بەجیهاد (بەرگری رەوای گشتی) دەكات ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز: ﴿...وَجَاهِدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ...﴾[2]، واتە لەپێناوی بەرژەوەندی گشتی پێویستدا كەئەویش بەرژەوەندی پاراستنی ژیانو پاراستنی ناموسو پاراستنی مالّە، بەپێی

---

[1] سورة آل عمران : ١٠٤ .

[2] سورة التوبة : ٤١ .

ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز: ﴿فَمَنْ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾.

**ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزیش بەڵگەیە لەسەر ئەم حوکمانە:**

١) ڕێپێدان بەدوورخستنەوەی مەترسی بەر لەڕوودانی یاخود لەکاتی ڕوودانیدا کەبەردەوامەو هێشتا کۆتایی نەهاتووە.

٢) ڕێپێدان بەنەهێشتنی مەترسی پاش ڕوودانی بەلابردنی یاخود بەسزادانی دەستدرێژیکار یان بەناچارکردنی بەقەرەبوو.

٣) دەبێت بەرگریکار پابەند بێت بەوەی وەڵامدانەوەکەی هاوشێوە بێتو زیادەرەوی نەکات لەبەرگریکردندا سنووری نەبەزێنێت بەوەی وەڵامدانەوەکەی بەرادەی دەستدرێژیەکە بێت لەڕووی چەندایەتیو چۆنایەتیەوە، قورئانی پیرۆز جەخت دەکاتەوە لەسەر بەپابەندبوون بەم کۆتو بەندەوە: ﴿...وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾.

## گونجاندنی بەرگری ڕەوا (تكييف الدفاع الشرعي):

گونجاندنی بەرگری ڕەوا (یاخود بەرەنگاربوونەوەی پەلاماردەر) بۆچوونی فیقهی یاسایی و شەرعی لەبارەیەوە جیاوازە، ئاراستەی باو لەیاساو لەفیقهی یاسایدا ئەوەیە ئەم بەرگرییە مافێکە یاسا بەهەموو ئەوانەی داوە کەڕووبەڕووی مەترسیەکی نارەوا دەبنەوە، ئەگەر وازی لێ هێنا ئەوا لێپێچینەوەی لەسەر ناکرێتو لەڕووی تاوانکاری و مەدەنیەوە بەرپرسیار نابێت.

**لە فیقهی ئیسلامیشدا سێ بۆچوون هەیە:**

**یەکەمیان:** پێویست (واجب)ە چونکە خوای گەورە فەرمانی پێ کردووە: ﴿...فَمَنْ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ...﴾ هەموو فەرمانێکیش بۆ پێویست بوونە ئەگەر بەڵگەیەك نەبوو پێچەوانەی ئەوە بگەیەنێت.

**دووەم**: مۆڵەت (روخسەت)ە چونکە لەخۆیدا کارێکی نارەوایە بەهۆی بوونی بیانوو (عوزر)یەکەوە بۆتە رەوا، ئەمەش روخسەتە، ئاشکرایە کە روخسەت هەندێ جار پێویست (واجب) دەبێت، دەشبێت مەندوب بێت، دەشبێت رێپێدراو ( موباح) بێت.

**سێیەم**: بۆچوونی کۆمەڵی زانایانی شەریعەت کەئەویش وردکردنەوەیەتی بەمجۆرە:

ئەگەر ئەو مافەی دەستدرێژی کراوەتە سەر ئاین بوو یاخود ژیانی مرۆڤ یان سەلامەتی مرۆڤ یا ناموسی ئەوا بەرگریەکە پێویست (واجب) دەبێت، چونکە لەوەی دەستدرێژی کراوەتە سەر لەو حاڵەتانەدا مافی خودا تێیدا زیاترە لەمافی مرۆڤ، ئەگەرهاتوو ئەو مافەی دەستدرێژی کراوەتە سەر مافێکی ماڵی بوو ئەوا بەرگریکردن لێی مافێکی تایبەت دەبێت بۆ خاوەنەکەی لێی گەراون، گەر ویستی لەسەر بوو بەرگری لێدەکات، ئەگەر ویستیشی لەسەری نەبوو لێیَ ناکات، ئەم وردکردنەوەیەش پەسەندکراوە لەبەر یەکگرتنەوەی لەگەڵ رۆحی شەریعەتی ئیسلامیو دادپەروەریو واقیعی فیتریدا.

**بەرهەمی جیا راییەکە** (ثمرة الخلاف): بەرگری رەوا ئەگەر وا گونجێنرا کە روخسەتە ئەوا بەرپرسیارێتی مەدەنی هەڵناگرێتو لەرووی سزایی (جەزائیەوە) لێپێچینەوەی لەگەڵ ناکرێت بەڵام لەرووی مەدەنیەوە بەرپرسیار دەبێت ئەگەر زیانێکی بەدەستدرێژیکار گەیاند، ئەگەر واش گونجێنرا کەمافێکە ئەوا دەستدرێژی کراوە سەر سەرپشك دەکرێت لەوەی ئەو مافە بەکار دێنێت یاخود وازی لێدێنێت، لەبارەی بەکارهێنانی مافەکە یان بەکار نەهێنانی لێپێچینەوە لەگەڵ بەرگیریکار ناکرێت، بەپێچەوانەی ئەوەی ئەگەر پێویست (واجب) بوو ئەوا پرسیاری لەسەر وازلێهێنانی لێدەکرێتو لێپێچینەوەشی لەگەڵ ئەنجام دەدرێت لەسەر وازلێهێنانی.

# دەروازەی دووەم:
# گەشەسەندنی بەرگری ڕەواو بناغەو جێکەوتەکانی

## (تطور الدفاع الشرعي وأساسه وآثاره)

بەرگری ڕەوا لەدژی دەستدرێژی و مەترسی نارەوا ئارەزوو (غەریزە)ەیەکی سروشتیە بۆ هەموو تاکێکی زیندوو هەیەتی ئیدی مرۆڤ بێت یاخود گیانلەبەر.

لەکۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا بەرگری ڕەوا مافێکی تایبەت بوو، تاك خۆی ئەنجامی دەدا، یاخود بەهاوکاری لەگەڵ کەسانی تری ئەندامانی هۆزەکەی، ئەمە پێش هاتنە ئارای بیرۆکەی دەوڵەت کە مافی بەرگری لەو تاکانەی لەژێر سایەیدا بوو قۆرغ کراو بۆخۆی ئەمەش وەك رووکارێك لەرووکارەکانی سەروەری دەوڵەت، ئیدی بەرگری لەهەموو مافێك کە لەیاسادا پارێزراوبوو وەك بنەڕەتو رێسایەك بووە ئەرکێك لەئەرکەکانی دەوڵەت، بەڵام تاك وەك هەڵاوێرد (استثناء) لەو رێسایە بۆی هەبوو ئەم مافە بەکاربێنێت ئەو کاتەی دەستەڵات ئامادەبوونی نیەو لەکاتی دەستدرێژیەکەدا ناتوانرێت پەنای بۆ ببرێت، بەمەش بەرگری ڕەوا یەکەم وەك مافێکی سروشتی هاتە ئاراوە کەیاسا بریاری لەسەر داوەو تاك ئەنجامی دەدات لەبەر رۆشنایی رێکخستنی لەلایەن یاساوە کەچەندین قۆناغی بریوە ئەو رێکخستنەو سروشتی زیادەڕەوی‌و کەمڕەوی (الافراط والتفريط) بەخۆوە بینیووە[1].

[1] زیادەڕەوی: تێپەڕاندنی سنوور لەرووی زۆریەوە، کەمڕەوی: کەمتەرخەمییەو سنوور بەزاندنە لەکەمیدا.

وادیاره زیادەڕەوی و ڕێگەپێدانی بێسنوور لەبەکارهێنانی توندوتیژیو هێز بەبێ کۆت یاخود مەرجی روون لەیاسای ڕۆمانیدا ئەو کاتەی کەبەمافێکی سروشتی دادەناو یاسای سروشتی بەخشیبوویە ئەو کەسەی دەستدرێژی کراوەتە سەر بەبێ ئەوەی بیخاتە ژێر هیچ مەرج یاخود کۆتو بەندێك، ئەم رەهاییەش لەم گوتەیەی شیشرۆندا دەردەکەوێت[1]: (یاسا هیچ دەنگێکی نیە لەگۆرەپانی چەکدا).

هەروەها لەرێنوێنیەکانی مەسیحیەتدا بەزایەدان (تفریط)ی روون هەیە کەخەریك بوو خەسڵەتی بەرگری رەوا لەبووندا نەهێڵێت، نهێنی ئەمەش لەوەدایە ئەم رێنوێنیانە وەك کاردانەوەی ئەو توندو تیژیو گیانی تۆڵەسەندنەوەو وەڵامدانەوەی خراپە بەخراپەیە هات کەلەو کاتەدا هەبوو بەجۆرێك بەرگری رەواکە توندترو مەترسیدارتر بوو.

لەشاهێدیەکان لەسەر رووی بەزایەدان لەبەرگری رەوا لەبەر رۆشنایی ئەو رێنوێنیانەدا ئەوەی کەلە سەردەمی نوێ (عهد الجدید)ی (ئینجیلی مەتا)دا هاتووە[2] و ئەمە دەقەکەیەتی: (وأما أنا فأقول لكم لاتقاوموا الشر، بل من لطمك على خدك الايمن فحول له الآخر، ومن اراد ان يخاصمك وياخذ ثوبك فاترك له الرداء ايضاً، ومن سخرك ميلاً واحداً فاذهب معه اثنين)، واتە: بەڵام من پێتان دەڵێم وەڵامی خراپە مەدەنەوە بەڵکو ئەو کەسەی زلەیەکی لەروومەتی لای راستت دا ئەوا روومەتی چەپیشتی تێ بکە، هەرکەسێك رووبەرووت بوویەوە جلەکەت ببات ئەوا چاکەتەکەشتی پێ بدە، هەرکەس میلێك کاری زۆرەملێی پێ کردی ئەوا دوو میل لەگەڵی برۆ.

لەکۆمەڵگای عەرەبیشدا پێش هاتنی ئیسلام وەك هەر کۆمەڵگایەکی دیکە بەرگری رەوا تێیدا خۆی لەئارەزوو(غەریزە)ی تۆڵە سەندنەوە لەدەستدرێژیکارو هەموو

---

[1] السياسي الكاتب مارس توليوس الشهير ب(شيشرون)(١٠٦-٤٣ق.م) ، ينظر : في التيسير والتخيير بين الفلسفة العامة وفلسفة القانون للاستاذ الدكتور رؤوف عبيد، ط٢ ، ١٩٧٦: ص٣٨٧.

[2] الاصحاح الخامس فقرة : ٣٩-٤١ .

ئەوانەی سەربەهۆزو عەشیرەتەکەی بوون دەبینیەوە، دەتوانین بڵێین بەرگری رەوا بەواتا دروستەکەی بوونی نەبوو، ئەگەر تاکێکی سەر بەهۆزێك یان عەشیرەتێك دەستدرێژی بکردایەتە سەر تاکی هۆزێکی تر، وەڵامی ئەم دەستدرێژیە لەرێی تۆڵەسەندنەوە لەخودی کەسی دەستدرێژیکار یاخود هەر تاکێکی دیکە کەسەر بەهۆزەکەی بوو خۆی دەبینیەوە[1]، هەندێکجار دەستدرێژی تاکێك بۆ سەر تاکێکی تر دەبووە هۆی لێکەوتنەوەی خراپو جەنگی بەردەوام بۆ چەندین ساڵ لەنێوان هۆزی دەستدرێژیکارەکەو هۆزی دەستدرێژی کراوە سەر.

دواتر پاش تێپەربوونی ماوەیەك تۆڵەسەندنەوە گەشەی کرد بۆ بیرۆکەی دانە دەستی کەسی تاوانکار بەو هۆزەی دەستدرێژی کراوەتە سەر تاکێکیانو لەسایەی بەزەیی خەڵکی ئەو هۆزە یاخود ئەو عەشیرەتەدا دەبوو، بیانویستایە دەیانکوشت، ویستیان لەسەر بوایە دەیانکردە کۆیلەو وەك ئاژەڵ کرینو فرۆشتنیان پێ دەکرد.

پاش گەشەکردن کارەکە گۆرا بۆ خوێنبایی (دیە)، ئەمیش دەدرایە میراتگرانی ئەو کەسەی دەستدرێژی کراوەتە سەر، پاشان ئیسلام هاتو دانی بەبەرگری رەوادا نا هەروەك پێشتر لەو ئایەتانەی خستمانە روو باسمان کردو هەستا بەرێکخستنی بەرگری رەوا بەجۆرێك کەلەگەڵ دادپەروەریو رێزی مرۆڤو پاراستنی مافەکانیدا بگونجێت کەپێشتر ئەوەمان روون کردەوە.

بەرگری رەوا لەیاساکانی سزادانی وڵاتانی عەرەبیدا بەو جۆرە چارەسەر کراوە کەهەموویان هاودەنگن لەسەر ئەو بەرگریە ئەگەر هاتوو لەسایەی مەرجو کۆتەکاندا بوو نەك رەها بێتو زیادەرۆیی یان بەزایەدانی مافی تێدا بێت.

---

[1] فلسفة القانون الجنائي ، الاستاذ الدكتور علي راشد، محاضرات الدراسات العليا في القانون المطبوعة على رونيو: ص٢٥ وما يليها.

## بناغەی بەرگری رەوا (أساس الدفاع الشرعي):

زانایانی یاسا بۆچوونیان جیاوازە لەبنەرەتی نەبوونی بەرپرسیارێتی ئەو کەسەی بەرگری رەوا لەخۆی دەکات لەبەرانبەر ئەو کارەی بەرانبەری ئەنجام دەدرێتو لەبنەرەتدا کارەکەی ئەنجامی دەدات نارەوایەو شەرعو یاسا بۆیان بەرەوا داناوە لەو رووەوە کەتاکە هۆکارێکە بۆ دوورخستنەوەی ئەو دوژمنکاریەی دەکرێتە سەری، بەوەش هیچ بەرپرسیارێتیەکی تاوانکاریو مەدەنی لەسەر نابێتو هیچ سزاو قەرەبوویەکی ناکەوێتە ئەستۆ.

گرنگترین ئەو بۆچوونانەی لەمبارەیەوە وتراوە [1]:

**یەکەم: زۆرلێکردن (الإکراه)**

هەندێك بۆچوونیان وایە کەبنەرەت بریتیە لەزۆرلێکردن، چونکە ئەو کەسەی دەستدرێژی دەکرێتە سەر بەرگری لەخۆی دەکات بەرانبەر ئەو مەترسییە، دەستدرێژیکار لەژێر فشاری ئەو مەترسیەی لەدڵیدا ترس سەر هەڵدەدات پاڵی پێوە دەنێت ئەو کارە ناچارییە ئەنجام بدات وەك وەڵامدانەوەیەك بۆ دەستدرێژیەکەو ئەو راکێشراوە بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە بەحوکمی غەریزەکەیو هیچ تواناو دەستەڵاتێکی نیە لەوەدا جگە لەهەڵبژاردنی رێگەی بەرگری لەخۆ کردن، لەسەر ئەو بنەرەتە ناکرێت ئەوەی بدرێتە پاڵ کەکارێکی هەڵەی ئەنجام داوە، چونکە هەڵە یەکەم پایەیە لەدوو پایەکەی بەرپرسیارێتی تاوانکاریو مەدەنی، هەڵە نەبوون ئەوە دەخوازێت هەموو جۆرەکانی بەرپرسیارێتی لەئەستۆدا نەهێڵێت.

---

[1] بروانه: في المسؤولية الجنائية، للدكتور محمد مصطفى القللي، ص٣٠٤ وما يليها، والنظم السياسية، د.ثروت بدوي، ١٩٧٢: ص١٤٠، والقانون الجنائي، د.علي راشد، ص٣٤٠، وشرح قانون العقوبات –قسم الاول، د.محمود نجيب حسني: ص١٩٣.

**ئەم بۆچوونەش بەمجۆرە قسەی لەسەر کراوە:**

١. بێگومان بەرگریکار زۆرلێکراو ئەوەی کە دەیکات بە بژاردە و ویستی ئازادانەی خۆی و تێگەشتنی هۆشمەندانەی خۆیەتی، هۆکاری گونجاو بۆ وەلاّمدانەوەی دەستدرێژیەکەو دورخستنەوەی مەترسیەکەی هەڵدەبژێرێت، لەکاتێکدا زۆرلێکراو ئەوەی لەبەردەمدایە کارێکی بکات کەناچار کراوە بەکردنی یاخود بەرگەی دەستدرێژیەکە بگرێتو وەەلاّم نەداتەوە.

٢. ـ ئەگەر واماندانا دەستدرێژیکراوەسەر زۆری لێکراوە وەلاّمی دەستدرێژیەکە بداتەوە، ئەوا ئەو زۆرلێکردنە لەکاتی بەرگری لەبەرژەوەندی کەسانی تردا بەمەبەستی پاراستنی ژیانی یاخود ناموسی یا سامانی بەزۆرلێکردن دانانرێت، چونکە لەم حاڵەتەدا بە بژاردە و ویستی ئازادانەی خۆی بەم کارە هەستاوە، ئیدی زۆرلێکران لەم حاڵەتەدا لەکوێدایە؟!.

٣. ئەگەر وادانرا کەزۆرلێکران لەهەموو حاڵەتەکاندا هەبووە ئەوا بەهاودەنگی زانایانی یاساو شەریعەت زۆرلێکران لەرێگریەکانی بەرپرسیارێتی تاوانکاریە، ئیدی چۆن دەبێتە بناغە بۆ هۆکارێك لەهۆکارەکانی رێپێدان (اباحة)؟!.

**دووەم: پاداشتی خراپە بەخراپە ( مجازاة الشر بالشر):**

هەندێك وتوویانە ئەو کارەی بەرگریکار پێی هەڵدەستێت کارێکی تاوانکارانەیە کە بەهۆیەوە تاوانی دەستدرێژکار لە سەر خۆی لا دەبات، ئەمەش لە کرداری هەڵوەشاندنەوەی دووقەرزی بەرانبەر(مقاصە) دەچێت لە بابەتی (قەرزەکان و پابەندبوونی مەدەنیدا)، بناغەکە ئەوەیە کە لابردنێکە لە نێوان خراپەی دەستدرێژیکار و خراپەی دەستدرێژیلێکراودا، خۆ ئەگەر بەم شێوە یان بە سزادان لاچوو ئیتر هیچ پاساوێك نامێنێتەوە بۆ لێپێچینەوە لە بەرگریکار، چونکە پاداشتی خراپە بە خراپە نابێتە هۆی پاداشتی سزایی(الجزاء العقابي) و پاداشتی

مەدەنی(الجزاء المدني)، بۆیە بەرپرسیارێتی مەدەنی و سزایی رووبەرووی بەرگریکار نابێتەوە.

**ئەم بناغەیەش لە چەند روویەکەوە قسەی لەسەر دەکرێت:**

١. بێگومان لە هەڵوەشاندەوەی دوو قەرزی بەرانبەردا(مقاصە) دەبێ هەردولاکەی یەکسان بن و ئەمەش لە بەرگری شەرعیدا نایەتەدی کاتێك خراپەی دەستدرێژکار تەنها هەڕەشەکردن بێت بە مەترسییەکی هەنووکەیی و خراپەی دەستدرێژلێکراو رەنگە کوشتن بێت.

٢. سەرەرای ئەمانە ئەم بۆچوونە بەرگری شەرعی لەگەڵ مافی سزاداندا تێکەڵکردووە، یەکەمیان سزا نیە بەڵکو هۆیەکە بۆ لابردنی ترسناکیەکی نزیك.

٣. ئەگەر ئەوقسەیە راست بێت کە بەرگری شەرعی پاداشتی خراپەیە بە خراپە، ئەوا دەسەڵاتی گشتی رەوا نەبوو بۆی کە سزای دەستدرێژیکار بدات لەسەر تاوانی دەستدرێژیکردنی پاش وەڵامدانەوەی بە بەرگریکردن ئەگەر بەرگرییەکە نەبووە هۆی تیاچوونی یەکجارەکی جەستەی، چونکە ناکرێت دووجار کەسێك لەسەر تاوانێك سزا بدرێت، لە کاتێکا ئەگەر بەرگریکار پاش دەستدرێژیکردنی و دوورخرانەوەی ئەگەر لە ژیاندا بوو دەدرێتە دادگا بۆ لێپێچینەوە و لێپرسینەوەی.

**سێیەم: پارسەنگدانی مافی بەرگریکاری دەستدرێژی کراوە سەر(ترجیح حق المدافع المعتدی علیە):**

ئەم بۆچوونە پارسەنگی مافی بەرگریکاری دەستدرێژی کراوە سەر لەپاراستنی مافەکانی دەدات بەسەر مافی دەستدرێژیکاردا، لەسەر بناغەی بیرۆکەی هاوسەنگی نێوان مەسڵەحەتە دژبەیەکەکان، چونکە یاسا هەروەك مافی دەستدرێژی لێکراو دەپارێزێت مافی دەستدرێژیکاریش دەپارێزێت، بەڵام دەستدرێژیکەر بە دەسپێشخەریکردنی بە تاوان مافی خۆی لەدەست داوە، بۆیە یاسا بە رەوای دەزانێت

کــه مــافی کەمنرخ(مەســڵەحەتی دەســتدرێژیکار) بکاتــە قــوربانی بــۆ پاراســتنی مەسڵەحەتی نرخدارتر و گرنگتر(مەسڵەحەتی دەستدرێژی بەسەرداکراو).

**ئەم بۆچوونەش لە چەند روویەکەوە رەخنەی لێدەگیرێت:**

١. ئەسڵ لە یاسادا ئەوەیە کە هەموو مافەکان دەپارێزێت بە چاوپۆشی لە پلەی گرنگیان.

٢. ئەگەر ئەوە راست بێت کە دەستدرێژیکار رێزی لەدەست دەدات وەك ئەو مافەی کە دەستدرێژی کردۆتە سەر، ئەوا ئەنجامی لۆجیکی ئەوەبوو کە سامانی دز هیچ نرخێکی یاسایی نامێنێت بە هۆی دەستدرێژیکردنە سەر سامانی کەسانی ترەوە و، ئەو کەسەی تاوانی نامـوسی دەکات نرخێکی یاسایی بۆ نامـووسی نامێنێت و...هتد. ئەمەش لە لۆجیکی شەرع و یاسادا نیە.

٣. ئەم لێکدانەوەیە بۆ پاساودانی بەرگری شەرعی و ئەژمارکردنی بە یەکێك لە هۆکانی بە رەوادانان و لابردنی زەمانەتی سزایی و زەمانەتی مەدەنی لەهەردوو بەرپرسیارێتی مەدەنیو تاوانکاری گەر بوونی سەلمێنرا بۆ ئەو دەستدرێژکارانەی کە شیاویان هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا پاساوی بەرگری شەرعی نییە دژ بەو کەسانەی شیاوییان نیە لە حاڵەتی دەستدرێژییان بۆ سەر مافی کەسی تر، چـونکە ناتـوانین ئەوەیان بدەینە پاڵ کە مافی کەسێکیان خـواردووە بە ویستی خۆیان و مافی بەیاساپارێزراوی خۆیانیان نەهێشتووە.

**چوارەم : بەرگری شەرعی سەرکەوتنە بۆ یاسا (الدفاع الشرعي انتصار للقانون):**

لایەنگرانی ئەم تیۆریە پاساوی بەرگری شەرعی ئەدەن و بە هۆیەك لە هۆکانی بە رەوادانانی دەزانن، چـونکە لایان وایە کە دەستدرێژیکردنی تاوانکارانە بەهیچزانینی فەرمانی یاسایە و لابردنی ئەم بەهیچزانینەیە و بەهیچزانینی بەهیچزانینیش لە خۆیدا جێگیرکردن و دانپێدانانە، کەواتە لابردنی دەستدرێژی بە دەستدرێژی پشتیـوانکردنی

یاسا و سەرخستنیەتی.

**لەو رەخنانەی کەدەکرێت لەم ئاراستەیە بگیرێت ئەوەیە:**

ئەگەر ئەم بیرۆکەیە راست بێت ئەوا هەمووکەس دەتوانێت ببێتە نوێنەری دەسەلاتی گشتی مادام ئاکارەکانی یاسا سەربخات و پشتیوانی لە یاسا بکات، بەلام ئەمە قبوولکراو نیە، چونکە بەرگریکردن لە تاك و کۆمەلگە لە دیاردەکانی بالادەستی دەولەتن، بەلام دەستخستنە ناو کاروباری تاك و دەولەتەوە بە بێ پاساوێکی یاسایی، ئەوە دەستدرێژیکردنە بۆ سەر ئەم بالادەستییە.

**پێنجەم: بیرۆکەی گەرانەوە بۆ بنەرەت (فکرة الرجوع الى الاصل):**

ئەم بۆچوونە دەلێت: ئەسل ئەوەیە کە هەموو تاکێك بەرگری لە خۆی بکات، وەك ئەوکاتانەی کە دەولەت بوونی نەبووە. بەلام پاش دامەزراندنی دەولەت مافی بەرگریکردن لە تاك دەگوازرێتەوە بۆ ئەو کۆمەلگەیەی کە دەولەت نوێنەرایەتی دەکات، چونکە کۆمەلگە(دەولەت) لەم بەرگریکردنەدا بەتواناترەو ئاژاوەش دوور دەخاتەوەو، رەفتاری تاك نزیکە لەروودانی ئەو ئاژاوەیەو لێکەوتەی خراپ خستنەوە.

خۆ ئەگەر ئەو دەسەلاتی گشتی یەی کە نوێنەری کۆمەلگەیە نەیتوانی فریای تاکێك بکەوێت کە رووبەرووی مەترسیەکی زۆر نزیك بۆتەوە لەوکاتەدا کەدەستدرێژی دەکرێتە سەری ئەوا ئەو تاکە دەتوانێت مافی سەرەکی خۆی بسەنێتەوە و پارێزگاریی لە خۆی و ناموسی و سامانی بکات، چونکە کۆمەلگە ناتوانێت بیپارێزێت یان ئامادە نیە بیپارێزێت.

**لەو رەخنانەی کەدەکرێت ئاراستەی ئەم بیرۆکەیە بکرێت:**

١. ئەم بیرۆکەیە تا ئەندازەیەکی زۆر کاریگەرە بە تیۆریی گرێبەستی کۆمەلایەتی (ژانژاك رۆسۆ) و هاوبیرەکانی لەو مەسەلەیەدا کە دەلێت تاکەکان وازیان لە مافی خۆیان هێناوە لە بەرانبەر پاراستنیان لە لایەن کۆمەلگەوە. بەلام ئەم

بیرۆکەیە تەنها لە خەیاڵدا بوونی هەیەو بەس، لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بوونێکی واقیعی نییە.

٢. لەم بیرۆکەیەدا بەرگری و سزا تێکەڵ کراوە، چونکە کاتێك تاك پێش دەوڵەت بەرگری لە خۆی دەکرد، بەرگری یەکەی لەسەر بناغەی سزادانی دەستدرێژیکەر بووە.

٣. ئەگەر ئەم بیرۆکەیەشمان بە ناچاری سەلماند بە پاساوی بەرگریکردن لە مافێکی کە کەوتوەتە مەترسیەوە، هێشتا نابێتە پاساوێك بۆ بەرگریکردن لە مافی کەسێکی تر، لە کاتێکدا بەرگری شەرعی گشتییە و بەرگری لە مافی بەرگریکار و کەسی تریش دەگرێتەوە گەرچی ئەو کەسەش پەیوەندی پێوەی نەبێت.

**شەشەم: بیرۆکەی نیازپاکی (فکرة الباعث الشریف):**

ئەم بیرۆکەیە دەڵێت: دەستدرێژیی دەستدرێژکار بۆ سەر بەرژەوەندیەکانی کەسانی تر نیشانەی مەترسی ئەو کارەیە لەسەر کۆمەڵگە و بەرگریکاریش کاتێك دژی دەوەستێت تەنها ئەو کارە ئەنجام دەدات کەخزمەت بە کۆمەڵگە دەکات و ترسی ئەو دەستدرێژکارە دوور دەخاتەوە. کەواتە کارەکەی لە بابەتی دادگەری کۆمەڵایەتیە و قازانجی کۆمەڵگە لەوەدایە رەگەکانی ئەم ترسناکی یە هەڵبکەندرێت.

کاری بەرگریکاریش لەم واقیعەوە هەڵدەقوڵێت، بۆیە بە یەکێك لە هۆکانی بەرەوادانان (اباحە) ئەژمار دەکرێت هەموو جۆرە بەرپرسیارییەکی لەسەر لادەبات.

تێبینی ئەوە لە سەر ئەم بیرۆکەیە دەکرێت کە هەردوو لە دەستدرێژیکار و دەستدرێژیلێکراو بە کەسانی خراپ و ترسناك بۆ کۆمەڵگە دانانێت، کۆمەڵگەش هیچ بەرژەوەندیەکی نیە لە هێشتنەوەی یەکیان و لەناوبردنی ئەوی دی.

**حەوتەم: پاراستنی بەرژەوەندییە پێویستەکان (حماية المصالح الضرورية):**

بناغەی بەرگریی شەرعی لەشەریعەتی ئیسلامیدا بریتیە لەپاراستنی بەرژەوەندییە پێویستەکان، چونکە پاراستنی ئەو بەرژەوەندیانە پێویست (واجب)ەو هەرشتێك پێویستی لەسەر بوەستێت ئەویش دەبێتە پێویست (واجب)، سەرچاوەی ئەم بنەرەتەش ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزە: ﴿...قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا...﴾[1]، ئاگریش لەم ئایەتەدا کینایەیە بۆ هەر شتێك کەزیان بەبەرژەوەندی مرۆڤ بگەیەنێت لەدونیاو قیامەتدا.

## جێکەوتەکانی بەرگری شەرعی (آثار الدفاع الشرعي):

هەرکاتێ هۆکاری رێپێدان (اباحە) بەپایەو مەرجەکانیەوە بوونی هەبوو ئەوا ئەو کردە تاوانکاریەی لەبەرگری رەوادا بەکارهێنراوە دەبێتە رێپێدراو (مباح)، هەرکەس لەو کارەدا بەشدار بوبێت لێی سوودمەند دەبێت، هەربۆیە هیچ جیاوازییەك نامێنێت لەنێوان ئەنجامدەر (فاعل)و هاوبەش (شريك)و لەنێوان ئەوکەسەی بەرگری لەخۆی یان ناموسی یاخود ماڵی دەکات لەگەڵ ئەو کەسەی کەبەرگری لەناموس یاخود ماڵ یان گیانی کەسی تر دەکات، هەرکەس هانی بەرگری رەوا دەدات یاخود یارمەتی دەدات یان ئاسانکاری دەکات بۆ بەرگری ئەوا سوودمەند دەبێت لەرێپێدان (اباحە)و نە لەرووی تاوانکارییەوە، نە لەرووی مەدەنیەوە بەرپرسیار نابێت.

راڤەی ئەمەش بریتیە لەوەی کاری رەوا گونجاو نیە ببێتە بابەتی بەشداربوون لەتاوانکاریدا، ئیدی بەشداربووەکە بکەر بێت یاخود هاوبەشی بکەر یان هاندەری ئەنجامدانی بێت یاخود ئاسانکاری بۆ بکات، بەپێچەوانەی رێگریەکانی بەرپرسیارێتیەوە کەتەنها ئەو کەسەی ئەنجامی داوە سوود لەو پاساوە وەردەگرێت

---

[1] سورة التحريم : ٦ .

کەبەرێگر لەبەرپرسیارێتی دانراوە، ئەگەر شێتێكو عاقڵێك بەشداربوون لەكوشتنی كەسێكدا ئەوا تەنها شێتەكە لەرووی تاوانكارییەوە لێپێچینەوەی لەگەڵ ناكرێت، بەڵام عاقڵەكە لێپرسینەوەی لەگەڵ دەكرێتو بەو جۆرە سزاش وەردەگرێت كەتەنها خۆی تاوانەكەی ئەنجام دابێت.

# بەشی هەشتەم

## مافی ئازادی هەڵبژاردن

## (حق حرية الإختيار)

ئاراستە باوەكانی فەیلەسوفانی موسڵمان وەك تەواوی فەیلەسوف و زانایانی یاسا سەبارەت بەناچاری (جبر) و هەڵبژاردن (اختیار) سێ ئاراستەیە:

ئەوانیش هەڵبژاردنی رەها، ناچاری رەها، ئاراستەی مامناوەندو میانڕەو.

لەبەر ئەوە لێكۆڵینەوە لەبابەتەكە لەرووی شێوازەوە بۆ سێ دەروازە دابەش دەكەین، هەریەكەیان تایبەت دەكەین بەیەك لەو ئاراستانەی باسكران.

# دەروازەی یەکەم:
# ئاراستەی هەڵبژاردنی ڕەها

## (اتجاه الاختيار المطلق)

موعتەزیلەکان[1] لەو فەیلەسوفە موسڵمانانە بوون کەهەڵگری بیری هەڵبژاردنی ڕەهابوون و بانگەشەشیان بۆدەکرد، هەردەم بەرگریشیان لێدەکرد. پێیان وابوو مرۆڤ بکەرێکی هەڵبژێرەرەو بەدیهێنەری کردە هەڵبژێراوەکانیەتی بەو توانایی‌یەی کە خوای پەروەردگار بەخشیویەتی دیاریکردوە بۆی کەهەیانە عەقڵیەو هەیانە نەقڵییە.

---

[1] موعتەزیلە ناوێکە بە مانای وشە کاتێ سەریهەڵدا واصلی کوری عەتا لە ماموستاکەی حەسەنی بەصری جیابوویەوە بە هۆی ئەو گرژیەی لەنێوانیاندا لە سەر هەندێ راوبۆچوونی جیاواز روویدا، بەڵام دواتر بوویە رێبازێکی فیکری دیار و ناسراو بەوەی کە تاقم و پێرێکن زیاتر بە شێوەیەکی عەقڵانی تەماشای ئاین و بابەتە ئاینیەکان دەکەن و بەڵگەهێنانەو بەڵگەکاری عەقڵانی دەکەنە پێوەری یەکلاکەرەوە لە بابەتە ئاینیەکاندا. نەک ئەوەی تەنا بەو بنەمایانەی کەپێشینەکان بۆ ئاین دایان رشتوە. دواتر ناکۆکی تەواو کەوتە نێوان جەبریەو ئەشعەریەکان وەختەکارێك تاقمی دووەم ریبازی جەبریان هەڵبژارد وبەڵگەی عەقلی و نەقلیان بۆ ئەو مەبەستە بەکاردەبرد.
بەڵام دیارە ئەولنیش پێچەوانەی ئەوان بۆ جەخت کردنەوە لە سەر رای و هەڵبژاردنی ئازادی تاك پشتیان بە بەڵگەی عەقلی و نەقلی دەبەست.

## ا- بەڵگە عەقلیەکان (الادلة العقلیة):

لەو بەڵگە عەقڵیانەی موعتەزیلەکان دەستیان پێوە گرتبوو:

١- خۆ ئەگەر مرۆڤ ئازاد نەبێت لە هەڵبژاردنەکانیدا و هەرکارێك بیەوێت بیکات و هەرشتێکیشی بوێت وازی لێ بهێنێت، ئیتر تەکلیف و کەوتنەسەرشانی هەر شتێکی لەسەر نەدەما، یان بەلای کەمەوە بوونی بێ هوودە دەبوو، چونکە لە تەکلیف کردنی مرۆڤ دا رەفتارێکی دیاریکراوی لە سەر نوسراوە، جا ئەگەر رێگەیەکی تری پێبگیرێتە بەرو رەفتارێکی تری پێ ئەنجام بدرێت، تەکلیفێکە لە تواناو وزەی ئەو مرۆڤەدا نیە، ئەمەش رێك پێچەوانەی دەقی قورئانی پیرۆزە کە دەفەرموێت: ﴿لَا يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾[1] دەربرینی (نفسا) نەرێیە لەباری رەتکردنەوەی کەمانای گشتبوون (عموم) دەدات، بەلام لای تێکرای هۆشمەندان لە کۆن و نوێ راستی تەکلیف و ئاراستەکردنی داخوازی ونەرێ و رێگریەکان لە مرۆڤ جێگیرەو بەراست زانراوە لەلایەن هەموو کۆمەڵگەکان، جا لەلایەن یاسادانەرانی ئاسمانی یان زەمینی بێت. ئەمەش بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرو دانپیانراوە لەسەر ئەوەی کەمرۆڤ ئازادە لەهەڵبژاردنەکانی جا لە رەفتاری باش یان لە رەفتاری خرابدا بیەوێت ئەنجامی بدات.

تاو توێی ئەم بەڵگە لۆژیکیە وادەکرێت[2]، هەرچەندە راستە بەلام ئەنجامێکی گشتی تر (اعم) لەبانگەشەکەی لێدەکەوێتەوەو ئەو گشتیترە (اعم)ە تایبەتر (اخص) پابەند ناکات بەپێچەوانەوەی پێچەوانەکەیەوە، واتە ئەم بەڵگەیە لەدژی بیرۆکەی ناچاری (جبری)و ئەوانەیە کەبانگەشەی ناچاری رەها دەکەنو هەڵبژاردنی رەها بۆ

---

[1] سورة البقرة / ٢٨٦ .

[2] بەلگەش پێوانی لۆژیکی هەلاوێردە کە دوو پێشەکی پێشکەشکارو ئەوەی دواتریپێکهێنێتو دەرئەنجامی هەلگرتنی ئەوەی دواتر هەلگرتنی ئەوەی پێشەوەی لێدەکەوێتەوە، بەلگەی هەلگرتنی ئەوەی دواتریش بریتیە لەکودەنگی زانایانو هاودەنگی هۆشمەندان.

مرۆڤ پێ ناسەلمێت، ئەگەر هەڵبژاردنی رەها بۆ مرۆڤ مسەوگەر نەبێت، خۆ ئەوە بەس دەبێت بۆ دروستی تەکلیف و خستنە سەرشان، چونکە بۆ تەکلیف لەسەر هەڵبژاردنێکی بەشەکی هەر دەبێت وەك ئەوەی بۆچوونی ئەشعەریەکان (بۆچوونی مامناوەند)ە کەبەپشتیوانی خوا لەدەروازەی سێیەمدا باسی دەکەین.

٢- خۆ ئەگەر مرۆڤ موخەیەر و هەڵبژێرەرێکی رەها نەبوایە، ئەوا دەبوو پاداشت و سزا پووچەڵ بونایەوە، چونکە لەسەر کردەی باش و کردەی خراپ وەستاون کە دەدرانە پاڵ هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ، بەو پێیەی بکەریانە بە هەڵبژاردنێکی رەهاوە. لەکاتێکدا گەر بڵێین ئەوە کردەی باش دەکات چونکە وەهای لەسەر نوسراوە و ملکەچە بەوەی وەها بکات، ئەوا هیچ کات شایەنی ستایش کردن نیە لەم دونیایەدا و وەنەلەرۆژی دواییدا بەهەمان شێوە. خۆ بەپێچەوانەشەوە ئەگەر کەسێك کردەیەکی بەد ئەنجام بدات لە ژێر گوشارێکی وەهادا کەباسی لێوەدەکرێت ئیترخۆ شایەنی هیچ سەرزەنشت و سزادانێك نابێت. بەڵام پاداشت و سزا لەلایەن مرۆڤەوە جێگیرکراون بە هاورایی گشت یاساوشەریعەتە ئاسمانی و زەمینیەکان، گەر مرۆڤ کارەکانی چاکەبووبن ئەو پاداشتی چاکەو دەستخۆشی وەردەگرێت، خۆ ئەگەر کردەکانی بەد بوبن ئەوە پاداشتی خراب و سزا وەردەگرێت، ئەمەش بابەتێکی جێگیرو براوەیە و هیچ قسەو مشتومرێك وەرناگرێت و پێویستی بەبەڵگە هێنانەوە نیە بۆ سەلماندنی. ئەوەش بەڵگەیەکە لە سەر سەلماندنی ئەوەی کە مرۆڤ موخەیەرەو خاوەن ویست وهەڵبژاردنی رەهایە، کاتێك رێگەیەکی چاکە یان رێچکەیەکی بەدی دەگرێت و توانای جیاکاریکردنیانی هەیە. دیارە تاوتوێی ئەم بەڵگەیەش بە هەمان رەخنەو سەرنجی پێشوترمانی کە ئاراستەمانکرد لە بۆی بەسە.

٣- خۆ ئەگەر مرۆڤ خاوەن توانای هەڵبژاردنی رەها نەبوایە، ئەوا سودو پێویستی ناردنی پێغەمبەران و نێردراوانی خودایی بەبادەچوو، پاشان بەرپرسیارێتی باوك

و دایك و مامۆستاو بەخێوکەران و هوشیارکەرەوەکان نەدەبوو، چونکە پێویست وایە کە مرۆڤ (ملکەچ —مجبر)بێت لەبۆ ئەورەفتارانەی کەئەنجامیان دەدات، بەلأم ئەوەی باشەو بەرپرسیاریەتیە وەستاونەتە سەر واقیع بینی،ئەوەش ئاماژەیە بۆ خاوەنبوونی مرۆڤ لە هەڵبژاردنی رەها دا.
تاوتوێی ئەم بەلگەیە بەهەمان تاوتوێی بەلگەی پێشوو، هەروەها ئەوە تەنها نابێتە بەلگە و ناوەستێتە سەر هەڵبژاردنی رەها، بەلکو کفایەت دەکات بە جێبەجێبوونی سود و هەستان بەبەرپرسیارێتی بوونی هەڵبژاردنی بەشەکی.[1]

**بەلگە نەقلیەکان (الأدلة النقلية):**

موعتەزیلەکان بۆ بەهێزکردنی بۆچوونەکەیان سەبارەت بەهەڵبژاردنی رەها پشتیان بە هێنانی هەندێك دەقی قورئانی بەستووە، لەوانە:
خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ﴾[2] ئەوان وایدەبینن کە ئەم دەقە ئاماژەیە لەسەر ئەوەی کە مرۆڤ دەسبەسراوی ئەو کردەیەتی کەدەیکات، بەوەش بوەتە خاوەنی هەڵبژاردن و ویستی ئازادی خۆی— ئەگەر چاکەبێت کردەکەی ئەوە پاداشتی چاکەدەبێت و خۆ ئەگەر بەدیەك بێت ئەوە هاوشێوەکەی. تاوتوێی ئەم بەلگەهێنانەوەشیان بەوەدەکەین کە جیاوازی زۆر هەیە لەنێوان بەدەستخستن و بەدیهێناندا، یەکەمیان لەودیاردانەیە کەلەتوانای مرۆڤدایەو دوەمیشیان لەو شوێنەوارانەی دەستی پەروەردگارە لەم گەردوونەدا، بۆیە مرۆڤ پەیوەندی بەهۆکارەکانەوە دەکات و خوای گەورەش خەڵقکردن و بەدیهێنانی خاوەن هۆکانە گەر ویستی لەسەریان بێت.

---

[1] بۆزانیاری زیاتر تەماشەی چاپکراومان" فلسفة الشريعة لا ۲۱۸ دواتری بکە.
[2] سورة المدثر / ۳۸ .

ئایەتەکە پاڵپشتە بۆ ئەوانەی بۆچوونی مامناوەندو میانرەویان هەبووە لەنێوان هەڵبژاردنەی رەهاو ناچارە رەهادا.

١- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقُلِ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكُمْ فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ﴾[1]. لایەنگرانی هەڵبژاردنی رەها دەڵێن: ئەم دەقە ئاماژەیە بۆئەوەی کە مرۆڤ کەڵك وەردەگرێت لە ویستی ڕەها لە هەڵبژاردنی ئەو بڕوایەی کە لەترۆپکی چاکەدایە، یاخود هەڵبژاردنی کوفر کەلە ترۆپکی بەدیی و خراپی دایە، بۆیە جیاکاری و هەڵبژاردنی یەکێك لەمانە بەڵگەیەکی ڕوونە لە سەر ئازادی ویست وهەڵبژاردن لای مرۆڤ.

ئەم بەڵگەیە وەها تاوتوێ و موناقەشە دەکرێت کە ئەم دەقە بۆ هەڵبژاردن نەهاتوەو مەبەستی ئەوە نیە، چونکە ئەوە نابێت تەنها لەنێوان دووکردەی موباحدا نەبێت، بەڵکو بۆ بەڵێنە بەئەنجامی هەڵبژاردنی باش بەشی یەکەم کەئەویش ئیمانەو بەڵێن بەسەرئەنجامی خراپو مەترسیدار لەهەڵبژاردنی بەشی دووەمدا کەئەویش بێباوەڕییە. ئایەتەکە بۆ ئەوە هاتووە روونی بکاتەوە کە ئیسلام هاتوە بۆ رێککردنەوەی سەرەکان لەبەردەم خوای پەروەردگاردا، هیچ جیاوازی و پێشەنگی و ڕێزلێگیراویەکی زیاتر لەنێوانیاندا نیە نەبە ماڵ و نەبەنەسەب نەبەپێگەی کۆمەڵایەتی نە پێگەی سیاسی... چونکە ئەو کردانە بابەتی کاتی و ڕەفتەنین، بەڵکو پێشەنگی وبەرێزی مرۆڤەکان لای خوا بەتەقواو کردەی باش و بەسودە، بەدەر لەمە هەمووی گاڵتەو گەمەو گەپ و خۆجوانکردن و بەخۆوە نازینە..

هەرکەسێکیش دەیەوێت پەیوەست بێت بە ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە و دەبێتە پشتیوانی راستی و شوێنکەوتەی چاکە با باوەڕ بهێنێت، هەروەها ئەوەشی

---

[1] سورة الكهف / ٢٩ .

دەیـەوێت بچـێتە نێـو لایـەنگرانی (سـاختەیی) دەوەبەشـوێن تێرکردنـی هـەواو ئارەزووی خۆی لەو شتە ساختەو رەفتەنیانەی دونیای فانی با کافر بێت.

سـەرەرای نەسـەلماندنی سەرپشـکێتی رەهـا (التخـيير المطلـق ) بـەو بەڵگـەی عەقڵیو نەقڵیانەی باسکران چەند تێبینیەك لەسەر رێبـازی سەرپشـکێتی رەهـا هەیە، لەوانە:

أ- رووداوی تاوانی زۆری وەها هەن کە ئێمە بەچاوی خۆمان لـە ژیـانی رۆژانـەی خۆماندا دەیانبینین، کە لەژێر بارودۆخێکی وەهادان وا دەکات لـەتاوانبار کـە دەبێت تاوان بکات، وەك کوشتن لەبەرامبەر تۆڵەسەندنەوەیەك بۆ گێرانەوەی شەرەفی بنەماڵەکەی کە ئیهانەی پێکراوە، یـان دەسـتدرێژی کراوەتـە سـەر ناموسـی..یان وەك دزیکـردن لـە ئـەنجامی ئـەو پاڵەپەسـتۆیەی کەوتوەتـە سەری لەئەنجامی هەژاری و نەداری و برسێتی و لەپێناوی پاراستنی ژیانی.

ب- لێکۆڵینەوە زانستیە پزیشکیە نوێیەکان، و دەروونناسی، بانگەشەی ئەوانەی هەڵبژاردنی رەهایان کـرد، خسـتە لـەرزەو ژێرپرسـیارەوە، جـەختیان لـەوە کردەوە کـەمرۆڤ ناتوانێـت لـەکردەو رەفتارەکانیـدا هەمیشـە بـە هـەوەس و ئارەزووهەڵبـژاردنی خـۆی هـەنگاو هـەڵبگرێت، بـەڵکو پاڵنـەرە دەروونـی و سرووشـتی و پێکهاتنـە جەسـتەیی و ژینگەییـەکانی بەشـێك دەبـن لەئاراستەکردنی و جۆری هەڵبژاردنەکانی.ئەگەرچی لەبەرچاوەوە وادەبینـی کە ئەم مرۆڤە خاوەنی هەڵبژاردنی ئازادی خۆیەتی.

بۆیـە تـاوانیش وەك هەردیاردەیـەکی تـری کۆمەڵایـەتی تـر، تـەنها زادەی ویسـت(ارادە) نیـە، بـەڵکو چـەندین هۆکـاری کەسـی و کۆمەڵایـەتی و سرووشـتی دەستوەردانیان دەبێت لەو ڕووەوە.[1]

---

[1] القللي، في المسؤولية الجنائية، ص ٨ .

# دەروازەی دووەم:
# ئاراستەی ناچاریی ڕەها

## (اتجاه الجبر المطلق)

بیرۆکەی ڕێبازی ناچاری ڕەها(الجبر المطلق) بۆ پێش ئیسلام دەگەڕێتەوە، کاتێك و لەدێر زەمانەوە مرۆڤ هەڵی داوە بەو فێڵ ولێزانیەی هەیەتی مل نەدات بەوئازادیەی کە هەیەتی تاوەکو بەهۆیەوە پاساو بۆ کافربوونی بەخوای خۆی و تاوانەکانی و تەمەڵی و سەرپێچیەکانی بهێنێتەوە. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە هۆش و عەقڵی وەك جیاکارو ڕێنیشاندەرێك بۆ ئەوە خاوەنی بووە.

مێژوونوسان وایدەبینن کە ئەم جۆرە تێفکرینە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوگەلە کۆنانەی کەبت پەرست بوون.[1] موسڵمانانی سەرەتای ئیسلامەتی هیچ وەخت لە پرسی قەزاو قەدەر و هەمو ئەوشتە نامۆیانەی جەبری تیا ببنرایە ئەوەندە ڕۆنەدەچوون، چونکە لە ئاینەکەیان تەواو تێگەیشتبوون.

ئەمە بەدەر لەوەی کە کۆمەڵێك خەڵك هاتنە ناو ئیسلامەوە وایان نیشاندا کە ئیمانیان هێناوەو واپیشانیاندا کە ئەمانە بیروباوەڕە نا ئیسلامیەکان ڕۆشندەکەنەوە لەسەرووی هەموشیانەوە بیری (جەبریە) وەك لایەنگران و تاقمی جەهمی کوڕی

---

[1] الاختیار(( او حریة الارادة )) وەرگێڕانی: أبی الوفاو محمود درویش چاپی ١٩٥٨، لا١٢٧.

صەفوانی ئەلراسبی[1] و پێڕی جەعدی کوڕی درهەم. بۆئـەوە چـوون کەویسـتی مـرۆڤ دەستەسانە لەئاراستەکردنی ڕەوتی ڕووداوەکانو هـەموو ئـەوەی بەسـەر مـرۆڤ دێـت دیاری کراوە بۆی یاخود نوسراوە لەسـەری‌و سەرپشـك نیـە، پـەیرەوانی ئـەم ڕێبـازە ناوی ناچاری(جبری)یان لێنراوەو وەك جەهەمیەکان گروپێکن لەگروپە ئیسلامیەکان.

وتوویانە: لەراستیدا مرۆڤ هیچ توانایـەکی نیـە هـەروەك موعتەزیلـەکانی لایـەنگری سەرپشکێی ڕەها دەڵێن‌و هیچـی بەدەسـت ناهێنێـت وەك ئەشـعەریەکانی لایـەنگری ڕێبازی میانرەو دەڵێن.

هەروەها وتوویانە: هەموو ئەوەی ڕوودەدات بـەپێویی ویسـتی خـوای گەورەیـەو داهاتووش ئەگەر چوبێتە ئاگاداربوونی خوای گەروە ئەوا ڕوودانەکـەی بـەپێی زانینـی ئەو پێویست بووەو ناچاربوون (جبریە)ش جیاوازە لە هەرئـەبێت (حەتمیـە)، چـونکە ناچاریی پێویستی ڕوودانی شتەکان لەسەر بنـەمای بـەرزتر لـەخۆیان هەڵدەسـپێرێت کەچۆنی بوێت بەڕێوەی دەبات، کەواتە ئـەوە پێویسـیـەکی باڵایـە، لەوێـدا ویسـتێکی خوایی هەیە کەهەموو ڕووداوەکان دەکەونە ژێریەوەو ئەوەشـی مـرۆڤ ناچـارە لەسـەر ئەو کارانەی دەیکات لەسەر ئەو بنەمایەیە بەبێ حەتمیەتی ڕەوش و سروشتەکەی.

لەسەر ئەو بنەمایە ئـەو ناچـاریە ناچـاریەکی خواییـە، بـەڵام حەتمیـەت ڕێبازێکـە لەڕێبازە فەلسەفیەکان وایدەبینێت کەدیاردەکانی سروشت هۆکاری ڕوودانیان هەیـەو ئەمەش بنەمای هۆکارێتیە لەخودی خۆیداو هۆ(عیلە) ڕوودانی بەهۆگیراوەکە پێویست دەکات‌و پێویسـتبونیش دەوری هـەموو شـتەکانی داوەو بـۆ هـەر ڕووداوێـك چـەندین

---

[1] ( مربووة ـ ١٢٨ الهجري) سەرۆکی جەهمیەکانە کە تاقمێك بوون لە تـاقمی مورجئـە. یـەکێ لـەو ڕایانەی جەهمیەکان ئەوەبوو: کە ئیمان عەقدێکی دڵێیە بۆ ناسـینی خـوا و پێغەمبـەرەکانی و ئەوەی هێناویانە، هەرچی تر بەدەر لەمە ئەوە ئیمان نیە، ئـەوەی کـە عـەقڵ ڕەوای دادەنـێ و بکرێت و یاخود بە شیاوی نازانێت و ناکرێت ئەوە هیچی لـە ئیمانـەوە نیـە. هـەموو کردەکـان دواخراوێکە لە ئیمانەوە.

مەرج هەیە ئەگەر هەبوون ئەوا ئەو رووداوە روودەدات ئەو دووانەش وەك هۆی تەواو (عیلە تامە)و هۆدارەکەی (مەعلولەکەی) وەهایە[1].

حەتمیەتیش بریتییە لەئەوە بڵێین هەموو دیاردەیەکی سروشتی بەستراوەتەوە بەچەند مەرجێکەوە کەبەناچاری روودانی پێویست دەکات[2].

حەتمیەتیش ئەوەی کەفەیلەسوفەکانو زانایانی یاسا لەبارەی ناچاری مرۆڤەوە لەسەر ئەنجامدانی تاوان دەیلێن.

وایدادەنێن کە ئەوەی لە مرۆڤەوە دەردەچێت لە کردار وەك پەڕێك وایە بەدەم باوە و ملکەچی ویست و قەدەری خوایە. ئەو کردارانەی کە لەلایەن هەندێك کەسەوە وادەزانن ئیختیاریە، لەراستیدا ئەوە بەدیهێنراوی خواو بە ویستی ئەو ئەنجامدەدرێن، کاتێکیش دەدرێنە پاڵ مرۆڤ ئەوە شێوەیەکی مەجازیە، وەك چۆن هەندێك کردار دەدرێنە پاڵ داروبەرەختەکان و بێ گیانەکان و دەوترێت: گوڵەکە خونچەیەکی گرت، دارەکە گەڵای گرت، بەردەکە جوڵا..

سەرەڕای دانپیانان و سوربونیان لەسەر بیری جەبریە ئەم تاقمە باوەڕیان وایە کە مرۆڤ موکەلەفەو بەپرسیارە لە رووی تاوانیەوە لەو کردانەی کەرێپێنەدراون.

جەبریەکان پەنایان دەبرد بۆ کۆمەڵێ دەقی قورئانی بەمەبستی بەهێزکردنی راوبۆچونەکانیان لە نێو ئەو دەقانەی قورئانی پیرۆزیش:

أ- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا تَشَاءُونَ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ﴾[3] ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ویستی مرۆڤ دواجار مل کەچی ویستی خوای پەروەردگارە، لەهەر هەڵس وکەوتێك کەلەمرۆڤەوە ئەنجامبدرێت جا ئەگەر چاکە بێت یان خراپە. لەتاوتوێکردنی ئەم بەڵگەهێنانەوەی ئەوان کە بەم دەقە دەیبەستنەوە،

---

[1] المعجم الفلسفي /سەرچاوەی پێشوو/١/٢٨٨-٢٨٩.
[2] سەرچاوەی پێشوو/ص٤٤٤.
[3] سورةالانسان / ٣٠ .

پێمان وایە کە نەدوور نە نزیك ئەم بەڵگەیە پەیوەندی بەبیرۆکەی جەبریەوە نیە، بەڵکو ئەوەی لێوەردەگیرێت کە مومکین نیە لەم جیهانەدا ڕووداوێك بکەوێتەوە لە کردەی مرۆڤ یان لەدەرەوەی دەستی مرۆڤ بەبێ ئاگاداری و ڕێپێدانی خودایی و ویستی خودایی، هەرچی دەردەچێت لە مرۆڤەوە لە ویستەکردارەکانی لە ڕاستیدا بەرکاری دوو ویستە: ویستێکی مرۆیی بەدەستبردنی مرۆڤ لە هۆکارەکان ودەست خستنی هەروەها ویستی خوای پەروەردگار لەسەر هێنانە بوون و بەدیهێنانی لە نەبوونەوە. نەك بە ویستی خوا بەتەنها بۆئەوەی مولزیمی دەرچوون لە سونەتی خوای گەورە نەبێت لەو بەدیهێنانانەی کەوا دایناوە کە واز لە مرۆڤەکان بێتێت دوای ئەوەی عەقڵ و پەیبردن و ویستی پێبەخشیون. ویست و هەڵبژاردن و توانا لەپەیوەندی کردن هۆکارەکانی چاکەو هۆکاری خراپە، چونکە دادگەری ئاسمانی ناچارکردنی مرۆڤی بە کردەوەیەك رەتدەکاتەوە، پاشان هەستێت بە لێپێچینەوە لەسەر دەرەنجامەکانی.

بەڵام لە دەرەوەی ئەم چوارچێوەیەوە ویستی خوا باڵادەستەو تەحەکوم بە کۆمەڵێك کردارەوە دەکات لەدەرەوەی توانای مرۆڤن، چەندکەس مردن پێچانیەوە دوای ئەوەی فرۆکەکەیان لە ئاسمان گڕی گرت، یاخود کەشتیەکەیان لەقوڵایی دەریادا نوقم بوو، یان شەمەندەفەرەکەیان لەهێڵەکەی خۆی دەرچوو، یاخود بوومەلەرزە کۆشکەی بەسەردا ڕووخاند یان بە تەقینەوەیك ڕما بەسەریدا..چەند دکتۆر بێ توانایی خۆیان ڕایانگەیاند سەبارەت بەچارەسەرکردنی نەخۆشیەك، سەرەڕای ئەوەش کەچی نەخۆشەکە چاکبوویەوە و تەندرووستی بۆ گەڕایەوە و چەند ساڵ دوای ئەوەش ژیانی کرد. !

چەند پرۆژە هەبوون شکستیان هێنا، چەند کەس ڕای خۆیان گۆڕی پاش ئەوەی کە زۆر سوور بوون لە سەر ئەوەی نەخشەیەکی دڵنیاییان بۆکێشابوو کە بیبەنەسەر...

پاشان هەزاران ڕووداو کە ڕۆژانە ڕوودەدەن با بخەینە سەر، بە بێ ئەوەی هیچ ویستێکی مرۆڤی تیابێت و بە سەربەخۆ ڕوودەدەن..

ئەمە هەمووی بەڵگەی ڕوونن لە سەر ئەوەی کە ویستی خودا سەربەخۆیە بەو کردانەی کە لەدەرەوەی ویست و توانای ئیرادەی مرۆڤەوەن و مرۆڤ توانای دەستوەردانیانی نیە، بەلاَم ئەوە نیە مەگەر بە هەلاَوێرد نەبێت، ئەصڵ ئەوەیە کە هەرکردەیەك لەکردەکانی مرۆڤ بەرکاری ویستی خوای گەورەیەو ویستی مرۆڤ خۆی، هەرچی ویستی مرۆڤیشە توانای نیە کە لە نەخشەیەك بخاتە ناو بوونەوە ئەگەر ویستی خوای گەورە هاوکاری نەبێت، بەلاَم ئەو یارمەتیدانە واتای ناچاری و جەبر ناگەیەنێت و مرۆڤ ملکەچی کردەیەك بکات و دواجار لێپێچینەوەشی لەسەر دەرەنجامەکانی لەگەڵدا بکات.

ب- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَيُضِلُّ اللَّهُ مَنْ يَشَاءُ وَيَهْدِي مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾[1] ﴿وَمَنْ يُضْلِلِ اللَّهُ فَلَنْ تَجِدَ لَهُ سَبِيلًا﴾[2] ﴿مَنْ يَهْدِ اللَّهُ فَهُوَ الْمُهْتَدِ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَنْ تَجِدَ لَهُ وَلِيًّا مُرْشِدًا﴾[3]. چەند دەقی تر لەقورئانی پیرۆز، بەڕوخساری ئاماژەن لەسەر ئەوەی کە ڕێنموونی(هدایە) خوای گەورە و گومڕابوون کارێکە نوسراوە لەسەر مرۆڤ لەلایەن خوداوە، هیچ تواناو گۆڕانکاری و بەرەنگاریەك لەویارەوە نیە، ئەم تێگەیشتنە نەخۆش و لاوازە (تێفکرینی جەبریە) بۆ ئەم دەقانە و هاوشێوەکانی ئەوە کارێکە لەهەموکەسێکی ڕووکەش ناس وسادە دەوەشێتەوە، کە هاوەڵی تێفکرینی قووڵ نەبێت، دیارە هەر کەسێك لەهەندێ ئایەت زانیاری بزانێت و نەزان بێت بەرامبەر هەندێکی تری، بێگومان ناتوانێت پەی بەهەموو ڕەهەندەکانیان ببات.

---

[1] سورة ابراهيم / ٤ .
[2] سورة النساء / ٨٨ .
[3] سورة الكهف / ١٧ .

دیاره مەبەست لەو دەقانە و هاوشێوەی ئەو دەقانە کە هێنران ئەوەیە کە خوای باڵادەست ئەگەر ویستی هەبێت کە مرۆڤێك گومڕا بکات، ئەوا لە توانای هیچ کەسێکدا نیە کە ڕێنوونی بکات و هیدایەتی پێوەریگرێت، بەڵام خوای گەورە ئەوەی ناوێت هەتاوەکو گومڕایی نەبێتە کردەیەکی ناچاری و جەبری و بسەپێت بەسەریدا، چونکە ئیتر لەو کاتەدا شایستەی سەرزەنشت و سزانیە.

هەروەها ئەگەر خودا ویستی وەهابێت کەکەسێك ڕێنموونی بکات، ئەوا هیچ کەس ناتوانێت گومڕای بکات، چونکە ویستی خودا لەسەرووی ویستی مرۆڤەوەیە، بەڵام خودا نایەوێت بەوشێوەیە بێت چونکە ئەوەی ناچارکراوە بە ڕێنموونی وەرگرتن ئیتر چ شایستەییەکی هەیە بۆ ڕێزو پاداشتکردن..

لەپاڵ ئەمەشدا قورئانی پیرۆز یەکەیەکی پێکەوە گرێدراو وپەیوەستە هەندێکی دەبێتە ڕاڤەکەری ئەوهەندەکەی تری، ئەوەتا هەندێك دەقی قورئانی هەن ڕاستەوخۆ ئەو تێگەیشتنە جەبریە ڕەت دەدەنەوە بەڕوونی ماناکەی دژی دەبێتەوە، دەقەکانی قورئان ئاماژەیەکی بێگومان و دوودڵی سەبارەت بە ویستی خودا پیشان دەدەن کە ویستی خودایی دەستوەردانی کاروباری بەندەکەی ناکات وُ چوارچێوە بۆ ویستی ئازادی ئەو لەهەڵبژاردنی چاکەو خراپە ناکێشێت. دیارە تەنها بەدەقی قورئانی لەو بارەوە ئیکتیفا ناکات، بەڵکو سەرزەنشتی پێغەمبەر دەکات لە ڕێگەی بەکاربردنی ڕێبازی ناچارکردن (جەبری) و بەزۆرە ملێ بۆ هێنانە نەسەر ڕێی مرۆڤەکان بەوەی کە ئیمان بهێنن، لەوانە دەقی ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَنْ فِي الْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا أَفَأَنْتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ﴾[1].

ئەم دەقە پیرۆزە ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە کە ئەگەر خوا ویستی هەبوایە ئەوا باوەڕی بە هەموو ئەوانە دەهێنا کە لەسەر زەوی بوون، بەڵام ئەوەی نەکردووە لەبەر

---

[1] سورة يونس / ٩٩ .

پارێزگرتن له ناچارکردن، له پاڵ ئەوەشدا سەرزەنشت و گلەیی لە پێغەمبەر(د.خ) کراوه بەوەی ئەگەر له خوای بەدیهێنەر بەدوور بێت بەناچارکردنی مرۆڤەکان لەوەی که بڕوابهێنن، کەواته بۆ پێغەمبەر لەپێشتر و پێویستتره کە رێگەی جەبرو ناچاری لەو بارەوه نەگرێته بەر، هەروەها چەند دەقی قورئانی تر هەن وەصفی ئەوانه دەکات کە بیری جەبر پەیرەو دەکەن و بانگەشەی بۆ دەکەن بەوەی کە لەهاوەڵدانەرانن، بە ئایەتی پیرۆزی : ﴿وَقَالَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِنْ دُونِهِ مِنْ شَيْءٍ نَحْنُ وَلَا آبَاؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِنْ دُونِهِ مِنْ شَيْءٍ كَذَلِكَ فَعَلَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ فَهَلْ عَلَى الرُّسُلِ إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ﴾[1].

دەبینین کە ئەم دەقە چۆن بەرهەڵستی ودژایەتی ئەو دەستپێوەگرتنەی بتپەرستانه بە جەبرەوه دەکات، چۆن بەرپەرچی ئەو بانگەشانه رەتدەکاتەوه کە دەڵێن هیدایەت و رێنمونیان پەیوەسته بە ویستی خوداییەوه. وەچۆن گاڵته بە ئاوەزی ئەوانه دەکات و پێیان دەفەرموێت ئەوه ئێوه یەکەم نین لەوانەی کەوتوونەته ئەم هەڵە ئابڕوبەرەوه، بەڵکو ئەوانەی پێش ئێوەش هەمان رێچکەی هەڵەیان گرتووه، بۆیە قورئانی پیرۆز بەتوندی ئەو بیروباوەڕە جەبرە ناچارکەرەیان سوك ولەکەدار دەکات و دەفەرموێت: ﴿سَيَقُولُ الَّذِينَ أَشْرَكُوا لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا أَشْرَكْنَا وَلَا آبَاؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِنْ شَيْءٍ كَذَلِكَ كَذَّبَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ حَتَّى ذَاقُوا بَأْسَنَا قُلْ هَلْ عِنْدَكُمْ مِنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَا إِنْ تَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَإِنْ أَنْتُمْ إِلَّا تَخْرُصُونَ﴾[2].

---

[1] سورة النحل / ٣٥ .
[2] سورة الانعام / ١٤٨ .

## ناچاری و قەزاو قەدەر (الجبر والقضاء والقدر):

دەستگرتنی هەندێك بە بیری قەزاو و راڤەکردنی بە راڤەیەکی هەڵە لەسەر بنەمای کە قەزاو قەدەر واتای جەبرو ناچاری دەگەیەنن، پاشان ئەوەی ڕووبەڕووی مرۆڤ دەبێتەوە بە درێژایی ژیانی لە چاکەو خراپە، ئەوە شتانێکە نوسراون لەسەری و توانای گۆڕین و دەسکاریکردنیانی نیە. ئەم بیرۆکە ڕووکەشە تا بە ئیمرۆ لەناو خەڵکاندا دەستاو دەستی هەیە، ئەمە سەرەڕای هەموو ئەو پێشکەوتنە زاستی و رۆشنبیریەی کە پێشەنگایەتی جیهانی ئیمرۆ دەکات.

لە راستیدا ووشەی (قەزا)بەمانای هێنانە بوونی روداوێك کە لەزانستی خوای گەورەدا پێشتر هەبوەو ویستی خوای گەورە لە روودانیدا هەبووە لەبەر حیکمەتێك و لەبەر چاکەی بونەوەرێك یاخود چاکەیەکی نەوەی مرۆڤ. هەروەها وشەی (قەدەر) وشەیەکی عەرەبیەو دارێژراوە لە کاری(قدر) کەبە مانای رێککردن ورێکخستن و هاوسەنگکردن، دیاریکردنی ئەوەی پێویستە بۆ شتێك، دێت. خوای پاك وبێگەر بەباشترین شێوە شتەکانی بەدیهێناوە و رێککاری ( تەنسیق ) لە گشت کردەکانی دا رەنگدانەوەی هەیە. خوای گەورە جوانکاری و ئەندازەگیری بۆ هەموو شتێك کردووە، تەنانەت گەردێك،هەروەها جەوهەری تاك بەحیکمەتی ناکۆتای خۆی بەهەمان شێوە والێکردووە. وەك دەفەرموێت: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾[1] واتە پاش ئەندازە گیری کردن و کێشانی. ئەوەش بە دانانی بەرنامەویاساو سوننەتانەمان و ئەویاسایانەی کە رێکیدەخات پێی، هەروەها بوونی هەموو درووستکراوەکانی تر، هەروەها ئەندازەی ئەو نێوانانەی کە لەنێوان بارستە ئاسمانیەکاندا بوونیان هەیە.

(قەدەر ) یش مانای ئەوەنیە کە کارێکی نووسراو لەسەر کەسێك هەیەو هەردەبێت کە ملکەچی بکات ئەگەر بیەوێت یان نەیاری بکات. وەك ئەوەی عومەری کوڕی

---

[1] سورة القمر / ٤٩ .

خەتاب (خوا لێی رازی بێت) کاتێك پێی رادەگەیەنن کە نەخۆشی تاعوون لە ناوچەی شام بلآویوەتەوە، ئەویش بریاری سەفەرنەکردن و نەچوون بۆشام دەردەکات، کاتێك ئەبوعوبەیدە پێی دەڵێت:" مەگەر دەتەوێت لە قەدەری خوا رابکەی ئەی ئەمیری ئیمانداران" عومەر لە وەلآمیدا فەرمووی:" من لە قەدەرێکی خوداییەوە رادەکەم بۆ قەدەرێکی تری خودایی"[1] ئەوە بەمانای ئەوەدێت کە ئەو رایدەکرد لە ئیمکانی قەدەرێکی خرابو بێزراوەوە بۆ ئیمکان بوونی قەدەرێکی سەلامەتی خودایی خاڵی لەو پەتایە.

**هەڵسەنگاندنی رێبازی ناچاری (تقويم منهب الجبر):**

ئەم رێبازە لەچەندین لاوە رەخنەی لێگیراوە، لەوانە:

١. بریاردان لەسەر( پێسپاردن– تەکلیف) بەسەر مرۆڤدا کە توانای هەڵگرتنی ئەوەندەی نیە. چونکە ئەوە دەگەیەنێت کەکارێك ئەنجام بداتو لەهەمان کاتدا پێچەوانەی ئەو کارەش بکات، بۆ نمونە هەستێت بەکوشتنی فلآنەکەس پاشان لەهەمان کاتدا نەهی لەو کوشتنە بکات.

٢. ئەم رێبازە ئەگەر راست بێت ئەوا لەناوبەری شەریعەت و یاساو بەهاکانە، چونکە وادەخوازێت پاداشتو سزا بەشێوازێکی هەرەمەکی لەسەر بنەمای بێسەرو بەری دابەش بکرێت، ئەگەر قەزاو قەدەر بەناچارکردنو بەزۆرئەنجام پێدان لێکدرایەوە ئەوا سزاو پاداشتو وادەو بەڵێنو فەرمانو رێگری بێئاکام دەبنو هیچ سەرکۆنەیەکی گوناهکار ناکرێت لەلایەن خوای گەورەوەو هیچ سوپاسێکی چاکەکاریەکیش ناکرێتو، چاکەکار لەپێشتر نابێت بۆ پیا هەڵدان لەخراپەکار یان لەپێشتر نابێت لەگوناهکار.

[1] الاختيار (( او حرية الارادة في الإسلام )) ترجمة ابى الوفاء محمد درويش، ص ١٧ .

٣. ڕێبازێکە پێی وایە کە مرۆڤ تەنها جێبەجێکارەو کارەکان تیایدا بەرێدەبن بەناچاری و بەبێ هەڵبژاردنی خۆی یان بەبێ بەرهەڵستی ویان توانای وەرگرتن و لێفرێدان و وەك خۆیان جێبەجێدەکران. بەمەش بنچینەی بەرپرسیارێتی تاوانکاری هەڵدەوەشایەوەو نەدەما. هەروەها هەرچی پیاهەڵدان و پاداشت و هەروەها سەرزەنشت و سزا هەیە هەمووی پووچەڵ دەبێتەوە. کەچی ئەمانە هەموویان لەناو شەرع دا هاتوون، وتەنانەت شەرعیان لەسەر وەستاوە، کەبەنەمان وتیاچوونی ئەمانە شەرعیش هەمان دەردی بەسەردا دێت.

٤. ڕێبازێکە جیاوازی نێوان بکەری چاکەو بکەری خراپە هەڵدەگرێت، چونکە هەریەك لەوانە بکەری راستەقینەی ئەو کارە نین کەلێیانەوە دەردەچێت. هەروەها جیاوازی نامێنێت لە نێوان ئەو کەسەی کەتاوانێکی بە ئەنقەست ویە زانیاری و ویست و هەڵبژاردنی خۆیەوە ئەنجامی دەدات لەگەڵ ئەوەی تاوانێکی بە سەهو وبێ ئاگایی و یان نەزانی یان بە زۆر پێی دەکرێت.

٥. ئەگەر ئەم ڕێبازە راست بێت ئەوا پێویست دەکات تاوان بدرێتە پاڵ خوای گەورە، بۆ نمونە لەتاوانی زینادا بوترێت خوای گەورە زینای ئەنجام داوە، لەتاوانی کوشتندا بوترێت خوای گەورە بکوژەو بەوجۆرە، بەکۆدەنگی عاقڵمەندان و فەیلەسوفان دانە پاڵ (لازم)و دراوە پاڵ (ملزوم) پوچەڵن.

٦. ئەم ڕێبازە ئەگەر هەڵگێرەرەوە — گەر لەناوبەر نەبێت —ی شەریعەت و یاساو بەهاکانە، بەرهەڵستکاری ئەویاسای خوداییەیە کە سزای خراپەکار بەرامبەر ئەو خراپەیەی کردوویەتی، هەروەها پاداشتدەرەوەی چاکەکارە بەرامبەر کردەچاکەکانی، بەهەمان شێوەش بەرامبەر یاسای دانراو وەهایە.

٧. ڕێبازێکە دروستی هەستەکانی ئێمە دەشێوێنێت، بەرامبەر هەبوونی ئەو ویستە تایبەتەی هەمانە کە ناچارنەکراوە لەبەرامبەر ئەوەی کە بتوانین رەفتارێکی دیاریکراو بە پاڵنەرێکی ناوەکی یان دەرەکی ئەنجام بدەین، بەو ویستە

بەدەمەوەچـوونمان  هەیـە بـۆ ئەوکردانـەی دەمانـەوێت بەدەمیانـەوە بچـین، هەروەها وازدەهێنین لەوەی ویستمان لەوازلێهێنانی هەیە بە ئارەزوو هەڵبژاردنی خۆمان. ئەمەش شتێکە هەستی پێدەکەین، ئەوەتا پەشیمانی دەنوێنین لەکاتی سەرنەکەوتن و بێ ئەنجامی کردەیەکمان، چونکە ئێمە لەسـەر ئـەوە دڵنیـابوین کە ئەوە لەتوانای ئێمەدا هەبوو بگەینە ئەو ئامانجەی کەلەو کارەدا دەمانویست بەدیبێت، بەڵام ئەگەر تەمەڵی و کەمتەرخەمیمان تیایدا نەنواندایە.

پوختەی قسان: ئێمە بڕوامان وایە  کەلـە قـوڵایی دەروونـی خۆمانـەوە هـەڵقوڵاوە هەیـە، کـە ئێمـە وابەسـتەین و دەرونمـان شـایەتی لەسـەر ئـەوە دەدات و دان بـەو بەرپرسیارەتیەماندا دەنێت، هـەروەها دەبیـنین هـەموو گـەلان لـەم جیهانـە دان بـە بەرپرسیارێتی مرۆڤ دا دەەنێن کە خـاوەن ویسـت و پێزانینـە، ئـەو یاساورێسـایانەی دانراون  لە بـۆ رێکخسـتنی پەیوەندیـە ویسـتراوەکانی مرۆڤـەو ئـەو دادگایانـەش کـە دامەزراون بۆ لێپێچینەوەی تاوانبارانن لەو کردە تاوانکاریانەی ئەوان.

# دەروازەی سێیەم:
# ئاراستەی میانڕەو

## ( المذهب المعتدل )

دیارە هەریەك لەو دوو ڕێبازەی (ئاراستە) پێشتر باسمان لێوەکردن، جۆرێك لە زیادەڕەوی هەڵبەستنی زیاتریان لە خۆگرتبوو، لەبەر ئەوە هەندێ لەفەیلەسوفە موسڵمانەکان شێوەی میانڕەویان پەیرەو کرد ئەشعەریەکان ئەم ڕێبازەیان گرت[1]، لە گرنگترین ئەو هەوڵانەی کە دراون و ویستویانە کە سازان و گونجاندن لەنێوان ئازادی هەڵبژاردن و جەبریە ئەوەیە کە ئەبوئەلحەسەن عەلی کوری ئیسماعیلی ئەشعەری وتویەتی[2].

راسپێری و کاری ئەو بریتی بوو کەنێوەندگیری لەنێو هەموو ڕاکان بکات و بۆخۆی بینای ڕێبازێك دابنێت کە لەرۆژهەلآت و زۆربەی جیهانی ئیسلامی بناسرێت، بەناوی ڕێبازی ئەهلی سوننە، وەك ئەوەی ڕێبازی ئەشعەری ناوی بردووە.

ئەم ڕێبازە توانیویەتی کە ئەوەی لایق وشایستە بەخوای گەورەیە بیداتە پاڵی بەبێ ئەوەی لەمافی مرۆڤ بدات، ئەوەش بخاتە پاڵ مرۆڤ کە خوای گەورە لەکارو کردەوە تیایدا بەدیهێناوە.

---

[1] الاشعری ابو الحسن (٢٦٠– ٣٢٣هـ) اسماعیل بن اسحاق من لحفاد الصحابی الجلیل لبی موسی الاشعری وهو یری ان للانسان ارادة وقدرة خاصة کما قال المعتزلة ولکن هذه الارادة والقدرة لیست هي التي تؤثر في لحداث الفعل بل هي نفسها خاضعة لارادة الله ومخلوقة له. ینظر موسوعة الفلسفة والفلاسفة ١/١٤٩.

[2] ولد بالبصرة عام ٢٦٠ الهجري او ٢٧٠ الهجري وتوفی حوالي ٣٣٠ الهجري.

ئەشعەریە بەو تیۆرەی کەپێی دەوترا (تیۆری دەسخستن) بەو مانایەی ئەوجیهانەی ئێمە لەناویدا دەژین، جیهانی هۆکارەکانە، دیارە ئەوەتا هۆکارو بەرکار (یان دەرەنجام) هەیە، رۆڵی مرۆڤ یەکسەری کورت دەکرێتەوە لەناو هۆکارەکاندا خوای پەروەردگاریش بەدیهێنانی دەرەنجامەکانی لە ئەستۆ دەگرێت. ئەشعەریەکان وایدەبینن کاریگەری توانای ڕووداو لەناو ڕووداوەکاندا نیە، بەڵکو لە سونەتی خوای گەورەدایە کە پەیوەستی دەکات لەنێوان کردەی بکەرو توانای ڕوودەر لەبۆی، ئەگەر مرۆڤ ویستی لێی هەبوو خۆی یەکلاکردبوەوە بۆی، بەو کردەیە دەوترێت دەستخستن (کسب) بەدیهێنانەکەشی لەلای خودای بەرزو باڵایە، دستخستنیشی لەلای بەندەکەیە. رای ئەشعەریەکان نزیکیان لەگەڵ رای فەیلەسوفانی رۆژئاوایی هەیە ئەوانەی خاوەنی تیۆری ریککەوتن، یاخود تیۆری بارودۆخ و بۆنەکانن، کە پێیان وایە هەر کردەیەك لە راستیدا هی خوایە، بەڵام بەوشێوازە دەردەکەوێت کە ڕوودەدات کاتێك بارودۆخێکی تایبەتی بۆ لوا، یان بارودۆخێکی نا مرۆیی بۆ هەڵکەوت بەشێوازێك مرۆڤ وابیربکاتەوە کە ئەو بارودۆخە هێنایەتە ئاراوەو درووستی کردووە، لەنێو لایەنگرانی ئەم تیۆریایە فەیلەسوفی فەرەنسی مالبرانسە[1].

هەندێك لە لێکۆڵەران ئەم وتەیەی ئەشعەری (دەستخستن—الکسب) وەك مەتەڵێك چاوی لێدەکەن، وەکو گرێکوێرەیەك دەیبینن کە بۆ کەس ناکرێتەوە. ئیبن وتەیمیە لەوبارەوە دەڵێت: "ئەشعەری شتێکی مەعقول ناڵێت، بەڵکو لەراستیدا ئەو وتەیەی ئەشعەری هەمان وتەی جەهمی کوڕی مەعبەدی ئەلراسی جەبریە، کەبەندە نەتوانا و نەکارو نەدەستخستنی لە بەردەستدایە"[2].

---

[1] الدکتور رؤوف عبید، التسییر والتخییر بین الفلسفة العامة وفلسفة القانون، ص ٢٤٣ .

[2] انظر النبوءات لابن تیمیة، ص ٩٧ .

به تێڕوانینی من راو بۆچوونی ئەشعەری تەواوو روونەو هیچ پێچو پەنایەکی تیانیەو هیچ کات وەك مەتەڵ نابێت بێتە هەژمار، بەڵكو رایەکە واقیع و لۆژیکی هۆشمەندانە پاڵپشتی تەواوی دەکات.

ئیبن روشد فەیلەسوفی قورتوبە[1] ئەو رێبازە میانڕەوەمان بۆ رووندەکاتەوە بەشێوازێك ئیتر قسەلەسەرکردن ومشتومڕ هەڵناگرێت، کاتێك دەڵێت ئەوەی لەمانای ئەمەدایە " کە خوای گەورە هێزی پێبەخشیوین دەتوانین پێی کردەی یەکێك لەو دوالیزمانە ئەنجام بدەین، کەبریتیە لە هێزی بێسنوور وپێی دەوترێت ویست–ارادە–، ئەو ئیرادەیەش بەدیهێنراوە بۆ خوا، لەکاتێکدا ئەو دەرەنجامەی کە لەوهێزە دەکەونەوە بەواتای تەواوەتی دەرەنجامی مرۆیین، واتە لە خودی مرۆڤەوەن، لەگەڵ ئەوەشدا بۆ ئەو هێزە بێ سنوورە ئازادی تەواوەتی نیە، چونکە کاریگەردەبێت بە هۆکارە دەرەکیەکان ئەوانەی کە خوای گەورە بەردەستی خستوین و دەستاو دەستی پێدەکەین.

ئەم هۆکارانە یارمەتیدەری تەواوکردنی کردەکانمانن، یاخود گۆڕانیان بەبێ جێبەجێبوونیان، هەڵدەستن بە دیاریکردنی هەڵبژاردنی یەکێك لە چارەسەرە جیاوازەکان. بەڵكو دەتوانین بڵێین کە ئەو هۆکارە دەرەکیانە لە زۆرینە بارودۆخەکاندا پاڵنەرمان دەبن بۆ کارکردن لەو کردانەی بەشێوەیەکی ناچاری (اضطراري)[2].

رب زدني علماً والحقني بالصالحين

---

[1] ( ٥٢٥ – ٥٩٥ الهجري ).

[2] التسيير والتخيير، سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٤٥ .

# المصادر والمراجع


١. أحكام القرآن ، لابن العربي أبي بكر محمد بن عبدالله، تحقيق علي محمد البجاوي، ط٢، مطبعة عيسى البابي الحلبي.
٢. أحكام القرآن ، لأبي عبدالله محمد بن أحمد الأنصاري القرطبي،ط٣.
٣. أحكام القرآن ، للامام أبي بكر احمد بن علي الرازي الجصاص، تحقيق صادق قمحاوي، نشر دار المصحف، القاهرة.
٤. إحياء علوم الدين ، الإمام الغزالي.
٥. الأشباه والنظائر، لابن نجم زين العابدين إبراهيم.
٦. أصول فقه الإسلامي في نسيجه الجديد، للدكتور مصطفى إبراهيم الزلمي.
٧. تبيين الحقائق للزيلعي
٨. تفسير الطبري.
٩. التفسير الكبير ، للامام فخر الرازي.
١٠. الجامع الصحيح للترمذي بشرح ابن العربي.
١١. الجامع الصغير، للإمام السيوطي.
١٢. الحريات العامة وحقوق الانسان، للدكتور محمد سعيد مجذوب.
١٣. الحق في احترام الحياة الخاصة، للدكتور حسام الدين كامل الاهواني.
١٤. دراسة اسلامية في العمل والعمال ، لبيب السعيد.
١٥. الدراية في تخريج احاديث الهداية، للحافظ ابن الحجر العسقلاني.
١٦. رد المختار ،لابن العابدين.
١٧. الرزق المستطاب ، للإمام محمد بن حسن الشيباني.
١٨. الروض النضير ، للعلامة شرف الدين احمد بن حسين الصنعاني.
١٩. زاد المعاد في هدى خير العباد محمد خاتم النبيين وإمام المرسلين ، للإمام العلامة ابن قيم الجوزية.
٢٠. سبل السلام ، للصنعاني.

٢١. سنن أبي داود ، تحقيق سعيد محمد اللحام، دارالفكر،ط١، ١٩٩٠م، بيروت.
٢٢. سنن الترمذي ، دار الفكر، ط٢، ١٤٠٣ ه ، بيروت.
٢٣. السنن الكبرى، للامام البيهقي.
٢٤. سنن النسائي.
٢٥. الشرح الكبير للدردير مع حاشية الدسوقي.
٢٦. شرح قانون العقوبات –القسم الاول، د.محمود نجيب الحسني.
٢٧. الصحاح في اللغة والعلوم.
٢٨. صحيح ابن خزيمة.
٢٩. صحيح الإمام البخاري.
٣٠. صحيح الإمام مسلم.
٣١. العقد الفريد،لابن عبد ربه.
٣٢. عمدة القارئ بشرح صحيح البخاري.
٣٣. الفتاوى البزازية على هامش الحضرية.
٣٤. الفتاوى التتارخانية على هامش الفتاوى، قاضيجان.
٣٥. فتح الباري بشرح صحيح البخاري ، للحافظ ابن حجر.
٣٦. الفردوس بمأثور الخطاب، للديلمي.
٣٧. فلسفة القانون الجنائي ، للأستاذ الدكتور علي راشد، محاضرات الدراسات العليا في القانون المطبوعة على رونيو.
٣٨. التيسير والتخيير بين الفلسفة والقانون، للأستاذ الدكتور رؤوف عبيد، ط٢، ١٩٧٦.
٣٩. في المسؤولية الجنائية ، للدكتور محمد مصطفى القللي.
٤٠. فيض القدير شرح الجامع الصغير للسيوطي، للمناوي.
٤١. القانون الجنائي ، د.علي راشد.
٤٢. قانون العقوبات العراقي رقم(١١١)لسنة ١٩٦٩.
٤٣. القانون المدني العراقي.
٤٤. القانون المدني لجمهورية روسيا الاتحادية الاشتراكية السوفيتية، ترجمة الدكتور ثروت الاسيوطي.
٤٥. كشف الخفاء، للعجلوني.
٤٦. كشف الغامض شرح منظومة قطر العارض في علم الفرائض، للشيخ معروف النودهي البرزنجي.
٤٧. لارق في القرآن ، للأستاذ إبراهيم هاشم قلالي.
٤٨. لسان العرب، لابن منظور.
٤٩. المبسوط، للطوسي.
٥٠. مجلة الاحكام العدلية.

٥١. مجمع الزوائد، للهيثمي.
٥٢. المحلى في الفقه الظاهري، لابن حزم.
٥٣. مدخل تاريخي لدراسة حقوق الانسان ، للدكتور محمود سلام زناني.
٥٤. المدونة الكبرى في الفقه المالكي.
٥٥. مسند الامام احمد ، دار صادر ، بيروت.
٥٦. مسند الربيع.
٥٧. مسند الشهاب.
٥٨. المعجم الاوسط ، للطبراني.
٥٩. المعجم الكبير، للطبراني.
٦٠. مغني المحتاج الى معرفة الفاظ المنهاج، للشيخ الشربيني.
٦١. المغني لأبن قدامة.
٦٢. الملكية في الشريعة الاسلامية ، للشيخ علي الخفيف.
٦٣. نزع الملكية في الأحكام الشرعية ونصوص القانون، لأحمد جمال الدين.
٦٤. نصب الراية للزيلعي.
٦٥. النظم السياسية، د. ثروت بدوي، ١٩٧٢.
٦٦. نيل الاوطار، للشوكاني.

پرۆفیسۆر مستەفا زەلمی

# مافی مرۆڤ و گەرەنتییەکانی لە ئیسلامدا

وەرگێرانی: عومەر عەلی غەفور

# ناوەرۆك

# پێشەکی

﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً﴾[1]

لە سەروەختێكدا خێزانی مرۆڤایەتی لە تاریكیدا دەژیا و یاسای جەنگەڵ حوكمی دەكرد، خوای گەورە محەمەدﷺی هەڵبژارد، تا ببێتە پەیامبەری و لەرێیەوە دەستووری خوا بە خەڵك رابگەیەنێ تا لەو تاریكییانە رزگاریان بكات و فەرموی ﴿كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ النَّاسَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ﴾[2].

ئامانجی ئەو دەستوورەیشی لەوەدا قەتیس كرد كە بریتییە لە بەدیهێنانی بەرژەوەندیی مرۆڤایەتی، لەبەرئەوەی ئەو خۆی لە جیهانییان بێنیازە، وەك دەفەرموێ ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾[3].

رەحمەتیش بەرژەوەندیی ماددی یان مەعنەوی، هی دنیا و ئاخیرەت، هی ئەرێنی (بەرژەوەندیی هێنراو) و نەرێنی (زیانی لادراو) دەگرێتەوە و –جیاواز لە یاسادانانە دانراو یاخود مرۆڤكرد (وضعي)ەكان– رازی نەبووە ماف و ئەركەكان بەسەر فەسڵ و

---

[1] سورة الإسراء :٧٠.
[2] إبراهيم: ١ .
[3] الأنبياء: ١٠٧ .

مادەکاندا دابەش بکا، ئەویش بۆ ئەوەی هەر سەحیفەیەك لە سـەحیفەکانی کۆگایـەك بێ هەموو پێویستییەکانی مرۆڤی لە سەرجەم بوارەکـانی ژیـان تێـدا بـێ، لـە مـاف و پابەندیەکان، ئەخلاق و بـەهاکان، ئـەحکامی خزمایـەتی و پەیوەندیـەکان، لەوەیشـدا تەنیا شتە گشتی (کلي)ەکانی باس کردوە و عەقڵی بەشەری سەرپشك کـردوە لەبـەر تیشکی پێداویستییە گۆڕاوەکانی ژیان و نوێیاوەکانی هەموو کات و شـوێنێکدا، شـتە جوزئیەکان بۆ ئەو کولیاتانە بگێڕێتەوە.

هەر کەسێکی ژیر و ئەقڵمەنـد لـە دەقـەکانی ئـەم دەسـتوورە ئیلاهییـە رابمـێنێ، دەبـینێ ئـەو رۆحـەی لـە سـەرەتایەوە تـا کۆتـای تێـدا بالأدەسـتە رۆحێکـی خێرخوازانەیـە، کـە بانگەشـە بـۆ زانسـت و کـار و ئـازادی و یەکسـانی و بـەزەیی و رێنیشاندان و راستی و چاکە و بەخشین و خۆنەویستی و ئەخلاق و بەهاکان و باقیی ئەو ئاکارەپەسەندانە دەکا کە پێویستە مرۆڤ خۆی پێیان برازێنێتەوە. هەروەها نەهی لـە سـتەم و دڵڕەقـی و تەفرەقـە و گـومڕایی و نـەفامی و چـروکی و دەسـتدرێژی و زۆرداری و جیاکاری و پێ لێراکێشان و باقیی ئەو ئاکارە دزێوانـە دەکـا کـە پێویسـتە مرۆڤ لێیان دوور بکەوێتەوە.

بەڵگەنەویستە ناتوانرێ بیر لەوە بکرێتەوە کەسێك مافی هەبێ و ئەرکی لەسەر بێ تـا ئەنـدامی کۆمەڵگەیـەك نـەبێ، لەبەرئـەوەی لەبەرانبـەر هـەموو مافێـك پابەنـدی (التزام)ێك هەیە. پابەند (ملتزم)ێك هەیە (کە خاوەن مافە) و پابەندێك هەیە بەرپرسـە لەو مافانەی کەسانیتر کـە لـە ئەسـتۆیدان.. کەواتـە مـاف چییە؟ پابەنـدی (التـزام) چییە؟ ئەستۆ (ذمة) چییە؟.

ماف: پێگەیەکی شەرعی (یان یاسایی)یە کە لەباریدایە خاوەنەکەی یان کەسێکیتر کەڵکی لێ وەربگرێ[١]. (ماف) ماددییە ئەگەر بە یەکێك لە پێنج هەستەکە دەرك بکرێ، ئەگینا مەعنەوییە. گشتییە، ئەگەر کەڵك لێوەرگرتنی لە تاکە کەسێکدا قەتیس نەبێ، ئەگینا تایبەتە.

پابەندی: بریتییە لە گرتنەئەستۆی واجبێك جا بە خۆویستانە بێ یان بەزۆر، کە بەهۆیەوە ئەستۆ بە مافێکی ئەویترەوە سەرقاڵ دەبێ تا جێبەجێ دەبێ[٢].

ئەستۆ: ئەستۆی مرۆڤ بریتییە لە گەردنی (واتە قوڕگی). وەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە ﴿وَكُلَّ إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَآئِرَهُ فِي عُنُقِهِ﴾[٣]. (طائر)یش بریتییە لە کردەوەی مرۆڤ بەچاك و خراپییەوە[٤]. نهێنیی تایبەتکردنی ئەم ئەندامەی لەشی مرۆڤیش بۆ پێوەهەڵواسینی ماف و ئەرکەکان ئەوەیە کە ئەڵقەی پێکەوەبەستنی نێوان دەزگای بیرکردنەوە (مێشك) و دەزگای کارکردنە (دەست و پێکان)[٥]. ئەمەیش بە مانای

---

[١] فەقیهەکانی شەریعەت (ماف)یان لەسەر ئەو بنچینەیە پێناسە نەکردوە کە شتێکی بەڵگەنەویست بێ، ئەولنەیشیان بەم شێوەیان کردبێ لە مانا زمانەوانیەکەی دەرنەچوون، کە بریتیە لە حوکمی شتێك، یان راستیی یان واجبی یان سبوت یان داپەروەریی ئەو شتە. هەر پێناسەیەك لە یاسا یان شەرحەکانیدا بینیومە، یان ناتەولو یان تەمومژاوییە.

[٢] لە هەڵە باوەکان لە یاسا و شەرحەکانیدا پێناسەکردنی پابەندییە بەوەی وابەستەییەکی یاساییە لەنێوان دوو کەسدا، یان پەیوەندیەکی یاساییە، یان حاڵەتێکی یاساییە، لەبەرئەوەی وابەستەیی و پەیوەندی لە گوتەی خستنەسەر (اضافة)ن، حاڵەتی یاساییش لە گوتەی چۆن–ە. پابەندیش لە گوتەی کارتێکران و هەڵچوون و کێشدارییە. ئەم دوو گوتەیەیش جیاوازن و ناکرێ یەکێکیان بەویتریان پێناسە بکرێ.

[٣] الإسراء:١٣

[٤] عەرەب نەریتیان وابوو وشەی (طائر)یان بۆ کار –خێر بێ یان شەڕ– بەکار دەهێنا لەبەرئەوەی بەشومیان دادەنا.

[٥] یەکێك لە هەڵەکانی شەرحەکانی یاسا پێناسەکردنی ئەستۆیە بەوەی کۆی ماف و پابەندیەکانی مرۆڤە یان دەفرەکەیانە، لەبەرئەوەی بوونی ئەو ماف و پابەندیانە پێشوەخت لەسەر بوونی ئەستۆ دەوەستێ. ئەگەر بوونی ئەستۆ لەسەر بوونی ئەوانە بوەستایە مەحاڵیی لۆژیکی روویدەدا. (المصادرة علی المطلوب).

زاڵكردنی خاوەن ماف نیە بەسەر جەستەی كەسە پابەندەكەدا- وەك لە یاسای رۆمانیدا وابوو- بەڵكو مەبەست سنووورداركردنی بەرپرسیارێتییە لە كەسی ئەودا. خۆ ئەگەر پابەندیەكە دارایی بوو ئەوا جێبەجێكردنەكە لە سامانەكەی دەبێ.

## سەرهەڵدانی بیرۆكەی ماف لە یاسا دانراوەكاندا:

ئەم بیرۆكەیە لە رووی فەلسەفیەوە لە سەردەمە هەرە دێرینەكانەوە پەیدا بووە، لە یاسای حەمورابیدا هەیە كە ساڵی (١٩٠١-١٩٠٢) لەلایەن نێردەیەكی فەرەنسیەوە لە شاری (سوسا)ی عێراق دۆزرایەوە. ئەو یاسایە ئەگەر بەراورد بكرێ بەو یاسایانەی بەر لە نزیكەی سێ هەزار ساڵ لەمەوبەر لای باقیی گەلانیتر هەبوون، بە كاملترین و دادپەروەرانەترین و پێشكەوتووترین یاسا دادەنرێ كە مرۆڤ بۆ رێكخستنی ژیانی خۆی و پاراستنی مافەكانی دایناب.

حەمورابی لە پێشەكیی یاساكەیدا دەڵێ "بێگومان بوونی خواوەند دادپەروەری لەسەر زەوی قایم دەكا، شەڕ و خراپە لە ئادەمیزاددا ناهێڵێت و لاواز لە ستەمی بەهێز دەپارێزێ"[١].

لەبەر كەمیی بوار، لێرەدا تەنها ئاماژە بە چەند نموونەیەكی كورتكراوە لە مافەكانی مرۆڤ لەو یاسایەدا دەكەم:

### ١- مافەكانی ئافرەت:

* "كەسایەتیەكی یاسایی سەربەخۆی بەدەست هێناوە كە ئازادیی هەڵسوكەوتكردنی یاسایی پێدەبەخشێ، هەروەها سامانی تایبەت و سەربەخۆی

---

[١] شريعة حمورابي، دراسة مقارنة مع التشريعات الحديثة، الأستاذ عباس العبودي، ص٢٢.

خۆی هەیە جیا لە سامانی مێردەکەی و مافی هەموو جۆرە بەکارهێنانێکی هەیە"[1].
مافی داوەریکردن (التقاضي) و بازرگانیکردن و وەرگرتنی وەزیفە کارگێڕیەکانی هەیە.
* ئەو پیاوەی ژنەکەی تەڵاق دەدات و منداڵی لێی بووە، دەبێ دەستبەرداری نیوەی سامانەکەی ببێ بۆ ژنەکەی تا منداڵەکانی پێ بەخێو بکا (م ١٣٧)، هەروەها ئەگەر منداڵیشی لێی نەبوو پێویستە قەرەبووی ئەو زیانانەی بۆ بکاتەوە کە بەهۆی تەڵاقدانیەوە تووشی دەبن (م ١٣٨).

٢- زەماناتی مافەکانی مرۆڤ لەبەردەم یاسادا:

* ئەگەر قازی (دادوەر) بەهۆی بەرتیل وەرگرتن یان هەر شتێکیترەوە حوکمەکەی گۆڕی، یان دەسەڵاتی خۆی قۆستەوە، دە هێندەی ئەو زیانەی لە خاوەن مافەکە، چسکاڵاکاریێ یان سکاڵالێکراو کەوتووە سزا دەدرێ، ئەمە جگە لە فەسلکردن و دوورخستنەوەی لە پیشەی دادوەری بەدرێژایی ژیانی (م ٥).
* یاسای حەمورابی مافی داوەتە هەر کەسێك کە هەست بە غوبن یان ستەم یان ناعەدالیەتیەك دەکا، راستەوخۆ سکاڵا بباتە لای دادگەی پاشا حەمورابی[2].
لە سەردەمی فەیلەسوفانی یۆناندا ئەو بیرۆکەیە لای ئەفلاتون و هاوڕێ و قوتابیانی سەری هەڵدا، بەڵام بەشێوەیەکی جوزئی نەبێ لە سەردەمە دووایییەکان و پلەبەپلە، لە یاسادانانە مرۆڤکردەکاندا روناکی نەبینی، کە بەم شێوەیە پەرەی سەند:
* ساڵی (١٢١٥ ز) لە ئینگلتەرا ئەوەی بە پەیمانی هەرە مەزن یان مەرجە گەورەکە یان ماگینا کارتا MaginaCarta ناسرابوو دەرچوو و میرە دەرەبەگەکان پاشا جان-یان ناچار کرد ئەو مەرجە ئیمزا بکا، ئەویشبەمەبەستی سنووردارکردنی دەسەڵاتی.

---

[1] تاريخ القانون، للدكتور هاشم الحافظ، ص١٦٦.
[2] القانون في العراق القديم، للدكتور عامر سليمان، ص٢٢٩.

* ساڵی (١٦٢٧ ن) لە سەردەمی پاشا شارلی یەکەم لە بنەماڵەی ستیوارد یاسای ڕاگەیاندنی مافەکان دەرچوو، تێیدا بڕیار درا "هیچ کەس ناچار ناکرێ هیچ سەرانەیەك بدات، یان دیاری یان بەخششی بەخۆڕایی بدات مەگەر بە بڕیارێکی پەرلەمان نەبێ".

* ساڵی (١٦٧٩ ن) پاشا جانی دووەم لە بنەماڵەی ستیوارد یاسای ناسراو بە یاسای ئازادکردنی جەستەی دەرکرد، بەو پێیە بەندکردنی کەسەکان قەدەغە کرا مەگەر بەهۆی قەرز یان تۆمەتێکی جینائی. ساڵی (١٨١٦ ن)یش بەندکردن لەسەر قەرزاری هەڵوەشێنرایەوە و تەنها ئەوانە مانەوە کە بە ئەنجامدانی تاوانی جینائی تۆمەتبار بوون.

* لە ١٤ی تەمموزی ١٧٧٦ ز بەڵگەنامەی جاڕدانی سەربەخۆیی ئەمەریکا ڕوونکردنەوەی هەندێ مافی لەخۆ گرتبوو، وەك مافی ژیان و ئازادی، مەبەستیشیان ئەوە نەبوو بەوە مافەکانی مرۆڤ بچەسپێنن، بەڵکو دەیانویست پاساو بدەنە ئەو جەنگەی دژی ئینگلتەرا ڕایانگەیاندبوو (١٧٧٥ ن).

* لە ٢٦ی ئابی ١٧٨٩ ز پاش شۆڕشی فەرەنسی، نوێنەرانی گەل بەیاننامەیەکیان بۆ مافەکانی مرۆڤ دانا و دانەرانی بەیاننامەکە دەیانویست لە هەر یەکێك لە مادەکانیدا خراپەیەك لە خراپەکانی ڕژێمی پێش شۆڕش بسڕنەوە، لەوانە چەوساندنەوەی ئاینی و سوکایەتیکردن بە ئازادییە کەسیەکان و بەناڕەوا خواردن و دەستبەرسەرداگرتنی ماڵی خەڵك.

گرنگترین ئەو شتانەی لە بەیاننامەکەدا هاتبوو، داننان بە یەکسانی و پاراستنی ئازادی و سەلامەتیی تاك و حورمەتی مڵکایەتی و مافی میللەت لە بەرەنگاریکردنی ستەم و زۆرداری بوون. ئەم مافانەیش لە دەستووری فەرەنسیدا دووپات کرانەوە کە لە (٣ی ئەیلولی ١٧٩١)دا دەرچوو. زانایانی یاسای گشتی ئەو مافانەی مرۆڤ لەو بەیاننامانەدا ڕاگەیەنران، بۆ بنەماکانی یاسای سروشتی دەگێڕنەوە کە دانایانی

ئەسینا بانگەشەیان بۆ دەکرد و پاشان فەیلەسوفەکانی هەردوو سەدەی حەڤدە و هەژدە کەوتنە ژێر کاریگەریەوە[1].

* دوای هەردوو جەنگە جیهانیەکە کە بوونە هۆی قەلاچۆکردنی ملیۆنان مرۆڤ و وێرانکاریەکی ئەوتۆ کە هێشتا ئاوەدان نەکراوەتەوە، لە کۆتایی کۆنگرەی نەتەوە یەکگرتووەکان تایبەت بە سیستمی ئەو ڕێکخراوە نێودەوڵەتییە کە لە سان فرانسیسکۆ بەسترا، میساقی نەتەوە یەکگرتووەکان دانرا (٢٦-٦-١٩٤٥) و لە (٢٤-١٠-١٩٤٥)ەوە چووە بواری کارپێکردن. سیستمی بنچینەیی دادگەی دادی نێودەوڵەتیش بەشێکی تەواوکەری میساقەکەیە.

لە پێشەکیی ئەو میساقەدا هاتووە: ئێمە گەلانی نەتەوە یەکگرتووەکان کە بڕیارمان داوە: نەوەکانی داهاتوو لە نەهامەتیەکانی جەنگ ڕزگار بکەین کە لە ماوەی یەك نەوەدا دوو جار خەم و کۆستی وای بەسەر مرۆڤدا هێناوە لە وەسفکردن نایەت. هەروەها سەرلەنوێ باوەڕی خۆمان بە مافەکان و بەو مافە یەکسانانەی پیاوان و ژنان و نەتەوەکان بەگەورە و بچوکیانەوە هەیانە دووپات دەکەینەوە.. هتد[2].

مادەکانی یەکەم و پەنجاو پێنجەم و پەنحا و شەشەم بەشێوەیەکی سەرەکی باسیان لە بابەتی مافەکانی مرۆڤ کردوە.

* پاشان لە (١٠-١٠-١٩٤٨) جاڕنامەی جیهانیی مافەکانی مرۆڤ لە کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە دەرچوو، کە سی مادەیە و کۆمەڵێ مافی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کەلتوری تێدایە، ئەمە جگە لە مافە تاکە کەسیەکانیتر.

---

[1] الدكتور عبدالسلام الترمانيني، حقوق الانسان في نظر الشريعة والقانون، ص١١ وما بعدها.

[2] بڕوانە: میثاق الامم المتحدة.

## بەشەکانی ماف:

زانا و شیکارانی یاسا و زانایانی ئوسولّ فیقهی ئیسلامی بەپێی بنەمای جۆراوجۆر مافیان بۆ چەند بەشێکی جیاواز دابەش کردوە. ئەمەی خوارەوە چەند کورتە نموونەیەکی ئەو بەشانەیە:

**یەکەم: بەشەکانی ماف لە یاسادا:**

یاساناسان لەسەر یەك جۆرە دابەشکردن یەکدەنگ نین، بەڵکو دابەشکردنی دوانە و سیانە و چوارە و پێنجە هەیە:

**أ- دووانە دابەشکردن**[1]:دابەشکردنی مافەکان بۆ مافە مادی و مەعنەویەکان. مافە مادیەکان ئەو مافانەن پەیوەندییان بە پێویستییە مادیەکانەوە هەیە وەك ئازادیی مڵکایەتی و کار و نیشتەجێبوون. مەعنەویەکانیش ئەوانە پەیوەندییان بە بیری مرۆڤەوە هەیە وەك ئازادیی عەقیدە و بیرورِا.

**ب- سیانە دابەشکردن**[2]: دابەشکردنی مافەکان بۆمافە کەسی و فیکری و ئابووریەکان. کەسیەکان وەك ئازادیی گواستنەوە و نیشتەجێبوون، فیکریەکان وەك ئازادیی بیرورِا و عەقیدە و فێرکردن، ئابووریەکانیش وەك مافی مڵکایەتی و بازرگانی و پیشەسازی.

**ج- چوارە دابەشکردن:** بۆ مافگەلی سیاسی و مەدەنی و ئابووری و کەلتووری[3].

**د- پێنجە دابەشکردن:** بۆ ئازادیی کەسی و جەستەیی، وەك مافی پاراستن لە بەندایەتی و چەوساندنەوە، بۆ مافی ئاسایش و ئازادیی تاکەکەسی، بۆ ئازادیی

---

[1] الدكتور عثمان خليل عثمان، الاتجاهات الدستورية الحديثة، ص١١١ وما بعدها.

[2] الدكتور ثروة بدوي، النظم السياسية، ص٤٠١.

[3] الدكتور سعيد محمد احمد، الاعلان العالمي لحقوق الانسان، ص٥.

ژیانی تایبەت، بۆ ئازادیی جەستەیی و گەرەنتیی پاراستن[1] لە دەربڕین و دەستدرێژی بۆ سەر ئابڕوو و شتی لەوجۆرانە، بۆ ئازادییە کەلتووری و مەعنەوییەکان.

وەك روونە زۆر لە بەشەکانی ئەم دابەشکارییە تێهەڵکێشی یەکترن، لەگەڵ ئەوەی پێویستە بەشکراو (القسیم) لەتەك هاوبەش-ەکەی جیاواز بێ، جیاوازبوونیش لەگەڵ تێهەڵکێشبووندا ناگونجێ، ئەمە جگە لەوەی لەسەر پێوەرگەلێکی بابەتیی نەگۆڕ دانەمەزراوە، بەڵکو لەسەر سەرپێوکردن (ئیستیقرا)ی ناتەواو دامەزراوە، ئەوەیش لە رووی لۆژیکیەوە پەسەند نیە.

**دووەم: بەشەکانی ماف لە ئوسوڵ فیقهی ئیسلامیدا:**

زانایانی ئوسوڵ لە دوو بواردا قسەیان لەسەر بەشەکانی ماف کردوە، یەکەمیان: لەکاتی گەڕانیان بەدوای حوکمی شەرعیدا ئەو شتەی حوکمەکەی تێدا دەدرێ بە لە رووی خاوەن ماف یان سوودلێبینەری دابەشیان کردوە بۆ: ئەو مافانە ساف هی خوان، هەروەها مافە هاوبەشەکان. مافەکانی خوایشیان بۆ هەشت بەش دابەش کردوە: عیباداتی رووت، سزای رووت، سزای رێبڕ (قاصرة) وەك بێبەریکردنی بکوژ لە میراتی دەستکوژەکەی، مافێك کە لەنێوان عیبادەت و سزاداندا دەخولێتەوە وەك گوناهشۆری (کفارة)، ژیاندنێك کە مانای عیبادەتی تێدایە وەك زەکات، عیبادەتێك مانای ژیاندنی تێدایە وەك سەرفیترە، ژیاندنێك سزادانی تێدایە وەك باجی خەراج، مافێك کە لەسەر پێی خۆی وەستاوە وەك مافی دەوڵەت لە کانزاکاندا. مافە پەتیەکانی بەندە (واتە مرۆڤ)یشیان بۆ: مافە ماڵییەکان، مافە خێزانیەکان، مافە هاوبەشەکان کە سوودی گشتی و تایبەتیان تێدا کۆدەبێتەوە، دابەش کردوە.

---

[1] الدكتور احمد حافظ نجم، حقوق الانسان بين القران والاعلان، ص٣٢.

هەروەها لـە رووی گرنگیشـیانەوە مافـەکانیان دابـەش کـردوە بـۆ: بەرژەوەندییـە پێویست (الضرورية)یەکان، کە بریتییە لە پاراستنی ئـاین و ژیـان و نـاموس و مـاڵ و عەقڵ، پێیشی دەوترێ زەروری لەبەرئەوەی ئەگـەر ئەوانـە تێکچـوون یـان یـەکێکیان پەکی کەوت، سیستمی ئەو کۆمەڵگەیە تێك دەچێ. هەروەها بەرژەوەندییەگرنگـەکان (الحاجيـة) کـە نـەبوونیان دەبێتـە مایـەی تەنگەبـەری و شـەرمەزاری لـە کۆمەڵگـەدا. سێیەمیشیان بەرژەوەندییەو تەواوکاری وجوانکارییە (الكمالية و التحسينية).

ئەم دابەشکاریانەیش وەك دابەشکارییە یاسـاییەکان لەسـەر دیسـپلین و پێـوەری جێگیر دانەمەزراون، لەبەرئەوەی مافە پەتیەکانی خوا تـەنیا لـەو بەشـە باسـکراوانەدا قـەتیس نـابن، هـەروەها دەشـێ بـەهۆی گۆڕانکاریـەکانی ژیانـەوە پێویسـتیەکی تـەواوکاری ببێتـە گـرنگ و بەپێچەوانەیشـەوە. لەبەرئـەوە پێویسـتە مافـەکانی مـرۆڤ لەسەر بنچینەی دیسپلینی جێگیر دابەش بکرێن، کە بریتین لـە پابەنـد (بـەرپرس لـە مافەکە)، لەگەڵ بۆ پابەند (خاوەن ماف)، چونکە بەشەکانی مافـەکانی مـرۆڤ لەسـەر ئەم دوو بنچینەیە لە چوار بەشدا قـەتیس بـوون، کـە بـریتین لـە: مـافی تـاك لەسـەر کۆمەڵگە (کە لە دەوڵەتدا خۆ دەنوێنێ)، مافی کۆمەڵگە لەسەر تاك، مافی تاك لەسەر تاك، مافی کۆمەڵگە لەسەر کۆمەڵگە. وەك بەشێکی سەربەخۆیش (مافـەکانی خـوا)ی بۆ زیاد دەکرێ، لەو رووەوە گەرەنتییـە بـۆ جێبـەجێکردنی ئـەو چـوار بەشـە. لەبـەر تیشکی ئەم دیسپلینانە و لە پێنج بەشدا لێکۆڵینەوە لەم پێنج بەشانە دەکرێ.

لەبەر زۆریی ئەم مافانە تەنها گرنگترینیان باس دەکەین و بە مافە زەرورییەکان دەست پێدەکەین کە لە ئوسولّی فیقهی ئیسلامیدا پێیان دەوترێ بەرژەوەندییە زەرورییەکان یان مەقاسیدە زەرورییەکانی شەریعەتی ئیسلامی، کە بریتین لە پاراستنی دین (عەقیدە) و ژیان و ناموس و ماڵ و عەقڵ. بەڵام شوێنی باسکردنی بابەتی پاراستنی عەقڵ بەشی سێیەمە (مافەکانی کۆمەڵگە لەسەر تاك). لەوانەیش ئەمانەی خوارەوە:

## ١- مافی پاراستنی عەقیدە (یان ئازادیی عەقیدە):

هەموو مرۆیەك عەقیدەیەكی هەیە كە بەزۆری پێیەوە پابەندە. ئازادیی عەقیدە بریتییە لە مافی تاك لە باوەڕهێنان بەو ئاینەی دەیەوێ و مافی لە جێبەجێكردنی ڕێوڕەسمە ئاینیەكانی. لە ئیسلامدا پێویستە بە گیان و بەماڵ بەرگری لە ئاینی ئیسلام بكرێ، كە پێی دەوترێ جیهاد. لەبەر گرنگیشی بەیەكێك لە روكنەكانی ئیسلام دادەنرێ، بەڵام لە هەمان كاتدا خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرمانی كردوە كە لە ئایندا زۆرلێكردن دروست نیە و شوێنكەوتوانی ئاینەكانیتری ئازاد كردوە لە ئەنجامدانی ئەركە ئاینیەكانیان، بۆیە مافی ئەوەمان نیە كەس ناچار بكەین باوەڕ بە ئاینی ئیسلام بێنێ و شوێن دینەكەی ئێمە بكەوێ، لەبەرئەوەی ئازادیی خەڵك لە بیروباوەڕدا شتێكی پیرۆزە لە ئیسلامدا و پێویستە ڕێزی بگیرێ. قورئانی پیرۆز لە زۆر ئایەتدا ئەم مافەی دووپات كردۆتەوە، لەوانە ﴿لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ﴾[1] واتە لەم ئاینەدا زۆری وسەرفرازی و هیدایەت درەوشاوەنەتەوە و ئیتر

---

[1] البقرة: ٢٥٦.

پێویست بە زۆرلێکردن ناکا. هەروەها خوا بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێ ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَا أَنْتَ مُذَكِّرٌ، لَسْتَ عَلَيْهِمْ بِمُسَيْطِرٍ﴾[1]. هەروەها دەفەرموێ ﴿أَفَأَنْتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ﴾[2].

لەباتیی زۆرلێکردن خوای گەورە فەرمانی بە موسڵمانان کردوە بە عەقڵ و بەڵگە و لۆژیك و حیکمەت و ئامۆژگاریی جوان ناموسڵمانەکان بۆ باوەڕهێنان بە ئیسلامبانگ بکەن. وەك دەفەرموێ ﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾[3].

**بابەتی جیزیە:**

ئیسلام بۆ ئەوەی جیزیەی لەسەر ئەهلی کیتاب فەرز نەکردوە تا ناچاریان بکا موسڵمان ببن، بەڵکو ئەوە لەبەرانبەر پاراستن و بەرگری لێکردن و بەخشینیان بووە لە ئەرکی سەربازی، لەبەرئەوەی ئەسڵ وایە شەڕ لە ئیسلامدا بۆ پاراستنی ئاینە کاتێ دووچاری دەستدرێژی ببێتەوە و ماقوڵ نیە ناموسڵمان بێت و بەرگری لە ئیسلام بکا.

**بابەتی هەڵگەڕانەوە(الردە) و سزای هەڵگەڕاوە:**

هەڵگەڕانەوە لە ئاین بریتییە لە دەرچوونی موسڵمان لە ئاینی ئیسلام بۆ ئاینێکیتر یان هیچ ئاینێك، ئەمەیش لە شەریعەتی ئیسلامیدا دروست نیە، چونکە ئەوەی بە ئازادی و هەڵبژاردنی خۆی باوەڕ بە ئیسلام بێنێ، پاشان هەڵبگەڕێتەوە و دژی ئیسلام بوەستێ سزای لەناوبردنە، ئەوەیش نەك بۆ ناچارکردنی بۆ موسڵمانبوون، بەڵکو لەبەر ناپاکیکردنی لە هەڵوەشاندنەوەی ئەو پەیمانەی بە خوای

---

[1] الغاشية: ٢١-٢٢.

[2] يونس: ٩٩.

[3] النحل: ١٢٥.

داوە. ئەم سزایەش بە حەدیسێکی پێغەمبەر ﷺ چەسپاوە کە دەڵێ:( من بدل دینه فاقتلوه)[1].

سزای کوشتنی هەڵگەڕاوە لە قورئاندا نەهاتووە، بەڵکو خوا دەفەرموێ:﴿وَمَنْ يَرْتَدِدْ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُولَئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ﴾[2]. پێغەمبەری مەزن لەکاتێکدا فەرمانی بە کوشتنی هەڵگەڕاوەکردوە کە ئەو کەسە دەچووە ناو دوژمنانی ئیسلام و نهێنی موسڵمانانی بۆ دەبردن، یان خراپەی لەسەر زەویدا بڵاو دەکردەوە. جیاوازی هەیە لەنێوان دەرچوون لە ئیسلام و دەرچوون دژی ئیسلام، لە حاڵەتی یەکەمدا خوێن و ماڵی ئەو کەسە پارێزراو دەبێ، بەڵام لە حاڵەتی دووەمدا پاش ئەوەی داوای تۆبەی لێدەکرێ، دەکوژرێ، ئەویش نەك لەبەر هەڵگەڕانەوەی لە دینەکە، بەڵکو لەبەر خراپەکردنی لەسەر زەوی.

لەمەوە دەگەینە ئەو ئەنجامگیریەی کە ئەگەر ئەو کەسەی لە ئیسلام پاشگەز دەبێتەوە،بە زمان یان قەڵەم یان کارکردن دژی ئیسلام وەستا، دەکوژرێ، بەڵام تەنها هەڵگەڕانەوە کوشتنی واجب ناکا.

لە ئیسلامدا بەدەگمەن نەبێ کوشتنەوە نیە، نە بەردبارانکردن و نە کوشتنەوەی هەڵگەڕاوی بێوەی و خراپەنەکار لە قورئاندا نیە، هەرچی تۆڵەی یاسایی (واتە قصاص) شتێکی حەتمی نیە، بەڵکو بەر لە جێبەجێکردنی قیساس سێ بژارە دراوەتە خاوەن خوێن. خوای گەورە دەفەرموێ ﴿وَمَن قُتِلَ مَظْلُوماً فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِ سُلْطَاناً﴾.کە بریتین لە دەسەڵاتی داواکردنی جێبەجێکردن و دەسەڵاتی پەشیمانبوونەوە لە قیساس و گۆڕینی بە خوێنبایی، هەروەها دەسەڵاتی دەستبەرداربوون لە هەردووکیان و بەتەواوی لێخۆشبوونی تاوانبار.

---

[1] صحيح البخاري، باب لا يعذب بعذاب الله: ٣/١٠٩٨.

[2] البقرة: ٢١٧.

## ٢- مافی پاراستنی ژیان:

پاراستنی ژیان پلەی دووەمی هەیە لەنێو زەروریاتەکاندا پاش پاراستنی ئاین و ئازادیی عەقیدە. مافی پاراستنی گیان یان خوار گیانی تاکەکان ئەرکی سەرشانی کۆمەڵگەیە و پێویستە دەوڵەت تەواوی پێداویستیەکانی ئەو پاراستنە دەستەبەر بکا. شەریعەتی ئیسلامی گرنگیەکی گەورەی بە پاراستنی مافی ژیان داوە، هەر بۆیە کوشتنی بەناهەقی حەرام کردوە و لە تاوانە گەورەکانی داناوە، خوا دەفەرموێ﴿وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ﴾[1]. هەروەها دەفەرموێ﴿مَنْ قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا﴾[2]. خۆکوشتنی بە هەر هۆیەك حەرام کردوە لەبەرئەوەی ژیانی مرۆڤ تەنها موڵکی تایبەتی ئەو نیە، بەڵکو بەشی کۆمەڵگەیشی تێدایە. خوا دەفەرموێ ﴿وَلَا تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ﴾[3].

هەروەها لە حاڵەتی زەرورەتدا شتە حەرامکراوەکانی حەڵاڵ کردوە ئەگەر رزگارکردنی ژیانیان پێوە بەسترابوو، دەفەرموێ ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللَّهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ﴾[4]. هەروەها مافی بەرگریکردنی شەرعی لە گیان و خوار گیانی واجب کردوە﴿فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾[5]. قیساسی فەرز کردوە بۆ ئەوانەی دەستدرێژی دەکەنە سەر گیان و خوار گیانی مرۆڤ و دەفەرموێ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ وَالْعَيْنَ بِالْعَيْنِ﴾[6]، هەروەها دەفەرموێ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي

---

[1] الانعام: ١٥١.

[2] المائدة: ٣٢.

[3] النساء: ٣٩.

[4] البقرة: ١٧٣.

[5] البقرة: ١٩٤.

[6] المائدة: ٤٥

﴿الْقَتْلَى﴾[1].. لەسەر دەسەڵاتداری وڵات (واتە وەلیئەمر) پێویستە سزای تەمێکردن (تعزیر) بەسەر هەر کەسێکدا بسەپێنێ کە کەسانیتر ئازار دەدات و کارێك دەکا زیان بە تەندروستی و سەلامەتییان دەگەیەنێ.

ئیسلام لەسەر ئادەمیزادی واجب کردوە بایەخ بە خۆی و تەندروستی بدا. پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ (ان لربك عليك حقا ولنفسك عليك حقا ولاهلك عليك حقا، فأعط كل ذي حق حقه)[2].

زۆر لە مافە کەسی و سروشتیەکان بۆ پێداویستیەکانی ژیان دەگەڕێنەوە.

## ٣- مافی پاراستنی ناموس (العرض):

شەریعەتی ئیسلامی گرنگی بە مافی پاراستنی ناموس و رەچەڵەك داوە، ئەویش لەبەر ئەو گرنگی و هەستیاریەی هەیەتی، لەبەرئەوەی پەیوەندی بە شەرەفی مرۆڤ و ناوبانگی خێزانەوە هەیە. بۆ پاراستنی ئەم مافەیش ئیسلام بۆ ساغکردنەوەی تاوانی زیناکردن بوونی چوار شایەتی کردۆتە مەرج،بۆ ئەوەی شتەکە ساغ نەبێتەوە و زیان بە سومعەی بنەماڵەکە بگەیەنێ. لە هەموو مێژووی ئیسلامدا تاوانی زینا لەرێی شایەتەوە ساغ نەبۆتەوە. لەپێناو پاراستنی ناموسدا ئیسلام تەماشاکردنی ئابڕووی خەڵکی حەرام کردوە، خەڵوەتی لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەم بەبێ بوونی مەحرەمێك حەرام کردوە، هەروەها بەکردەوە دەستدرێژیکردن بۆ سەر ناموسی حەرام کردوە. خوا دەفەرموێ﴿وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَا إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلًا﴾[3]، ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي

---

[1] البقرة: ١٧٨.

[2] صحيح البخاري، كتاب الصيام، ص٤٩٠.واتە: پەروەردگارت مافی لەسەرتە و خۆت مافت لەسەر خۆت هەیە و خێزانەکەت مافی لەسەرتە، هەموو کەس مافی خۆی پێبدە.

[3] السراء: ٣٢.

فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ﴾[1]. هەروەها بە قسەیش حەرامی کردوە کە پێی دەوترێ (قزف)، خوا دەفەرموێ ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَداً وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾[2].

لە قورئاندا بەردبارانکردن (واتە رەجم) نیە لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

١- دەستەواژەی (الزانیە والزانی) دەربڕینی گشتین لەبەرئەوەی لەو وەسفانەن (ال)ی ئیستیغراقیان چووەتە سەر و پیاوان و ئافرەتانی هاوسەردار و جگە لەوانیش دەگرێتەوە. ئەو بڕیاری رەجمکردنەیش پێغەمبەر داویەتی ئیجتیهادی خۆی بووە و چاوی لە تەورات کردوە. بەڵام ئەم بڕیارە بە ئایەتی (الزانیە والزانی) نەسخ کراوەتەوە لەبارێکدا وا دابنێین رەجمکردنەکە بەر لە دابەزینی ئایەتی جەڵد بوویێ، کە ئەمەیان راستە. ئەگەر وایش دابنرێ پاش دابەزینی ئایەتەکە بووە، کە ئەوە زۆر دوورە، ئەوا کار بە قورئان دەکرێ نەك بە سوننە، ئەویش بەهۆی بوونی دژیەکی بەشێوەیەك ناکرێ کۆبکرێنەوە، لەبەرئەوەی سەرچاوەی حوکمە شەرعیەکان قورئانە، هەرچی سوننەیە ئەرکی روونکردنەوەیە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾[3]. هەروەها دەفەرموێ ﴿اتَّبِعْ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ﴾[4]. و﴿وَاتَّبِعْ مَا يُوحَى إِلَيْكَ﴾[5]. ﴿وَاتَّبِعْ مَا يُوحَى إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ﴾.[6]

---

[1] النور: ٢

[2] النور: ٤

[3] النحل : ٤٤

[4] الأنعام : ١٠٦

[5] يونس : ١٠٩

[6] الأحزاب : ٢

٢- بەپێی ئەو ئایەتەیباس لە سزای زیناکردنی کۆیلـە و کەنیزەکـە هاوسـەردارەکان کە نیوەی سزای ئازادەکانە و دەفەرموێ ﴿فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى الْمُحْصَـنَاتِ مِـنَ الْعَذَابِ﴾[1]. دیاریشە کە بەردبارانکردن کوشتنە (تا مردن)، کوشتن یان مـەرگیش نیوەی نیە.

٣- سـزای بـەردبارانکردن لـە عـورفی سـەردەمی نـەفامی و لـە تەوراتـدا هـەبووە. پێغەمبەریشﷺ بەر لە دابەزینی وەحی کاری بەوانە دەکرد و کارەکەی پشتی بەو دوو سەرچاوەیە دەبەست. ئەو دەقەیش دەڵێ (الشیخ والشیخه فارجموهما البته) نەریتێکی جاهیلییە و هیچ بناغەیەکی لە قورئاندا نیە.

٤- سزای بەردبارانکردنسەختە و سەختیش لە حوکمەکانی خـوادا نیـە، لەبەرئـەوەی سەرجەم حوکمەکانی هەڵگری سیفەتی دادپەروەرین، کە بریتییـە لـە هاوسـەنگی لەنێوان قەبارەی تاوانەکە و قەبارەی سزاکەدا.

٥- لە بارێکدا وا دابنـرێ سزاکە مـاوە، ئـەوا وەك نـەبوو وایـە، لەبەرئـەوەی لەسـەر سەلماندنی تاوانەکە بە چوار شـایەتی دادپـەروەر وەسـتاوە کـە هـیچ جیاوازیـەك لەنێوان دەربڕین و مانای ئیفادەکانیاندا نەبێ. ئەمەیش بەکردەوە مەحاڵە. قورئان سەد جەڵدەی بۆ عازەب و هاوسەرداری نێر و مێ داناوە. خوا دەفەرموێ ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ﴾[2].

هەروەها دەستدرێژیکردنە سەر ناموسی بە قسە (قەزف) حـەرام کـردوە و سـزای بۆ داناوە وەك خوا دەفەرموێ ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَـمْ يَـأْتُوا بِأَرْبَعَـةِ شُـهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُولَئِـكَ هُـمُ الْفَاسِـقُونَ﴾[3]. ئـەوەیش

---

[1] النساء: ٢٥

[2] النور: ٢

[3] النور: ٤.

لەپێناو پاراستنی ناموسی خەڵکە لە زماندرێژی.

## ٤- مافی پاراستنی ماڵ و مافی خاوەنداریتی:

ئیسلام ئەم مافەیشی لە ریزی بەرژەوەندییە زەروریەکاندا داناوە و پێویستە کۆمەڵگە دەستی بۆ نەبات، دەبێ دەوڵەتیش بیپارێزێ. ئیسلام کۆمەڵێ هۆی رەوای بۆ بەدەستهێنانی ماڵ و سامان و مافی خاوەنداریتی یاخود ملکایەتی داناوە، لەوانە: گرێبەستەکان، بەخشینەکان، وەسێت، میرات، هەبوونی ئەو سامانە موباحانەی موڵکی کەس نین. هەروەها بە دەلیلی بنبڕ هەموو زیادەڕەویکردنە سەر ماڵ و سامانی کەسانیتری بەناهەق حەرام کردوە ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلَّا أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ﴾[1].

پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: (لا يحل لأمرء مسلم من مال اخيه شئ الا بطيب نفس منه)[2]. سزایەکی توندی بۆ هەر کەسێك داناوە کە دەستی دزی بۆ ماڵی کەسێکیتر درێژ بکا، خوا دەفەرموێ ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا جَزَاءً بِمَا كَسَبَا نَكَالًا مِنَ اللَّهِ﴾[3].. هەموو زیادەڕەویکردنێك بۆ سەر ماڵی کەسانیتر بەبێ پاساوێکی شەرعی، تاوانێکی ئابوورییە و تاوانبار سزایەکی تەمێکارانەی دەدرێ.

## ٥- مافی پاراستنی عەقڵ:

ئەمەیش یەکێکە لە ئەرکەکانی کۆمەڵگە لەسەر تاك و لە بەشی سێیەمدا باس دەکرێ.

---

[1] النساء: ٢٩.

[2] سنن الدارقطني: ٢٦/٣، برقم(٩٠). بە ریوایەتیتری نزیك لەوەیش هاتووە. واتە ماڵی هیچ موسڵمانێك بۆ موسڵمانێکیتر حەڵاڵ نیە بە رەزای دڵی خۆی نەبێ.

[3] المائدة: ٣٨.

## ٦- مافی یەکسانی لەبەردەم شەرع و یاسادا:

مەبەست لە یەکسانی نادیدەگرتنی پێکهاتە و لێهاتنە خودی و شارەزاییە کەسیەکان و ئەو سوود یان خزمەتەی هەر کەسێك پێشکەشی کۆمەڵگەکەی دەکا نیە، بەڵکو مەبەست لە یەکسانییە لە ماف و پابەندیەکان لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵگەدا، بناغەی ئەم یەکسانییەش لە ئیسلامدا ئەوەیە خەڵك هەموویان لە بنچینەی دروستبوون و پێکهاتندا یەکسانن، هەرهەموویان لە یەك کانزا خەڵق کراون کە خاکە، خوا دەفەرمویٚ ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ إِذَا أَنْتُمْ بَشَرٌ تَنْتَشِرُونَ﴾[1]. هەموویشیان لە هاوڕەچەڵەکیدا یەکسانن، لەبەرئەوەی هەموویان خوشك و بران و لە یەك دایك و باوکن. خوا دەفەرمویٚ ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾[2].

پێغەمبەرﷺ لە خوتبەی حەجیماڵئاوایی (حجة الوداع)دا پێداگری لەسەر ئەم بنەمایانە کرد و فەرموی(كلكم لادم وادم من تراب)[3]. ئیسلام هەموو جیاکارییەکی لەسەر بنچینەی نەژاد و ڕەنگ و ئاین و مەزەب و هەرێمی بە ڕواڵەتی دواکەوتن و گەڕانەوە بۆ نەفامیی یەکەم داناوە، ئەوەتا کاتێ ئەبوزەری غەفاری-خوا لێی ڕازی بێ- تانەی ڕەشیی دایکی لە خزمەتکارەکەی دەدات و پێی دەڵێ: ئەی کوڕی ژنە ڕەشەکە، پێی دەفەرمویٚ (انك امرء فيك الجاهلية)[4].

کاتێکیش پرسیاری لێکرا: کێ باشترین خەڵکە؟ دوو مشت خۆڵی هەڵگرت و گوتی: "کام لەم دووانە باشترە؟ خەڵك لە خاك دروست کراون و بەڕێزترینیان

---

[1] الروم: ٢٠.

[2] الحجرات: ١٣.

[3] مسند الربيع، ص١٧٠ برقم (٤١٩)، ومسند البزار: ٣٤٠/٧، برقم(٢٩٣٨).واتە: هەمووتان لە ئادەمن و ئادەمیش لە خاکە.

[4] صحيح البخاري:٢٠/١، برقم (٣٠).واتە: تۆ کەسێکیت نەفامیت تێدایە.

بەتەقواترینیانـە". ئەمـەی کـردە بنچـینە بـۆ ئـادەمیزاد و ئـیتر جیاوازییـان لـە شـتە لاوەکی و نیشانە خودی و دەرەکیـەکانی وەك رەنـگ، جـۆر، زمـان، ئـاین، مـەزەب، حەسەب و نەسەب، کات و شوێن، کار لەم جەوهەرە ناکا. ئەم یەکسانییە لـە دیمەنـە گشتیەکەیدا تەواوی وێنەکانی یەکسانیەکانیتر دەنوێنێ.

لە ئیسلامدا ئامانج لـە یەکسـانی ئەوەیـە خـەڵك هـەموو یـەك ئۆمـەت بـن، ڕۆڵـەی سەرجەم کۆمەڵگە و گەلان سەردار بن و دوو چین نەبێ چینی سەردار و چینی بەندە، چونکە بەندایەتی تەنها بۆ خوای باڵادەستە، هەر ئەمەیشە خوای گـەورە کردوویـەتی بە دروشمی موسڵمان و ڕۆژانە دەیان جار دووبـارەی دەکاتـەوە و دەڵـێ﴿إِيَّـاكَ نَعْبُـدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾[1]. لێرەدا –وەك زانایانی ڕەوانبێژی دەڵـێن– بـەرکار (مفعـول بـە)ی پێش فەرمان (فعل)ەکە خراوە تا سنووردار (حەسر)ی بکا.

ئەگەر مەبەست لە یەکسانی، یەکسانی بێ لە ماف و ئەرکەکاندا، ئەو بەرهەڵستییە جێی نابێتەوە کە دەڵێ یەکسانیی ڕاستەقینە لـەنێوان مرۆڤەکانـدا دادپـەروەری تێـدا نیە لەبەرئەوەی مرۆڤەکان لە توانا و پلەی زانستی و بەهرە و بەرهەمدا جیاوازن، پیاو ناتوانێ هەموو ئەرکەکانی ئافرەت بکات و بەپێچەوانەیشەوە، نەزانی دەبەنگ نـاتوانێ ئەوە پێشکەشی کۆمەڵگە بکا کە کەسێکی بلیمەت و داهێنەر و دۆزەرەوە پێشکەشی دەکا، هـەروەك نـاکرێ تاوانبـار و بێتـاوان وەك یـەك مامەڵـەیان لەتـەك بکـرێ و بـەم شێوەیە.

وەڵامـی ئەمـەیش ئەوەیـە یەکسـانی لەبـەردەم شـەریعەت و یاسـادا لـە مـاف و ئەرکەکاندایە، هەر کەس زیاتر لە ئەرکەکانی مافی پێبدرێ، ئەوە زیادەڕەویکردنە بـۆ سەر مافی گشتی و مافی کۆمەڵگە. دیسان هـەر کـەس بـەبێ ڕەزای خـۆی زیـاتر لـە مافەکانی ئەرکی بخرێتە سەر شان، ئەوە ستەم و زیادەڕەویکردنە بۆ سەر مافەکانی.

---

[1] الفاتحة: ٤.

دەستووری ئیلاهی چواردە سەدە بەر لەوەی جارنامەی جیهانیی مافەکانی مرۆڤ لە مادەی یەکەمیدا ئەو مافە بچەسپێنێ، مافی یەکسانیی مرۆیی چەسپاندوە[1].

پێغەمبەریش لە حەجی ماڵئاوایی لە ساڵی دەی کۆچی (٦٢٣ ز)دا ئەوەی دووپات کردەوە کاتێ فەرموی (یاایها الناس! ان ربکم واحد، وان اباکم واحد، کلکم لادم وادم من تراب، إن اکرمکم عند الله اتقاکم، ولیس لعربي علی عجمي ولا لعجمي علی عربي، ولا لاحمر علی ابیض، ولا لابیض علی احمر فضل الا بالتقوی)[2].

سەرباری هەموو ئەمەیش، دوو خاڵ هەیە کە دوژمنانی ئیسلام و نەفامانی نێو موسڵمانان بۆ تانەدان لە ئیسلام قۆستویانەتەوە، ئەوانیش کۆیلایەتی و مافی ئافرەتن. لێرەدا هەوڵ دەدەم بەکورتی وەڵامیان بدەمەوە.

**یەکەم: سیستمی کۆیلایەتی بەکۆیلەکردنی مرۆڤە بۆ مرۆڤی برای:**

ئەوانەی لە هەڵوێستی ئیسلام سەبارەت بە کۆیلایەتی بێئاگان دەپرسن: ئەگەر راستە بەلای ئیسلامەوە مرۆڤەکان لەرووی مرۆییەوە یەکسانن، ئەی بۆچی سیستمی کۆیلایەتی پەسەند کردوە؟

وەڵام ئەوەیە: ئیسلام سیستمی ئازادکردنی لەگەڵ خۆی هێناوە و هەرگیزاو هەرگیز سیستمی کۆیلایەتی و بەکۆیلەکردنی پەسەند نەکردوە. بەڵام لە بارێکدا سیستمی کۆیلایەتی زەلکاوێکی بۆگەن بوو کە لە حەوت جۆگەلەوە ئاوی تێ دەڕژا،

---

[1] کە دەڵێ "خەڵك هەموو بەئازادی و یەکسان لە کەرامەت و مافدا لەدایك دەبن، هەموو عەقڵ و ویژدانیان پێ بەخشراوە و پێویستە بەگیانی برایەتی مامەڵە لەتەك یەکتر بکەن".

[2] بڕوانە: مسند الربیع، ص١٧٠، برقم(٤١٩). والمعجم الکبیر، للطبراني:١٢/١٨، برق(١٦). واتە: خەڵکینە! پەروەردگارتان یەکە، باوکتان یەکە، هەموو لە ئادەمن و ئادەمیش لە خاکە، بەرێزترینتان بەلای خواوە بەتەقواترینتانە، نە عەرەب بەسەر عەجەم و نە عەجەم بەسەر عەرەب، نە سوور لەسەر سپی و نە سپی لەسەر سوور فەزڵی نیە مەگەر بەتەقوا.

ئیسلام پلەبەپلە ئەو جۆگەلانەی وشك كرد تـا بـەبێ هـیچ پەرچـەكردارێكی نـەرێنی خۆی وشك دەكا. جۆگەلەكانیش بریتی بوون لە:

١- جەنگ بەهەموو جۆرەكانیەوە: ئەو دیلەی لە جـەنگێكی نـاوخۆ یـان دەرەكیـدا دەگیرا، چارەنووسی یان كوشتن یان بەكۆیلەكردن بوو.

٢- چەتەگەری و رفاندن و بەتالانیبردن: قوربانیانی ئـەم دەسـتدرێژیانە وەك دیلـی جەنگ مامەڵەیان لەتەك دەكرا و كۆیلایەتییان بەسەردا دەسەپێنرا.

٣- ئەنجامدانی هەندێ تاوانی مەترسیدار: وەك كوشتن و دزی و زینا. سزای ئەمانە حوكمدانی تاوانبار بوو بەوەی ببێتە كۆیلەی دەوڵەت یان تاوان دەرهەق كراو یان میراتگرانی.

٤- هـەژاریی بـەربڵاو: ئـەوەی پـەنای بـۆ قـەرزكردن دەبـرد، كـاتێ نەیـدەتوانی قەرزەكەی بداتەوە چەندقات سووی دەچووە سـەر، ئـەویش لـە كۆمەڵگەیـەكی هەژاردا كە پێوەرەكانی دادپەروەری تێیدا لاسەنگ بـوون. ئـەو سـووە دەبـووە مایەی زیادبوونی رادەی هەژاری و كابرای قەرزاری بـۆ نێـو زەلكـاوی كۆیلایـەتی راپـێچ دەكـرد، بەشـێوەیەك خـاوەن قـەرز بـۆی هـەبوو قەرزارەكـە و ژن و منداڵەكانی وەك كۆیلە بفرۆشێ تا لە پارەكەیان قەرزەكەی خۆی هەڵبگرێتەوە.

٥- دەسەڵاتی مرۆڤ لەسەر خۆی: لەكاتی نەبوونیدا كەسـەكە خـۆی بـە كەسـانیدی دەفرۆشت تا قوتی ژیان پێ پەیدا بكا.

٦- دەسەڵاتی باوكایەتی: باوك بۆی هەبوو هەر منداڵێكی وەك كۆیلە بفرۆشێ.

٧- زاوزێی كۆیلەكان: منداڵی كەنیزەكیش وەك دایكی كۆیلە دەبوو.

ئەم جۆگەلانە رۆژانە هەزاران هەزار كەسیان فڕێ دەدایە نێو زەلكاوی كۆیلایـەتی، بەشێوەیەك لە زۆر نەتەوەدا ژمارەی كۆیلەكان زۆر لە ژمارەی ئازادەكان زیاتر بوو[1].

---

[1] بڕوانە كتێبی: لا رق في القران، ابراهيم هاشم فلالي، ل٢٠٢ و پاشتر.

## بۆچی ئیسلام بە یەك جار ئەم سیستمە ناقۆلایەی لەناو نەبرد؟

ئیسلام دانایانە و پلەبەپلە چارەسەری نەخۆشییە کۆمەڵایەتی و ئابووری و ئەخلاقییە درێژخایەن و ریشەداکوتاوەکانی کرد، وەك قەڵاچۆکردنی سوو و خواردنەوە مەستکەرەکان و سیستمی کۆیلایەتی و .. شتی لەو جۆرە، تا ئەنجامەکان ئەرێنی بن.

کاتێ ئیسلام هات کۆیلایەتی بڕبڕەی پشتی ژیانی ئابووریی کۆمەڵگەکانی ئەوکاتە بوو. بۆیە دەبوو پلەبەپلە هەنگاو بۆ بنبڕکردنی بنرێ ئەگینا ئەنجامی سەلبی لێدەکەوتەوە. زیاد لەوەیش، ئەگەر قورئان بەیەك تەکان کۆیلەکانی ئازاد بکردایە، کۆیلەکان خۆیان دژی ئیسلام و دژی ئازادکردنیان رادەپەڕین، لەبەرئەوەی کۆیلایەتی بووبوو بەبەشێکی سروشتی لە ژیانیان، هەروەها لەبەرئەوەی بەیتولمال (گەنجینەی دەوڵەتی ئیسلامی) هێندە پارەی تێدا نەبوو بتوانێ بژێوی ملیۆنان کۆیلە دابین بکا کە لەسەر خەرجی گەورەکانیان دەژیان. جگە لەمە، گەورە ملهوڕەکان بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانی خۆیان لە مانەوەی کۆیلەکانیان، دژی بڵاوبوونەوەی پەیامی ئیسلام دەوەستان. لەبەر ئەم هۆیانە و هیتریش ئیسلام ماوەیەکی کاتی بۆ بەیەکجاری بنبڕکردنی سیستمی کۆیلایەتی دانا. بۆ قەڵاچۆکردنی بەکۆیلەکردن و لەڕەگەوە دەرهێنانی بەیەکجاری، چەند رێگەیەکی دانا:

١- حەرامکردنی بەکۆیلەکردنی دیل و سنووردارکردنی چارەنووسی لەنێوانئازادکردنی بەپیاوەتی و بێ بەرانبەر، یان بەرانبەر بە پارە یان دیلدا. خوا دەفەرموێ ﴿فَإِذا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ حَتَّى إِذَا أَثْخَنْتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً﴾[1]. هیچ ئیمام و فیقهزانێك بۆی نیە حاڵەتیتر بۆ ئەم دوو حاڵەتە (ئازادکردنی دیل بێ بەرانبەر یانبەبەرانبەر) زیاد بکا، وەك

---

[1] سورةمحمد: ٤.

ئەوەی هەندێ خەڵك بانگەشەی بۆ دەکەن لە کوشتن یان بەکۆیلەکردن یان موسڵمانکردن، لەبەرئەوەی دەقەکە روون و راشکاوە و تەنها باسی منەتکردن (پیاوەتی) یان فیدیە (الفداء) دەکا. خۆ خوا لەبیری نەچووە ئەوانەیشیان بخاتە سەر کە هەندێ خەڵك بە بیرکردنەوەی خۆیان زیادیان کردوون، لە کوشتن و بەئیسلامکردن.

٢- خوای گەورە لە دەستوورەکەی خۆیدا بۆ شۆردنەوەی زۆر گوناهـ ئازادکردنی کۆیلەی داناوە جا چ نێر بێ یان مێ، وەك لەم گوناهانەدا:

أ- **زیهارکردن (الظهار)**: ئەوەیە پیاو ژنەکەی خۆی بە یەکێك لە مەحرەمەکانی بچوێنێ وەك دایکی یان خوشکی. پێش ئیسلام ئەمە بە تەڵاق دادەنرا، بەڵام ئیسلام کردیە گوناهێك کە حەرامە مێرد بەر لە شۆردنەوەی توخنی ژنەکەی بکەوێ، ئەو شۆردنەوە (کەفارەت)ەیش بریتییە لە ئازادکردنی کۆیلەیەك. خوا دەفەرموێ ﴿وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا﴾[1].

ب- **کوشتنی بەهەڵە**: کەفارەتی ئەم تاوانەیش ئازادکردنی کۆیلەیەك و خوێنباییە بۆ خاوەنی کوژراوەکە. خوا دەفەرموێ ﴿وَمَنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَأً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ﴾[2].

ج- **سوێندخستن**: سزای ئەم گوناهە و شۆردنەوەی ئازادکردنی کۆیلەیەکە. خوا دەفەرموێ ﴿لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِنْ يُؤَاخِذُكُمْ بِمَا عَقَّدْتُمُ الْأَيْمَانَ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ

---

[1] المجادلة: ٣.

[2] النساء: ٩٢.

أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ﴾[1]..

**د- جووتبوون لەگەڵ خێزان لە ڕۆژی ڕەمەزاندا:** کەفارەتی ئازادکردنی کۆیلەیەکە.

٣- قورئانی پیرۆز هەشت-یەکی هەموو داهاتی زەکاتی لە جیهانی ئیسلامیدا تەرخان کردوە بۆ ئازادکردنی کۆیلە، بەوەی بەو پارەیە کۆیلە لە خاوەنەکانیان بکڕدرێنەوە و ئازاد بکرێن. خوا دەفەرموێ ﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾[2]. مەبەست لە (الرقاب) کۆیلەی نێر و مێیە.

٤- هەموو منداڵێك کە لەدایك دەبێ ئیسلام بە ئازادی دادەنێ با دایکیشی کەنیزەك بێ، پاشان دایکەکە دەبێتە دایکی منداڵ (أم الولد)، ئەوە گوزارشتە لە ئازادکردنیشی، بەوە بەکۆیلەکردنی لەڕێگەی وەچەخستنەوە و نەسەبەوە بنبڕ کرد.

٥- ئیسلام فەرمانی کردوە هەر کەس توانای دارایی هەیە بە ماڵەکەی هاوکاریی ئازادکردنی کۆیلەکان بکا، ئەویش لەڕێی کڕین و ئازادکردن، یان پارەپێدانیان تا ئازادیی خۆیانی لە گەورەکانیان پێ بکڕنەوە. خوا دەفەرموێ ﴿لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ﴾[3].

---

[1] المائدة: ٨٩.

[2] التوبة: ٦٠.

[3] البقرة: ١٧٧.

٦- فەرمانی بە گەورانی کۆیلەکان کردوە بەندەکانیان ئازاد بکەن، خوا دەفەرموێ ﴿فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا﴾[١].

٧- هانی هەموو مرۆڤێکی بەتوانای داوە کۆیلە ئازاد بکات و رۆژی قیامەت پاداشتی ئەوە لای خوا وەردەگرێتەوە. خوا دەفەرموێ ﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ، فَكُّ رَقَبَةٍ﴾[٢].

٨- ئیسلام بڕیاری ئازادکردنی بنەچەکۆیلەکانی داوە ئەگەر نەوەکانیان ببوونە خاوەنیان.

٩- هەر کەس پشکی خۆی لەو کۆیلانەی لەگەڵ کەسیتر شەریکن تێیاندا، ئەگەر لە رووی داراییەوە بەتوانا بوو شەریکەکەیشی پشکەکەی خۆی ئازاد دەکات و ئەو قەرەبووی بۆ دەکاتەوە.

بەم شێوەیە ئیسلام قەڵاچۆی ئەم سیستمە دزێوەی کرد تا لە کۆتاییدا و پاش وشککردنی جۆگەلەکانی لەناوی برد، بەڵام هەندێ لە موسڵمانان تا ئەمڕۆیش لەسەر ئەو سیستمە ماونەتەوە. هێشتا هەندێ عەقڵی بەبەردبوو هەیە کە باوەڕی بە مانەوەی ئەم سیستمە لە ئیسلامدا هەیە تا ئەوکاتەی ژیان لەسەر هەسارەی زەوی هەبێ.

**دووەم: یەکسانیی پیاو و ئافرەت:**

لە قورئانی پیرۆزدا هیچ جیاکارییەك لەنێوان پیاو و ئافرەتدا نەکراوە لەسەر ئەو بنچینەیەی ئەمە پیاو و ئەوە ئافرەتە. هەموو گوتارێك کە ئاراستەی نێرینە کراوە بەهەمان شێوە ئاراستەی مێینەیش کراوە. ماف و پابەندیەکانی پیاوان و ئافرەتان لە قورئاندا یەکسانن، هێندە هەیە هەندێ خاڵ هەن تایبەتن بەپیاوان نەك لەسەر بناغەی

---

[١] النور: ٣٣.

[٢] البلد: ١٢-١٣.

جیاکاریی نێوان هەردوو ڕەگەز، بەڵکو لەسەر بناغەی بنەمای یەکسانی لە ماف و پابەندیدا. ئەوەیش لەلایەن دوژمنانی ئیسلام و ڕۆشنبیرانی موسڵمانی غەریزەدەی نەفامەوە، بەتایبەت هەندێ ژنی عەرەبەوە کە خۆیان بە چینی ڕۆشنبیر دادەنێن لەکاتێکدا تەواو لە دینەکەیان نەشارەزان، قۆستراوەتەوە، کە توتی ئاسا، قسەکانی دوژمنانی ئیسلام و عەرەب دەڵێنەوە. لەو خاڵانەیش:

١- **جیاوازیی بەشە میرات:** لە زۆر بابەتی میراتدا جیاوازی نیە. خوای گەورە لەبارەی یەکسانی نێوان دایك و باب لە میراتدا دەفەرموێ: ﴿وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِنْ كَانَ لَهُ وَلَدٌ﴾[1]. لەبارەی میراتی برا و خوشکان لەسەری دایکەوە دەفەرموێ ﴿وَإِنْ كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَالَةً أَوِ امْرَأَةٌ وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسُ فَإِنْ كَانُوا أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ فَهُمْ شُرَكَاءُ فِي الثُّلُثِ﴾[2]. هەندێ حاڵەتیتریش هەن تێیاندا پێگەی ئافرەت لە هی پیاو بەهێزترە کە لێرەدا بواری باسکردنیان نیە. جیاوازیەکە لە هەندێ حاڵەتدایە، وەك حاڵەتی کۆبوونەوەی کچ و کوڕ، یان کۆبوونەوەی برای هەقی (برا لە باوك و دایکەوە) یان برای باوکیی لەگەڵ خوشکی هەقی یان خوشك لە باوکەوە، کە تێیاندا نێرینە دوو ئەوەندەی مێینەی بەردەکەوێ، وەك خوا دەفەرموێ ﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنْثَيَيْنِ﴾[3].

ئەمەیش جەرگەی یەکسانییە لە ئەرك و پابەندیەکاندا، لەبەر ئەم هۆیانە:

أ- پیاو لە مارەیی ژنەکەی و خەرجی ڕێوڕەسمی زەماوەند بەرپرسە و ژنەکەی بەرپرس نیە لەوەی لەو خەرجەدا بەشدار بێ، ئەگەر بەشداریش بکا لە لە

---

[1] النساء: ١١.

[2] النساء: ١٢.

[3] النساء: ١١.

چاکەی خۆیەوەیە.

ب- مێرد خەرجی ژنەکەی لەسەرە، نەك بەپێچەوانەوە.

ج- باوك لە خەرجی منداڵەکانی بەرپرسە نەك دایك.

د- پیاو لە پاراستنی خێزان بەرپرسە نەك ژن، ئەمەیە مانای ئایەتی ﴿الرجالُ قوّامونَ على النّساءْ﴾.. مەبەست قەیمومەی حاڵەتەکانی ناتەواویی ئەهلیەت نیە.

هـ- نێرینە بەرپرسن لە بەرگریکردنی رەوا لە وڵات و ئاینەکەیان و بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژی بۆ سەر ناموس و ماڵ و ژیانیان و ژیانی مێینەکان، نەك مێینە.

و- لە هەندێ حاڵەتدا ئەگەر میراتگرەکە نێرینە بوو و میراتی نەدەبرد و ئەگەر مێینە بوو دەیبرد، ئەگەر میراتەکە لەنێو مێردێك و دایکێك و دوو برا یان دوو خوشك لە دایك و برایەك لە باوکەوە قەتیس بوو، ئەوا مێردەکە نیوە، دایکەکە شەش-یەك و خوشك و براکان لە دایکەوە سێ-یەك دەبەن، برا باوکییەکە بە ئیستیغراق بەرگیر دەبێت و هیچی بۆ نامێنێتەوە. خۆ ئەگەر لە جێی ئەو خوشکێك لە باوکەوە هەبووایە نیوەی میراتەکەی دەبرد و میراتەکە لە شەش بەشەوە بۆ نۆ بەرز دەبوویەوە: مێرد ٩/٣، دایك ٩/١، دوو برای دایکیی (برا لە دایکەوە) ٩/٢، خوشکی باوکیی ٩/٣، سەرجەم دەکاتە ٩/٩.

ئەرکەکانی سەرشانی پیاو زۆر زیاترە لەو زیادەیەی لە میرات دەستی دەکەوێ.

٢- **جیاوازیی لە شایەتیداندا:** کە لە شایەتیداندا دوو ئافرەت بەرانبەر پیاوێکن، وەك خوا دەفەرموێ ﴿وَاسْتَشْهِدُوا شَهِيدَيْنِ مِنْ رِجَالِكُمْ فَإِنْ لَمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّنْ تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاءِ أَنْ تَضِلَّ إِحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى﴾[1].

---

[1] البقرة: ٢٨٢.

ئەم ئایەتە خۆی حیکمەت و هۆی ئەو جیاوازییەی روون کردۆتەوە کە بریتییە لەوەی ﴿تَضِلَّ إِحْدَاهُمَا﴾. واتە کاتێک یەکێک لە دوو ئافرەتە شایەتەکە ناوەرۆکی شایەتیەکەی لەبیر دەچێ، ئەویتریان بیری دەخاتەوە.

لە رووی زانستیشەوە ئەوە سەلماوە ئافرەت بەهۆی زۆر سەرقالبوونی مێشکی بە مندال و کاروبارەکانی مال و بەرپرسیارێتیەکانی بەرانبەر کۆمەلگەکەی، زیاتر لەپیاو زیاتر دووچاری لەبیرکردن دەبێ. پاش ئەوە، هەندێ بابەتی ژنانە هەیە تەنها شایەتیی ئافرەتانیان تێدا وەردەگیرێ، هیچ شایەتیەکیش نیە کە تەنها یەک پیاوی بەس بێ..، لەکاتێکدا لە شەریعەتی ئیسلامیدا هەندێ بابەتی ژنانە هەن کە شایەتیی یەک ئافرەتیان تێدا قبولە.

٢- **جیاوازی لە دەسەلاتی تەلاقدان:** لە ئیسلامدا ئەسل ئەوەیە تەلاق بەدەست پیاوە لەبەر ئەم هۆیانە:

أ- دەستپێشخەر لە داواکردنی هاوسەرگیریدا پیاوە و ئەو داوای کچ دەکا نەک بەپێچەوانەوە، بەپێی لۆژیک و عەقلیش ئەوەی دەست بە دروستکردنی پەیوەندیەکە دەکا، مافی هەیە کۆتایشی پێ بێنێ.

ب- تەلاقدان کۆمەلێ ئەرکیدارایی دێنێتە سەر پیاو، رێسای شەرعی (و یاسایی)یش ئەوە دەخوازن کە مرۆڤ بە کاری کەسانیتر ناچار ناکرێ.

ج- ئافرەت عاتیفییە و بەخێرایی هەلدەچێ، ئەگەر تەلاق بەدەست ئەو بووایە دەبووە مایەی روودانی زۆر رووداوی تەلاق و هەرەسی خێزان.

جگە لەمە، تەلاقی ستەمکارانە لە ئیسلامدا حەرامە، قورئان ژمارەیەک هەنگاو و قۆناغی بۆ کۆتاهێنان بەو پەیوەندیی هاوسەرگیرییە داناوە کە بواری باسکردنیان نیە[1]، نەک بەو رێگەیە ئاسانەی مێردەکان دەیکەن وەک لە قورئانی

---

[1] ينظر مؤلفنا (خطوات الطلاق في القرآن).

پـیرۆزدا روونـه[1]. پاشـان ژن مـافی تـەڵاقی هەیـە ئەگـەر لـە گرێبەسـتی هاوسـەرگیریەکەیدا ئـەوەی کردبێتـە مـەرج، هـەروەك مـافی داواکردنـی جیابوونەوەی هەیە هەرکات هەستی کرد مێردەکەی بەشێوەیەك زیانی مادی و مەعنەوی پێ دەگەیەنێ کە توانای بەرگەگرتنی نیە.

٤- **جیاوازی لـە وەزیفـە گشـتیەکاندا:** ئـەم جیاوازییـە لـە قورئـانی پـیرۆزدا نیـە، ئایەتەکانی گشتین بۆ پیاو و ئافرەت جگە لەوەی پێغەمبەرﷺ تایبـەتی کـردوە، کە ئەویش سـەرۆکایەتیی دەوڵەتـە. جگـە لـەوە نێـر و مـێ یەکسـانن وەك خـوا دەفـەرموێ ﴿وَالْمُؤْمِنُـونَ وَالْمُؤْمِنَـاتُ بَعْضُـهُمْ أَوْلِيَـاءُ بَعْـضٍ يَـأْمُرُونَ بِـالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ﴾[2]. مەبەست لە (اولياء) لێرەدا ویلایەتی گشتییە کە هـەموو وەزیفەکان لە دەوڵەتدا دەگرێتـەوە تـا سـەرۆکی دەوڵـەت و سـەرۆك وەزیـران، لەبەرئـەوەی ئـەرکی سـەرۆکی دەوڵـەت و وەزیـر و بەڕێوەبـەرە گشـتیەکان و سەرجەم سەرۆکانی فەرمانگەکان، فەرمانکردن بە چاکە، واتـە ئـەوەی سـوودی گشـتی تێدایـە و نـەهیکردن لـە خراپەیـە، ئـەوەی زیـانی گشـتی تێدایـە. بـەڵام پێغەمبەرﷺ لە وەزیفە و ویلایەتە گشتیەکان ویلایەتی خیلافەت (سـەرۆکایەتیی دەوڵەت)ی هەڵاوێر کرد و گوتی ((لن يفلح قوم ولوا أمرهم أمرأه))[3].

زۆر لە فیقهزانانی شەریعەتی ئیسلامی گوتویانە: ئافرەت بۆی هەیە هەموو وەزیفە گشتیەکان وەربگرێ جگە لە سەرۆکایەتیی دەوڵەت، لەوانە ئەبوحەنیفە و ئیبن حەزم و ئیبن جەریری تەبەری. ئەگەر ئافرەت لە پیاو لێوەشاوەتر بوو، ئەو لە سەرۆکایەتی دەوڵەتدا پێش پیاو دەخرێ، لەبەرئەوەی پێغەمبەرﷺ ئەوەی گوتـووە ئەگـەر هـاتوو

---

[1] ينظر: مدى سلطان الادارة في الطلاق خلال اربعة آلاف سنة، للباحث: ١٩١/١.

[2] التوبة : ٧١.

[3] صحيح البخاري: ١٦١٠/٤، برقم(٤١٦٣).واتە قەومێك سەرناکەون کاروباری خۆیان بە ژنێك سپاردبێ.

ئافرەت لێوەشاوەتر نەبێ. گەورە زانای پاکستان (ئەبو ئەعلای مەودودی) فتوای بۆ گەلی پاکستاندا کە (فاتیمە نەجاح) هەڵبژێرن کە ئەیوب خان رکابەری دەکرد، لەبەرئەوەی ئەو لە خان لێوەشاوەترە.

بەبڕوای ئێمە داوەریکردن لە بابەتی باری کەسایەتیدا بەدەست ئافرەت بێ باشە بۆ چارەسەری کێشە خێزانیەکان و رێگەگرتن لە جیابوونەوەی ژن و مێرد ، لەبەرئەوەی ئەوان لە چارەسەری ئەو کێشانەدا لێزانترن وەك پەندە عەرەبیەکە دەڵێ (صاحب الدار أدری بما فيها)..

بەڵام ئەو ئافرەتەی دەیەوێ تەواوی مافەکانی لە وەزیفەکانی دەوڵەت وەربگرێ، پێویستە لەسەری پابەند بێ بە پۆشتەیی و سەنگ و سەلارەیی و دوورکەوتنەوە لە جلوبەرگی حەرام و خۆنەڕازاندنەوە بەشێوەی نەفامیی یەکەم، هەروەها خۆی بە کاڵایەك دانەنێ کە بۆ چێژوەرگرتنی پیاو دروست کرابێ. خوا دەفەرموێ ﴿وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى﴾[1]..

### ٧- مافی کارکردن:

مرۆڤ خۆی بەرپرسە لەوەی لەڕێی کار و کەسابەت و ئازادیی گواستنەوە بەدوای پەیداکردنی کارێکی گونجاودا، پێویستیی خۆی پڕ بکاتەوە. خوا دەفەرموێ ﴿فَانْتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِنْ فَضْلِ اللَّهِ﴾[2]. ئیسلام بایەخێکی گەورە بە کارکردن دەدا بەبەڵگەی ئەوەی وشەی کار (العمل) و داتاشراوەکانی (٣٥٦) جار لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، ئەمەیش نیشانەی ئەوەیە ئیسلام ئاینی کارکردنە.

---

[1] الاحزاب: ٣٣.

[2] الجمعة: ١٠.

پێویسته لەسەر دەوڵەت دەرفەتی گونجاوی کار بۆ ئەوانەی توانای کارکردنیان هەیە دەستەبەر بکا. کاتێك کەسێك پیر دەبێ یان توانای کارکردنی نامێنێ خەرجی دەکەوێتە سەر خزمان. هەر خزمێك میراتگری خزمێکیتری بێ نەفەقەی دەکەوێتە سەری، لەبەرئەوەی خوا نەفەقەکێشانی بە میراتەوە بەستۆتەوە و دەفەرموێ: ﴿وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ﴾. پاشان دەفەرموێ: ﴿وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ﴾[1]. واتە: ئەگەر باوکی منداڵ مرد میراتگرەکەی (میراتگری منداڵەکە) خەرجی دەکێشێ. ئەگەر دوو میراتگر یەکێکیان نەدار بوو نەفەقەی دەکەوێتە سەر ئەویتریان ئەگەر دارا بوو. ئەگەر خزمێکی دارای نەبوو کە هەژارە بێتواناکە بەخێو بکا، زەکاتی دەدرێتێ، ئەگەر زەکات بەشی نەکرد بە بەیتولماڵ دەسپێردرێ. کاتێ عومەری کوڕی خەتاب پیرە پیاوێکی دی سواڵی دەکرد لەکاتێکدا سواڵکردن لە سایەی خیلافەتەکەیدا قەدەغە کرابوو، لێی پرسی کە بۆچی سواڵ دەکا؟ پیرە پیاوەکە وەڵامی دایەوە: ئەی میری ئیمانداران! جزیە و هەژاری. ئەوکات عومەر زانی ئەو پیاوە زیممییە، جا وەڵامی دایەوە: هەرچی جزیەیە ئەوە لەسەرمان هەڵگرتیت، هەرچی هەژاریەکەیشە، وا لە بەیتولماڵ ئەوەندەت بۆ دەبڕینەوە کە بەشت بکات و پێویستت بە دەستپانکردنەوە نەبێ.

ئەگەر بەیتولماڵ بێتوانا بوو، پێویستە دەوڵەت هێندە لە دەوڵەمەندەکان وەربگرێ کە پێویستی هەژارانی پێ پڕ بکاتەوە[2]. خوا دەفەرموێ ﴿وَفِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ لِلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ﴾[3]..

---

[1] البقرة: ٢٣٣

[2] المحلى: ٦/٢٥٦ وما بعدها.

[3] الذاريات: ١٩.

له ئیسلامدا جیاوازی لەنێوان نێر و مێدا نیه له کرێ و دەسکەوتی کاردا. خوا دەفەرموێ ﴿أَنِّي لَا أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِنْكُمْ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى بَعْضُكُمْ مِنْ بَعْضٍ﴾[1].

هیچ کۆتێك لەسەر کارکردن نیه، کرێکار ئازادیی رەهای هەیه له هەڵبژاردنی کاردا، بەو مەرجەی کارەکەدروست بێت و زیان بە کەسانیتر نەگەیەنێ و لەگەڵ سیستمی گشتیدا بەریەك نەکەوێ.

## ٨- مافی فێربوون:

فێربوون هەر ماف نیه بەڵکو لەسەر هەموو نێر و مێیەك واجبە، لەبەرئەوەی یەکەمین ئایەت له قورئانی پیرۆز دابەزیوە فەرمانی بە خوێندن کردوە. ئەوەتا خوای گەورە روو بە پێغەمبەرەکەی کە مەبەستی هەموو مرۆڤێکە لە خێزانی مرۆڤایەتی دەفەرموێ ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ، خَلَقَ الْإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ، اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ، الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ، عَلَّمَ الْإِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾[2].

ئیسلام یەکەمین شەریعەتە له دنیادا فەرمانی بە نێردە و رۆیشتن له وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکیتر بۆ بەدەستهێنانی هەموو جۆرەکانی زانست کردوە، خوا دەفەرموێ ﴿فَلَوْلَا نَفَرَ مِنْ كُلِّ فِرْقَةٍ مِنْهُمْ طَائِفَةٌ لِيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ وَلِيُنْذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ﴾[3]. ئیسلام له فێربوون و فێرکردندا جیاوازی لەنێوان نێر و مێدا نەکردوە. پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ (طلب العلم فريضة على كل مسلم)[4]. واته هەموو ئافرەتێکی موسڵمانیش.

---

[1] ال عمران: ١٩٥.

[2] العلق: ١–٥.

[3] التوبة: ١٢٢.

[4] سنن ابن ماجة: ٨/١، برقم(٢٢٤).واته: داواکردنی زانست لەسەر هەموو موسڵمانێك فەرزە.

چەند ئافرەتێك سكاڵایان هێنایە لای پێغەمبەرﷺ كە پیاوان زیاتر لە كۆڕ و كۆبوونەوەكانیدان و داوایان لێكرد كاتێك بۆ فێركردنی ئەوانیش تەرخان بكا، ئەویش رازی بوو و كاتێكی بۆ ئەوانیش تەرخان كرد كە تێیدا سەردانی بكەن.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ (الحكمة ضالة المؤمن، فحيث وجدها فهو احق بها)[1]. جیاوازی لەنێوان زانستێك و زانستێكیتردا نەكردوە، بەڵكو قورئان فەرمانی بەوە كردوە و پێشكەوتن و پەرەسەندن لە بواری زانستی تیۆری و پراكتیكی و تەكنەلۆژیدا بۆ دروستكردنی كەرەستە جەنگیەكان و باڵادەستیی سەربازی بەسەر دوژمنی لەسەر موسڵمانانی پێویست كردوە. دەفەرموێ ﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ﴾[2]. مەبەست لە ئیرهاب لە ئایەتەكەدا ترساندنە، لەبەرئەوەی ئەگەر دوژمن زانی لایەنی بەرانبەر هەمان هێزی بەرگریی ئەو یان بەهێزتری هەیە، زات ناكا دەستدرێژی بكاتە سەر.

یەكەمین كەس فێركردنی كردە فیدیە بۆ ئازادكردنی دیل پێغەمبەر بوو كاتێ داوای لە دیلەكانی بەدر كرد هەریەكەیان لە بەرانبەر ئازادكردنیاندا دە كەس لە منداڵانی موسڵمانان فێری خوێندەواری بكا. ئەگەر موسڵمانان شوێن فەرمانی قورئان و پێغەمبەر بكەوتنایە بەر لە ئەمەریكا لەسەر هەسارەی مەریخ دادەبەزین.

فێركردن لە ئیسلامدا بەخۆڕاییە و نابێ مووچەی لەسەر وەربگیرێ، لەبەرئەوەی واجبە و وەرگرتنی كرێ لەسەر واجب دروست نیە.

ئەمە ئەوە بوو فیقهزانانی شەریعەتی ئیسلامی تا سەدەی چوارەمی كۆچی لەسەری گیرسابوونەوە، پاش ئەوە فتوایان دا كە مووچەیەك بۆ مامۆستا لە

---

[1] سنن الترمذي: ٥/٥، برقم (٢٦٨٧)، وسنن ابن ماجة: ١٣٩٥/٢، برقم (٤١٦٩).واتە: حیكمەت ونبووی ئیماندارە، لە هەركوێ بینیەوە لە هەموو كەس لەپێشترە بۆی.
[2] الانفال: ٦٠.

بەیتولماڵ ببڕێتەوە لەبەرانبەر خۆتەرخانکردنی بۆ فێرکردن، نەك لە بەرانبەر فێرکردنەکە. ئیبن حەزم لە کتێبی (الاحکام فی اصول الاحکام)دا دەڵێ "حاکم مولزەمە بە دابینکردنی هەموو کەرەستەکانی فێرکردن بەخۆڕایی بۆ هەمووان بەبێ جیاوازی".

## ٩- مافی ئازادیی بیروڕا:

دەتوانین بڵێین: ئەم مافە لە هیچ سەردەمێك و لە سایەی هیچ یاسا و شەریعەتێکدا شوێنی شایستە و ڕێچکەی ڕاستەقینەی خۆی وەرنەگرتووە، تەنها لە سایەی شەریعەتی ئیسلامیدا نەبێ کاتێ ئەو شەریعەتە بەشێوەیەکی ڕاست جێبەجێ دەکرا، وەك لە سەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکاندا. بەڵگەی واقیعی هەن لەسەر ئەم ڕاستییە، لەوانە: مشتومڕی ئافرەتێك (خەولەی کچی حەکەم) و دەمەتەقێی لەگەڵ پێغەمبەرﷺ سەبارەت بە ناکۆکیەکەی لەتەك مێردەکەی (ئەوسی کوڕی صامت) کە زیهاری کردبوو. زیهاریش لای عەرەبی پێش ئیسلام وەك تەڵاق وابوو. خەولە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوسی مێردمماڵەکەمی خوارد و گەنجێتی فەوتاندم و سکی خۆمم بۆ پژاند، تا کە چوومە تەمەن و لەسکوزا کەوتم، زیهاری کردم. پێغەمبەریشﷺ وەڵامی دایەوە: پێم وایە تۆ ئیتر لێی حەرام بوویت. خەولە گەڕایەوە و دیسان لەگەڵ پێغەمبەر کەوتە گفتوگۆ و بەوپەڕی ئازادییەوە گفتوگۆی لەگەڵ دەکرد و پێی گوت: چەند کچێکم لێی هەیە ئەگەر بیاندەمە ئەو دەفەوتێن و ئەگەر بیانهێنمە لای خۆم برسی دەبن. پێغەمبەرﷺ دیسان پێی گوتەوە:پێم وایە تۆ ئیتر لێی حەرام بوویت. خەولە بە حوکمەکە سوکنایی نەهات و گوتی: هانای خۆم و ئەو کچانە دەبنە بەر قاپیی خوا. پاش ئەوە ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ، الَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنْكُمْ مِنْ نِسَائِهِمْ مَا هُنَّ أُمَّهَاتِهِمْ إِنْ أُمَّهَاتُهُمْ إِلَّا اللَّائِي وَلَدْنَهُمْ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنْكَرًا مِنَ الْقَوْلِ وَزُورًا

وَإِنَّ اللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ، وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا﴾[1].

**له بەڵگەكانى ئازادیى را لە ئیسلامدا:**

لەو بەڵگانە، مشتومڕ و بەرهەڵستیکردنی ژنێکی ئاسایی بوو دژبەبڕیارێکی عومەری کوڕی خەتاب –خوا لێی رازی بێ– کاتێ خەلیفە ویستی لای سەرووی مارەیی دیاری بکا. بۆ بەرهەڵستیەکەیشی ئایەتی ﴿وَإِنْ أَرَدْتُمُ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنْطَارًا فَلَا تَأْخُذُوا مِنْهُ شَيْئًا أَتَأْخُذُونَهُ بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُبِينًا﴾[2]، کردە بەڵگە. بەوە بەڵگەگیری کرد و لە راکەی پاشگەز بوویەوە لەکاتێکدا ئەو سەرۆکی دەوڵەت و خەلیفەی موسڵمانان بوو و لەبەردەم خەڵکدا گوتی: "ژنێك پێكای و عومەر هەڵەی کرد"[3].

کاتێ عومەری کوڕی خەتاب، کە بە توندی ناسراوە، بوویە خەلیفە و بەرپرسیارێتیی دەوڵەتی ئیسلامی گرتە دەست، وتاری بۆ خەڵك دا و پێیانی گوت: "هەرکەس لە ئێوە خوار و خێچیەکی لە مندا بینی با راستی بکاتەوە"، پیاوێك لە خەڵکی ئاسایی هەستا و پێی گوت: "وەڵاهی ئەگەر خوار و خێچیەکمان لە تۆدا بینی بە شمشێرەکانمان راستی دەکەینەوە". دەبێ عومەری کوڕی خەتاب چی گوتبێ؟ ئایا گوتی دەی لێی بپرسنەوە و سزای بدەن لەبەرئەوەی بێئەدەبی بەرانبەر میری ئیمانداران کردوە؟! نەخێر، بەڵكو گوتی: "سوپاس بۆ خوا کە کەسانێکی لەنێو موسڵماناندا هەڵخستووە خوار و خێچیەکانی عومەر راست بکەنەوە".

---

[1] المجادلة: ١–٣.

[2] النساء: ٢٠.

[3] ينظر: كشف الخفاء: ٣١٧/١.

ئەم گفتوگۆ ئاشكرايەی نێوان سەرۆكی دەوڵەت و هاوڵاتیەكی ئاساییدا بە یەكێك لە نایابترین نموونەی دیموكراسی كە بەخەیاڵی مرۆڤدا بێ و رادەی ئەو ئازادیی دەربڕینە بەهەموو راشكاوی و بوێریەكەوە، دێتە ژماردن.

نموونەیتر زۆرن و بەو چەند نموونەیە لە ئازادیی بیروڕا لە ئیسلامدا بەس دەكەین.

## ١٠- مافی ئازادیی بیركردنەوە:

بیركردنەوە بریتییە لە تێڕوانینی فیكری، تێڕوانینیش بریتییە لە تێبینیكردنی مەعقول بۆ بەدەستهێنانی نەزانراو (مجهول)، واتە بیركردنەوە لە زانیارییە ئەمباركراوەكان لە وێنا و بەڕاست زانینەكان (التصديقات) لە عەقڵدا بۆ بەدەستهێنانی نەزانراوی تەسەوری و تەسدیقی. هەموو پەرەسەندنێك لە هەر بوارێكی ژیاندا بەرەنجامی بیركردنەوەیە. هەموو نەوەیەك بیر لە شتە بەرچاوەكان و لەو كەلەپوورەی لە پێشینانیەوە بۆی ماوەتەوە، دەكاتەوە، تا زانیاری و بەرهەمی نوێ بخاتە سەر ئەو زانیاری و بەرهەمانەی هەیەتی، رێك وەك بازرگانیكردن بە سەرمایەیەك بۆ بەدەستهێنانی قازانجی نوێ. ئەمە یاسای ژیانە لە گەردووندا. قورئانی پیرۆز لە زۆر ئایەتدا فەرمان بە بیركردنەوە دەكا. لەوانە: ﴿كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ﴾[1]. ﴿هَلْ يَسْتَوِي الْأَعْمَى وَالْبَصِيرُ أَفَلَا تَتَفَكَّرُونَ﴾[2]. ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ، الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾[3].

---

[1] البقرة: ٢١٩.

[2] الانعام: ٥٠.

[3] ال عمران: ١٩٠–١٩١.

قورئان سەدان ساڵ بەر لە جارنامەی جیهانیی مافەكانی مرۆڤ (م/ ١٢) فەرمانی بەمە كردوە، لەبەرئەوەی ئازادیی بیركردنەوە لە جیاكەرەوەكانی مرۆڤە لە بوونەوەرە زیندووەكان و لە پێویستیەكانی ژیانە. پێغەمبەریش ﷺ جەختی لەسەر فەرمانەكانی قورئان كردۆتەوە و فەرمویەتی: (لا تكونوا أمّعه، تقولون: ان احسن الناس احسنّا، وان ظلموا ظلمنا، ولكن وطّنوا انفسكم ان احسن الناس ان تحسنوا، وان اساؤوا فلا تظلموا)[1].

ئەمە هاندانە بۆ لاساییكردنەوە و كاركردن بەپێی عەقڵ و پشتبەستن بە بیركردنەوە. لەو شتانەیشدا كە بیركردنەوەی هەندێ كەس پێیان ناگا، با پرسیار لە شارەزایان بكەن وەك خوا دەفەرموێ: ﴿فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾[2].

بیركردنەوە هەر بەتەنها ماف نیە، بەڵكو یەكێكە لە پێویستیەكانی ژیان لە ئیسلامدا.

## ١١- مافی ئازادیی هاتوچۆ و مافی پەنابەری:

هیچ یاسایەك لە جیهاندا نیە هێندەی شەریعەتی ئیسلامی رێگری لەبەردەم ئازادیی هاتوچۆ (حرية التنقل)هەڵگرتبێ، لەبەرئەوەی رەگەزنامەی موسڵمان ئیسلامە، هەربۆیە هیچ بەربەستێك لەبەردەم هاتوچۆی لەناوەوە و دەرەوەی وڵاتدا نیە مەگەر لە حاڵەتێكدا لەگەڵ بەرژەوەندیی گشتی لێك بدات. یەكەمین جێبەجێكردنی هاتوچۆ و كۆچكردن و پەنابەری كۆچی پێغەمبەر ﷺ بوو لە مەكەوە بۆ

---

[1] صحيح الترمذي بشرح ابن العربي، باب البر والصلة: ٨/١٧٠.واتە: چاولێكەر مەبن كە بڵێن: ئەگەر خەڵك باش بوون ئێمەیش باش دەبین و ئەگەر ستەمیان كرد ئێمەیش ستەم دەكەین، بەڵكو خۆتان دامەزراو بكەن كە ئەگەر خەڵك باش بوون ئێوەیش باش بن، ئەگەر خراپیش بوون ئێوە ستەم نەكەن.

[2] النحل: ٤٣.

مەدینە. لە گەشترین وێنەکانی هاوکاریی نێوان خەڵك لە مێژوودا هاوکاریی نێوان یاریدەدەر و کۆچەریەکانە لەگەڵ پێغەمبەرﷺ. ئەو کۆمەکی و پەنادانەی یاریدەدەرەکان پێشکەشی کۆچەریەکانیان کرد بەڕادەیەك بوو مێژووی مرۆڤایەتی بەخۆیەوە نەدیوە. خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی کردوە تەنانەت کۆمەکیی دوژمنانیشی بکات ئەگەر هاتوو هانایان بۆ هێنا و دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ﴾[1].

هاتوچۆکردن لە ئیسلامدا دەستەبەرە جا چ ئەو هاتوچۆیە بۆ سەیر و سەفا بێ، یان بۆ بازرگانی یان چارەسەری نەخۆشی یان هەر مەبەستێکیتری رەوا. قورئانی پیرۆز لە چەندین ئایەتدا باسی ئەم مافەی کردوە، لەوانە: ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ ذَلُولًا فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ﴾[2]. ﴿قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ ثُمَّ انْظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ﴾[3]. لەوانەیە هاتوچۆ واجبێك بێ بۆ پاراستنی ئاین یان ژیان یان ناموس یان ماڵ، خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنْتُمْ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الْأَرْضِ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا﴾[4].

ئازادیی هاتوچۆ چواردە سەدە پاش پەسەندکردنی لە قورئانی پیرۆزدا، لە جاڕنامەی جیهانیی مافەکانی مرۆڤدا هاتووە (م/٢٣). وەلی ئەمر بۆی هەیە لەبەر بەرژەوەندیی گشتی ئازادیی هاتوچۆ بۆ ماوەیەکی دیاریکراو سنووردار بکا، وەك عومەری کوڕی خەتاب-خوا لێی رازی بێ- لەبەر بەرژەوەندیی موسڵمان گەورە هاوەڵانی لە لە یاریدەدەر و کۆچەریەکان قەدەغە کرد لەوەی بەبێ مۆڵەتی ئەو شاری

---

[1] التوبة: ٦.

[2] الملك: ١٥.

[3] الانعام: ١١.

[4] النساء: ٩٧.

مەدینە بەجێبێڵن، ئەویش بۆ ئەوەی سوود لە راوێژیان وەربگرێ لەو رووەوە ئەوان ئەهلی راوێژ بوون و لە قایمکردنی پایەکانی دەوڵەتە ئیسلامییە تازەکەدا یارمەتی بدەن.

لەوانەیە رێگریکردن بەهۆی تەندروستیەوە بێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (اذا سمعتم الگاعون بارج فلا تدخلوها، واذا وقع بارج وانتم فيها فلا تخرجوا منها)[1].

ئیسلام تەنها بە بەخشینی مافی ئازادیی هاتوچۆوە نەوەستاوە، بگرە پارێزگاری لە سەلامەتیی هاتوچۆیش کردوە لەرێی سەپاندنی توندترین سزا بەسەر چەتە رێگرەکان کە هەرەشە لە ماڵ و گیانی رێبواران دەکەن. خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الْأَرْضِ فَسَادًا أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلَافٍ أَوْ يُنْفَوْا مِنَ الْأَرْضِ ذَٰلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾[2].

## ١٢- مافی حورمەتی ماڵ:

ماڵ ئەو شوێنەیە مرۆڤ بەشێوەیەکی ئاسایی بەشێوەیەکی هەمیشەیی یان کاتی تێیدا دەژی. ماڵە تایبەتەکان لە ئیسلامدا حورمەتیان هەیە و بەبێ پێویستی نابێ بچیتە ناویان. لەراستیدا حورمەتی ماڵ تەواوکەری ئازادیی کەسی یان ئەنجامی ئەوەیە. چاودێریکردنی ئەم مافە ئارامی تاك لە ماڵەکەیدا مسۆگەر دەکا، کەس بێزار و نیگەرانی ناکا، بەتایبەت لە شەودا کە نیگەرانکردن کاریگەرترە.

---

[1] بڕوانە: صحيح البخاري: ٣/١٢٨١، وصحيح مسلم: ٤/١٧٣٧.واتە: ئەگەر بیستتان تاعون لە ناوچەیەکدا هەیە مەچنە ناوی، ئەگەر لە ناوچەیەکدا روویدا کە ئێوە تێیدا بوون لێی دەرمەچن".

[2] المائدة: ٣٣.

قورئانی پیرۆز جەختی لەم مافە کردووە و دەفـەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ (٢٧) فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فِيهَا أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّى يُؤْذَنَ لَكُمْ وَإِنْ قِيلَ لَكُمُ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا هُوَ أَزْكَى لَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾[1]. بەوەیش خـوا ماڵـەکانی کردووەتـە ئارامگایەك کە خەڵك رووی تێدەکـەن، تێیانـدا رۆحیـان ئـارام و دەروونیـان ئاسـوودە دەبێ و ئابڕوو و حورمەتیان پارێزراو دەبێ. ماڵەکان ناتوانن ئەم ئامانجانـە بێننـە دی تا نەبنە مەنزڵگایـەکی ئـارام کـە کـەس بـەبێ زانیـاری و مۆڵـەتی خاوەنەکـەی خـۆی بەسەردا نەدات، شکاندنی حورمەتی ماڵ لەلایەن ئەوانەی بەبێ مۆڵەتدەچنە ناویەوە، چاویان بەرووی عەورەتی خەڵکدا هەڵدەتەقێنێ.

قورئـان بـە (استئناس) گوزارشـتی لـە مۆڵـەتوەرگرتن کـردوە، کـە دەربڕینێکـە ئاماژەیە بۆ نەرمی مۆڵەتوەرگرتن و نەرمیی شێوەی هاتنی لەدەرگادەر، کە گوشادی لە دڵی خاوەن ماڵ و ئامادەیی بۆ پێشوازیکردنی دروست دەکا. پـاش مۆڵەتخواسـتن دەردەکەوێ کەسێك لە خاوەن ماڵەکە لە ماڵە یان کەس لە ماڵ نیە. ئەگەر ماڵ چۆڵ و کەسی تێدا نەبوو نابێ پاش مۆڵەتخواستن مل بنێت و بچێتە ژوورەوە، لەبەرئـەوەی بەبێ مۆڵەتدان چوونەژوورەوە دروست نیە. خـوا دەفـەرموێ: ﴿فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فِيهَا أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّى يُؤْذَنَ لَكُمْ﴾[2]. ئەگـەر کەسیشـی تێـدا بـوو ئـەوا تـەنها مۆڵەتخواستن بەس نیە بۆ چوونە ژوورەوە، بەڵکو ئەوە تەنها داوای رێپێدانـە، ئەگـەر خـاوەن مـاڵ مۆڵـەتی بەچـوونەژوورەوە نـەدا، نابێتـە بچـێتە ژوور و پێویسـتە بـەبێ سرتەسرت و چاوەڕوانی شوێنەکە بەجێبێڵێ. ﴿وَإِنْ قِيلَ لَكُمُ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا هُوَ أَزْكَى

---

[1] النور: ٢٧–٢٨.

[2] النور: ٢٨.

﴿لَكُمْ﴾[1]. بگەڕێنەوە بەبێ ئەوەی دڵتان گەرد بگرێ و بەبێ ئەوەی هەست بەوە بکەن خاوەن ماڵ سووکایەتی پێکردوون یان لێتان بێزارە، چونکە خەڵك نهێنی و عوزری خۆیان هەیە و پێویستە هەڵسەنگاندنی هەڵوێستەکە بۆ خۆیان بەجێ بهێڵرێ. ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾[2]. واتە خوا بە شاردراوەکانی نێو دڵ زانایە و لە پاڵنەر و وروژێنەرەکانی ناوی ئاگەدارە.

لێرەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە قورئان بەرنامەی ژیانە. بۆیە بەو رادەیە بایەخ بەم شتە بچوکانەی ژیانی کۆمەڵایەتی دەدا، لەبەرئەوەی مۆڵەتخواستن حورمەت بۆ ماڵەکان مسۆگەر دەکات و بەهۆیەوە دەبنە شوێنی ئارامی و ئۆقرەیی و خاوەنەکانیان لە شەرم و تەریقبوونەوە و ناڕەحەتبوون دەپارێزێ، کە دەشێ بەهۆی لەپڕ خۆبەماڵدا کردن و دەرکەوتنی ئابڕوویان، ئابڕوی خواردن بێ یان ئابڕوی پۆشاك و کەلوپەل دووچاریان ببێ. لەوانەیە ئەو ماڵە حەز نەکەن بەبێ ئامادەکاری و خۆکۆکردنەوە و جوانکاری خەڵك لەپڕ بەو شێوەیە بیانبینن.

## ١٣- مافی یەکسانی لەبەردەم دادگەدا:

لە گرنگترین توخمەکانی ئاسایش و ئۆقرەیی و هەستکردن بە حەوانەوەی دەروونی و کەرامەتی تایبەت، ئەوەیە مرۆڤ هەست بکا پارێزبەندیی تەواوی هەیە لەبەردەم هەر جۆرە حەیفێکی یاسایی و قەزاییدا و لە بواری داوەریکردن، یان دادگەکان یان سزاداندا هیچ فەرق و جیاوازیەك لەنێوان کەسێك و کەسێکیتردا نیە بەهۆی پلە و پایەی سیاسی یان کۆمەڵایەتی یان ئابووری یان بەهێزی و بێهێزی یان نەژاد یان رەنگی پێست و ئەو شتانە، هەروەها تاك هەست بکا قەزایەکی سەربەخۆ و

---

[1] النور: ٢٨.

[2] النور: ٢٨.

بێگەرد هەیە کە دادپەروەرانە و دوور لە هەر کارتێکردنێکی دەرەکیی ماددی یان مەعنەوی، تەماشای کێشەکەی دەکا.

هەموو ئەمانە بەدەق لە چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆزدا هاتوون و پیغەمبەریش(ﷺ) بە گوتە و داوەریی خۆی دووپاتی کردوونەتەوە بەر لەوەی جاڕنامەی جیهانیی مافەکانی مرۆڤ لە مادەی دەیەمیدا بڵێ: "هەموو مرۆڤێك، بەتەواوی یەکسانی لەگەڵ ئەوانیدیکەدا، بۆ بڕیاردان لە ماف و ئەرکەکانی و هەر جۆرە تاوانێك بخرێتە ئەستۆی، مافی ئەوەی هەیە کێشەکەی بەشێوەیەکی ڕەوا و ئاشکرا لەلایەن دادگەیەکی سەربەخۆ و بێلایەنەوە ببینرێ".

چواردە سەدە بەر لەو جاڕنامەیە (ساڵی ١٩٤٨) خوای گەورە فەرمانی بە حاکم و دادوەرەکان کردووە لەکاتی داوەریکردنیان لە کێشەکانی نێو خەڵکدا دادپەروەری ئامانجیان بێ و دەفەرموێ ﴿وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ أَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ﴾[١]. وشەی (الناس) هەموو تاکێکی مرۆڤ دەگرێتەوە لەبەرئەوەی (ال)ی ئیستیغراقی چووەتە سەر و لە دەستەواژە گشتیەکانە. هەروەها دەفەرموێ ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ﴾[٢].

خوا فەرمانی کردوە تەنانەت لەگەڵ دوژمنانیش ڕەچاوی دادپەروەری بکرێ و دەفەرموێ ﴿وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلَّا تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى﴾[٣] واتە: با رقبوونتان لە قەومێك واتان لێنەکات دادپەروەر نەبن، دادپەروەر بن لەبەرئەوەی دادپەروەری لە تەقواوە نزیکترە. هەروەها فەرمانی کردوە لە قسە و حوکمداندا لەگەڵ خزم و بێگانە، نزیك و نامۆ وەك یەك بن و دەفەرموێ ﴿وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا وَلَوْ

---

[١] النساء : ٥٨.

[٢] النحل: ٩٠.

[٣] المائدة: ٨.

كَانَ ذَا قُرْبَى﴾[1].. فەرمان بە پێغەمبەرەكەی دەكا بە دوژمنـانی خـوا رابگەیـەنێ كـە ئەو فەرمانی پێكراوە دادپەروەرانە داوەرییان لەنێوانـدا بكـات و دەفـەرموێ ﴿فَلِذَلِكَ فَادْعُ وَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَقُلْ آمَنْتُ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنْ كِتَابٍ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ﴾[2].

لە ئیسلامدا كەس لەبەردەم قەزادا پارێزبەندی نیە، حاكم و مەحكوم وەك یەكن، لەبەرئەوەی هەموویان مرۆڤن و هیچ جیاكەرەوەیەكیان نیـە كـە لەبـەردەم قـەزادا لـە كەسانیتریان جویێ بكاتەوە. خوای گەورە بـە پێغەمبەرەكـەی دەفـەرموێ: ﴿قُلْ لَا أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعًا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ وَلَوْ كُنْتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لَاسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ إِنْ أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾[3].

كاتێكیش مەرگ بەردەرگای بە پێغەمبەرﷺ گرت، فـەرموی: "شـەلاقم لـە پشـتی كێ داوە ئەوە پشتم با لێی بداتەوە، جوێنم بـە ناموسـی كـێ داوە ئـەوە ناموسـم بـا جوێنی پێ بداتەوە"[4]. كاتێ عەمری كوڕی عاص داوای پارێزبەندی بـۆ والیـەكان لـە عومەری كوڕی خەتاب كرد، رەتـی كـردەوە و گـوتی مـن والیـەكانم نـەناردوە تـا لـە پشتیان بدەن و دەیەكیان ببەن، ئـەوەی وای لێكرا بـا بـەرزی بكاتـەوە بـۆم تۆڵـەی لێدەكەمەوە. بینیم پێغەمبەری خوا تۆڵەی لە خۆی كردەوە".

فیقهزانانی شەریعەت كۆكن لەسەر ئەوەی قیساس لەنێوان والی و كاربەدەسـتان و باقیی خەڵكدا جێبەجێ دەكرێ، لەبەرئـەوەی ئایـەت و حەدیسـەكان بەگشـتی قسـە دەكەن. لەو ئایەتانە ﴿فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ، وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا

---

[1] الانعام: ١٥٢.

[2] الشورى: ١٥.

[3] الاعراف: ١٨٨.

[4] المعجم الأوسط، للطبراني: ٣/١٤٠، برقم (٢٦٢٩).

يَرَهُ﴾[1]. لەفزی (من)، واتە هەرکەس،ئیسمی شەرتە و گشتی دەگەیەنێ و هەموو مرۆڤێك دەگرێتەوە، جا پایەکەی هەرچی بێ.

کاتێك خەلیفە ئەبوبەکری سدیق-خوا لێی رازی بێ- بەیعەتی پێدرا و ئەرکی جێنشینیی پێغەمبەری خوا گرتە ئەستۆ، لەبەردەم خەڵکدا وتاریدا بەقسەیەك کە جەخت لە مانای یەکسانیی نێوان دەسەڵات و جەماوەر دەکا و گوتی "خەڵکینە ! من کرامە بەرپرس بەسەرتانەوە و لە ئێوەیش باشتر نیم، ئەگەر کاری باشم کرد یارمەتیم بدەن، ئەگەر خراپیشم کرد راستم بکەنەوە". وتارەکەیشی بەوە کۆتایی پێهێنا کە گوتی "گوێڕایەڵیم بکەن تا من گوێڕایەڵیی خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەم، ئەگەر سەرپێچیی خوا و پێغەمبەرەکەیم کرد، هیچ مافێکی گوێڕایەڵیکردنم بەسەرتانەوە نامێنێ".

ئەوەتا میری ئیمانداران عەلی کوڕی ئەبوتالیب- خوا لێی رازی بێ- قەڵغانەکەی ون دەکات و لای جولەکەیەك دەیدۆزێتەوە کە دەڵێ هی خۆمە، ئەویش کێشەکە بۆ قازیی شورەیح بەرز دەکاتەوە و لە بەرژەوەندیی جولەکەکە بڕیار دەدا، لەبەرئەوەی خەلیفە بەڵگەیەکی شەرعی بۆسەلماندنی سکاڵاکەی نەبوو.

**لە قەزای ئیسلامدا هیچ تکا و واسیتە و خزمایەتیەك نیە:**

عائیشەی دایکی بڕواداران دەگێڕێتەوە کاتێك ئوسامە هاتە لای پێغەمبەرﷺ تا تکا بۆ ژنێکی مەخزومی خاوەن پلەو پایە لەنێو قەومەکەیدا بکا کە دزی کردبوو، پێغەمبەری خواﷺ پێی گوت: ئایا لە حەدێك لە حەدەکانی خوادا شەفاعەت دەکەیت؟.. پاشان هەستا و دەستی بەقسەکردن کرد و گوتی "ئەی خەڵکینە ! قەومەکانی پێش ئێوە بۆیە لەناو چوون لەبەرئەوەی ئەگەر کەسێکی بەدەسەڵات دزی بکردایە وازیان لێ دەهێنا، ئەگەر کەسێکی لاوازیش دزی بکردایە سزایان

---

[1] الزلزلة : ٨

دەدا"[1]. لـە گێڕانەوەیـەکیتردا هـاتووە گوتویـەتی: سـوێند بـەوەی گیـانی منـی بەدەستە ئەگەر فاتیمەی کچی محەمەد دزی بکردایە دەستم دەبڕی".

**گەرەنتیەکانی یەکسانی لەبەردەم قەزادا:**

ئیسلام گەرەنتیی زۆری داناوە بۆ ئـەوەی قـازی هـەر کـەس مـافی خـۆی بـداتێ، لەوانە:

أ- ڕێسایەکی شەرعیی ئوسوڵی دەڵێ: ئەسڵ ئەستۆپاکییە، ڕێسایەکی یاسایی لەم ڕێسایە نزیك کەوتۆتەوە کە دەڵێ: تۆمەتبار بێتاوانـە تـا تاوانبـاریی دەسـەلمێ. مرۆڤ لـەکاتی لەدایکبوونیـدا ئەسـتۆی لـە هـەموو جـۆرە باپـەندیـەکی جینـایی و مەدەنی، پاکە. کاتێك دەچێتە نێو شەڕی ژیان و لەگەڵ نەوەکانی ڕەگەزەکـەی لێك دەخشێ، ئەگەر داوایەك لەدژی بـۆ بـەردەم قـەزا بـەرز کرایـەوە، پێویسـتە قازی بە (استصحاب) بەچاوی ئەم مرۆڤە بێتاوانەی کاتی لەدایکبوونی تەماشای بکا. (استصحاب)یش سەرچاوەیەکی ئاشکراکەرە لەسەرچاوەکانی ئـەحکام لـە شەریعەتی ئیسلامیدا، ئەگەر بەڵگەیەك دژی نەبوو.

ب- پێویستە قازی بەپشتبەستن بە ئیفادەی شایەتەکە بڕیار نەدا تا لە ڕاستگۆیی و بێگەردی و ئەمانەتی دڵنیا دەبێ. لـە ئیسـلامدا قـازی بـۆی نیـە بـە ئیفـادەی شـایەتەکان حـوکم بـدات تـا کەسـێکی جێمتمانـە تەزکیـەیان نـەکات. خـوا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَنْ تُصِيبُوا قَوْمًا بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ﴾[2].

ج- لـە مەرجـەکانی لێوەشـاوەیی مـرۆڤ بـۆ وەرگرتنـی ئـەرکی دادوەری ئەوەیـە دادپـەروەر و دەسـتپاك و بێگـەرد و ئـازا بـێ، کارتێکـەرە دەرەکیـەکان کـاری

---

[1] متفق عليه. سبل السلام:٤/٢٦.

[2] الحجرات: ٦.

تێنەکەن. فیقیهزانانی شەریعەت لە سەرەتای ئیسلامەوە لەسەر ئەمە یەکدەنگن.

د- چاودێریکردنی توندی وەلی ئەمر (سەرۆکی دەوڵەت) بۆ قەزا و بڕیارەکانی و لێپرسینەوەیان بە دەستێکی ئاسنین ئەگەر لە بڕیاردانیاندا، لەبەر بەرژەوەندیەکی مادی یان مەعنەوی یان هەر کاریگەریەکیتر، بەلای یەکێك لە دوو لایەنە ناکۆکەکەدا دایانشکاند. باشترین بەڵگەیش چاودێریکردنی عومەری کوڕی خەتابە لە سەردەمی خیلافەتەکەیدا بۆ قازیەکانی. یەکێك لە نموونەکانی ئەو چاودێریەیشی ئەو نامەیەتی کە بۆ ئەبوموسای ئەشعەری نووسیوە و تێیدا گرنگترین پابەندییەکانی قازی لە داوەریکردندا روون دەکاتەوە، تێیدا دەڵێ: ( فعليك بالعقل والفهم وكثرة الذكر، فافهم اذا ادلى اليك الرجل الحجة فاقض اذا فهمت، وامض اذا قضيت، فانه لا ينفع تكلم بحق لانفاد له، واس بين الناس في وجهك وعدلك ومجلسك وقضائك، حتى لا يطمع شريف(قوي) في حيفك، ولا ييئس ضعيف من عدلك[1] ....).

هـ- تاقیکردنەوەیەکی ورد و بێگەردی قازی بەر لە دامەزراندنی تا دەربکەوێ کە بۆ دتوەریکردن شیاوە. وەك ئەوەی پێغەمبەرﷺ مەعازی کوڕی جەبەلی تاقیکردەوە کاتێ بۆ قەزای یەمەن پاڵاوتی و پێی گوت: ئەگەر بابەتێکت هاتە بەردەست چۆن بڕیاری تێدا دەدەیت؟ گوتی: بەگوێرەی کتێبی خوا داوەری

---

[1] بدائع الصنائع في ترتيب الشرائع: ٤٠٩٢/٩ وما بعدها.
واتە: عەقڵ و تێگەیشتنت بەکار بێنە و زیکرت زۆر بێ. بزانە ئەگەر پیاوێك بەڵگەیەکی خستە بەردەمت، ئەگەر تێگەیشتیت بڕیاری تێدا بدە، ئەگەر بڕیاریشتدا جێبەجێی بکە، چونکە هەقگوتن بەبێ جێبەجێکردنی سوودی نیە. لە رووپێدان و دادپەوەری و مەجلیس و داوەریکردنتدا لەگەڵ خەڵك یەکسانبە، تا بەدەسەڵاتێك چاو نەبڕێتە ستەمکاریت و بێدەسەڵاتێکیش لە دادپەروەریت بێئەمێد نەبێ.

دەکەم؟ گوتی: ئەی ئەگەر لە کتێبی خوادا نەتدۆزیەوە. گوتی: بە سوننەتی پێغەمبەری خوا. گوتی: ئەی ئەگەر نە لە کتێبی خوا و نە لە سوننەتی پێغەمبەری خوادا نەتدۆزیەوە؟ گوتی: رای خۆم بەکار دێنم و کەمتەرخەمی ناکەم. پێغەمبەری خواﷺ دەستی لە سینگی مەعازدا و گوتی: سوپاس بۆ خوا کە نێردەی پێغەمبەری خوای سەرکەوتوو کردوە بەو شێوەیەی پێغەمبەری خوا لێی رازی بێ".

و: مافی سکاڵاکردن لە ستەم (التظلم): لە ئیسلامدا سیستمێك هەیە پێ دەوترێ دەسەڵاتی ستەمکاریەکان (ولاية المظالم)، بۆ تەماشاکردنی سکاڵای هەر کەسێك لە کۆمەڵگەدا کە هەست بە ناعەدالەتیی حوکم، یان بە ستەمێك لەلایەن بەرپرسانەوە لێی کرابێ، بکات و لە سکاڵاکەیدا داوا بکا ئەو ناعەدالەتیەی بەرانبەری کراوە هەڵبگیرێ. سەرۆکی دەوڵەت لە پێشەوەی دەسەڵاتی ستەمکاریەکانەوەیە. لە ئیسلامدا زۆر بەڵگەی لەم جۆرە هەن، لەوانە: لە سەردەمی خەلیفە عەلی کوڕی ئەبوتالیبدا ژنێك براکەی مرد و میراتگرانی تەنها بریتی بوون لە ژنێك و دایکێك و خوشکێکی هەقی و دوازدە برای هەقی و دوو کچ. ئەسڵی میراتەکە دەبووە ٢٤ بەش، دوو کچەکە ١٦ بەش، دایکەکە ٤ بەش، ژنەکە ٣ بەش، بۆ دوازدە برا و خوشکەکەیش یەك بەش دەمایەوە کە تێیدا بە بنەمای "نێرێك بەشی دوو مێی هەیە" بەش دەکرا و بەشەکە دابەش نەدەبوو بەسەریاندا، هەربۆیە ٢٤ بەشە ئەسڵیەکە جارانی ژمارەی سەرەکانیان کرا پاش دانانی هەر نێرێك بە دوو بەش ٢٥X٢٤ = ٦٠٠، خوشکەکە لە کۆی گشتی پشکێکی بەرکەوت و هەستی کرد ستەمی لێکراوە و بڕیارەکە نادادپەروەرانەیە، ئەویش بەم شیعرە سکاڵای خۆی بۆ خەلیفە عەلی کوڕی ئەبوتالیب– خوا لێی رازی بێ– بەرز کردەوە:

قالت أخي مات وعندما هلك ستمئة من الدنانير ترك
ولي بدينـار شريح[1] قد حكم وقد أتيت اشتكي مما ظلم
قـال لعل حين ذاق حتـفه عصـابة سواك خلى خلفه
وعـدهم كما مضى قالت نعم فقـال بالحق ضى وما ظلم

[1] واته قازى شورەيح.

له ئیسلامدا وەك چۆن تاك كۆمەڵێ مافی لەسەر كۆمەڵگە (كە لە دەوڵەتدا خۆی دەنوێنێ) هەیە، كۆمەڵگەیش كۆمەڵێ مافی لەسەر تاك هەیە. هەر مافێك، جۆر و سروشتی هەرچۆن بێ، بە هەندێ كۆت و مەرج كە قورئانی پیرۆز ناوی ناون سنوورەكانی خوا، بەستراوەتەوە. خوا دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾[1].

هەركەس سنووری مافێك لە مافەكانی بەزاند بە ستەمكار و زیادەڕەویكار بۆ سەر مافی ئەوانیتر دادەنرێ، لەبەرئەوەی نە بە شەرع و نە بە یاسا و نە بە عەقڵ ڕەوا نییە مرۆڤ ئازادیی ڕەها و بێ قەید و شەرتی هەبێ، واتە تاك چی بوێ و كەی بیەوێ و چۆنی بوێ بیكات. تاك بەم مانایە ئازادی نیە، چونكە شتی وا جێی باوەڕ نیە مەگەر ئەو كەسە بەتەنیا و دوور لە هەر كۆمەڵە خەڵكێك بژی، لەبەرئەوەی تاكەكانی نێو هەر كۆمەڵگەیەك كۆمەڵێ بەرژەوەندی و مافی هاوبەشیان هەیە، بۆیە ناكرێ هیچكامیان ئازادییەكی ڕەهای هەبێ لە مومارەسەكردنی مافی خۆیدا بەبێ ئەوەی ئەو كارە دەستدرێژی بێ بۆ سەر ئازادی و مافی ئەوانیدی. بەڵكو دەخوازێ هەر تاكێك دەست لە بەشێك لە ئازادی و مافەكانی خۆی هەڵبگرێ لەبەرانبەر ئەوەی ئەوانیتریش لە ماف و ئازادیەكانیان بێبەش نەكا، ئەوە نرخی ژیانی هاوبەشە لە كۆمەڵگەیەك یان چەند كۆمەڵگەیەكدا.

وا لە خوارەوە بەپێی هەمان ڕیزبەندی كە لە بەشی یەكەمدا سەبارەت بە مافی تاك لەسەر كۆمەڵگە خستمانە ڕوو، چەند نموونەیەك لە مافی كۆمەڵگەیش بەسەر تاكەوە باس دەكەین.

---

[1] البقرة: ٢٢٩.

١- مافی ئازادیی عەقیدە:

ئەگەرچی ئیسلام مافی بە هەموو ئادەمیزادێك داوە ئەو عەقیدەیەی قەناعەتی پێی هەیە هەڵیبژێرێ، بەڵام ئەم ماف و ئازادیەی بە هەندێ کۆت سنووردار کردوە، لە گرنگترینیان ئەوەیە مومارەسەکردنی ئەو مافە لەتەك سیستمی گشتی و ئادابی گشتیدا تێك نەگیرێ.

٢- مافی ژیان:

ژیانی هەموو تاکێك لە هەر کۆمەڵگەیەکدا لەنێوان خۆی و ئەو کۆمەڵگەیەدا هاوبەشە، بۆیە پێویستە بەشێوەیەك سوودی لێ نەبینێ زیان بە کۆمەڵگە بگەیەنێ، واتە لە هەوا و هەوەس و خراپەدا بەکاری نەهێنێ. ژیانی رۆژانە ٢٤ سەعاتە و پێویستە بەشێوەیەك دابەش بکرێ بەفیڕۆ نەچێ. یان بۆ سێ سێ¯یەك دابەش بکرێ، سێیەکێکی بۆ خەوتن، سێیەکێکی بۆ کارکردن و سێیەکێکیشی بۆ پشوودان بە رەچاوکردنی ئەو ئەرکانەی خوا خستوونیەتیە سەر شانی کە عیبادەتەکانە وەك پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (أن لربك عليك حقاً، ولنفسك عليك حقاً، ولاهلك عليك حقاً، فأعط كل ذي حق حقه)[1].

٣- مافی پاراستنی ناموس:

پێویستە خاوەن ناموس خۆی ئەو مافە بپارێزێ بەر لەوەی داوا لە کۆمەڵگە بکا پارێزگاری و پاسەوانی بکا. پێویستە ئافرەت ئەرکی خۆی بەرانبەر کۆمەڵگە و پەروەردگاری جێبەجێ بکا ئەنجا داوای مافەکانی بکا. ئەگەر ئەو بەدەستی خۆی،خۆی خستە بەردەم گەلەگورگ و چووە دەر بۆ شەقام و پارك و بازاڕە گشتیەکان و بەشێوەی نەفامیی یەکەم خۆی رازاندەوە و خۆی بە چێژێك دانا کە بۆ

[1] صحيح البخاري و كتاب الصيام، ص٤٩٠.

ئەوە خەلق کراوە پیاو چێژی لێ وەربگرێ، بەوە لە شان و شکۆ و بەهای خۆی وەك مرۆڤێك کەم دەکاتەوە، کە هەمان ماف و ئەرکی پیاوی هەیە. ئەگینا بۆی نیە داوای یەکسانی لەگەڵ پیاو بکا لە هەموو ئەوەی پەیوەندی بە پێگەی لە کۆمەڵگەدا هەیە.

**٤- مافی یەکسانی لەبەردەم یاسا:**

هەر خاوەن مافێك کە داوای مافی خۆی دەکا پێویستە بەو ئەرکەوە پابەند بێ کە بەرانبەر ئەو مافەیە. کەسێکی تەوەزەل و کەمتەرخەم لە جێبەجێکردنی ئەرکەکانی سەر شانی بۆی نیە داوای ئەو مافانە بکا کە بەرانبەر ئەو ئەرکانەن. مافی پالاوتن کە لە یاسادا بە یەکێك لە مافە سیاسیەکان دادەنرێ بەر لەوەی ماف بێ ئەرکە، لەم روانگەوە کەسەکە بۆی نیە خۆی، خۆی کاندید بکا بۆ وەرگرتنی پۆست یاخود وەزیفەیەك یان ئەندامێتیی ئەنجوومەنە نوێنەرایەتی یاخود پەرلەمانیەکان، بەڵکو پێویستە کەسانی ئەهلی خیبرە و ئاگەدار بە توانا و لێهاتنەکانی کاندیدی بکەن. زۆر فەرمودەی پێغەمبەرﷺ هەن بەڵگەن لەسەر ئەمە، لەوانە ئەوەیە ئەبوموسای ئەشعەری ریوایەتی کردوە کە دەڵێ: من و دوو پیاو لە ئامۆزاکانم چووینە لای پێغەمبەرﷺ، یەکێکیان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! بمانکە بە بەرپرس لەسەر شتێك لەوانەی خوای گەورە خستویەتیە ژێر دەستت (مەبەستی پێدانی پۆست بووە–وەرگێر)، ئەویتریشیان هەمان شتی گوت. پێغەمبەریشﷺ فەرموی: "سوێند بەخوا ئێمە ئەم کارە بە کەسێك ناسپێرین داوای کردوە، یان کەسێك پەرۆشی بووە"[1].

---

[1] صحيح مسلم، كتاب الامارة: ٦/٦.

**٥- مافی کارکردن:**

ئەو کەسەی داوای کارێك لە دەوڵەت دەکا پێویستە بتوانێ شان بداتە ژێر ئەو کارە و پسپۆڕی و شارەزایی لەوەدا هەبێ داوای دەکا. ئەگەر داواکەیشی پەسەند کرا پێویستە لە کارەکەیدا دڵسۆز و لە راپەڕاندنی ئەرکی سەرشانی دەستپاك بێ و پابەندیەکانی جێبەجێ بکا. بۆ هیچ کەسێك دروست نیە داوای کارێك بکا لەسەر بنچینەی ئەو لێهاتنانە نەبێ کە بۆ راپەڕاندنی ئەو کارە پێویستن. هەوڵدان بۆ گەیشتن بە کارێك و شاندانە بەر ئەرکێك کە توانای ئەوە لەخۆیدا نابینێ بەو ئەرکە هەستێ، ناپاکیکردنە لە کۆمەڵگە. هەروەها پێویستە کارەکە خۆی لەخۆیدا کارێکی دروست بێت و بە شێوەی دروستیش ئەنجامی بدات.

کار بۆ خاوەن پیشەکان ئەرکە، لەبەرئەوەی هەموو کار و پیشەیەك کۆمەڵگە پێویستی بێ بە مافێکی هاوبەش دادەنرێ لەنێوان خاوەنەکانیان و کۆمەڵگەدا، مافی کۆمەڵگەیش لەسەرەوەیە، بۆیە دروستە دەوڵەت پیشەکاران ناچار بکا کارەکەیان بکەن.

**٦- مافی فێربوون:**

فێربوون دەبێ لەپێناو زانستدا بێ و بۆ ئەوە بێ کار بەپێی ئەو زانستە بکرێ، نەك تەنها بۆ بڕوانامە و سەرچاوەی بژێوی بێ، هەروەها زانستەکە بۆ بڵاوکردنەوەی خراپە نەبێ. غەزالی دەڵێ: "رەعیەت تەنها بە خراپیی پاشاکان خراپ بوون، پاشاکانیش بەهۆی خراپیی زاناکانەوە خراپ بوون، بۆیە پەنا دەگرین بەخوا لە بوغرایی و کوێری، چونکە ئەوە دەردی بێ دەرمانە"[(١)].

---

[(١)] أحياء علوم الدين: ٢/٢٣٧.

**٧- مافی ئازادیی بیرورا:**

پێویسته ئەم مافه بەشێوەیەك بەكار نەیەت ببێتە مایەی پشێوی و بڵاوكردنەوەی بیری ژەهراوی، لەبەرئەوەی ئازادیی فیكر و بیرورا بە زیان نەگەیاندن بە تاك و كۆمەڵەوە بەستراوە. واتە بەكارهێنانی نەبێتە هۆی زەبردان لە مافی كەسانیدی، كە ئەوە بە تاوان و سەرپێچی دادەنرێ و لەگەڵ سیستمی گشتیدا لێكدەدا. ئازادیی بیرورا لە دیدی ئیسلامدا تەنها مافێكی تاك نیە، بەڵكو هەندێ جار بۆ ئاستی واجبێك كە پێویستە ئەنجام بدرێ بەرز دەبێتەوە . چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆز و چەندین فەرمودەی پێغەمبەرﷺ بەڵگەن لەسەر ئەمە. خوا دەفەرموێ: ﴿وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ﴾[1]، وقال: ﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ﴾[2].

پێغەمبەریش جەختی لەم مافە كردوە و دەفەرموێ(الدين النصيحة)[3]. هەروەها دەفەرموێ (أفضل الجهاد كلمة حق عند سلطان جائر)[4]. پێغەمبەر هانی هاوەڵان و ئوممەتەكەی داوە كە ئیجتیهاد بە را بكەن و دەفەرموێ (أذا حكم الحاكم فاجتهد ثم اصاب فله اجران، واذا اجتهد ثم اخطأ فله اجر)[5].

---

[1] ال عمران: ١٠٤.

[2] النحل: ١٢٥.

[3] صحيح البخاري: ٣٠/١، وصحيح مسام: ٧٤/١.واتە: ئاین ئامۆژگاریە.

[4] مستدرك الحاكم: ٥٥١/٤، برقم (٨٥٤٣).واتە: باشترین جیهاد گوتنی قسەی هەقە لای حاكمێكی زاڵم.

[5] صحيح البخاري: ٢٦٢٩/٦، برقم (٦٩١٩)، وصحيح مسلم: ١٣٤٢/٣، برقم (١٧١٦).واتە: ئەگەر حاكم بەئیجتیهاد بڕیاریدا و پێكای دوو پاداشتی هەیە، ئەگەر ئیجتیهادی كرد و نەیپێكا پاداشتێكی هەیە.

ئیجتیهاد و بیروڕایش نەبەستراون بە پرسە ئاینیەکانەوە، بگرە دەربڕینی را و بۆچوون و ئیجتیهاد لە هەر کێشەیەکی ئاڵۆسکاوی ژیان لە هەموو بوارەکاندا، لە ئەرکە بنچینەکییەکانە. هەر بە ئیجتیهاد و را کۆمەڵگەکانی خۆرئاوا و خۆرهەڵات گەیشتوونەتە ئەو پێشکەوتنە شارستانیەیان.

سەرەنجام، ئازادیی بیرورا و بیرکردنەوە بە نیازپاکی لە دەربڕینی را و ناونەزڕاندنی کەسانیتر یان تانەدان لە بیرە دروستەکانی کەسانیدیەوە بەستراوە. هەروەها پێویستەرەچاوی رێسا و بەها و ئاکار و نەریتە باوەکانی تێدا بکرێ و شیرازەی کۆمەڵگە تێکوپێك نەدرێ و دەست بۆ ناموسی خەڵك نەبرێ.

**٨- مافی ئازادیی هاتوچۆ:**

لە ئیسلامدا پێویستە هاتوچۆ بۆ ئامانجي دروست بێ و بۆ زیانگەیاندن نەبێ بە کۆمەڵگە. پێشتر گوتمان وەلی ئەمر (کاربەدەست) بۆی هەیە ئازادیی هاتوچۆ سنووردار بکا ئەگەر بەرژەوەندیی گشتی وای خواست، وەك کە عومەری کوڕی خەتاب – خوا لێی رازی بێ– چوونەدەرەوەی گەورە هاوەڵانی بەبێ مۆڵەتی ئەو لە شاری مەدینە قەدەغە کرد تا لە بەڕێوەبردنی کاروباری موسڵماناندا هاوکاری بکەن، هەروەها دروستە لەبەر هۆی تەندروستی و هیتر ئازادیی هاتوچۆکردن سنووردار بکرێ.

**٩- مافی پاراستنی عەقل:**

ئەمەیش یەکێکە لە مافەکانی کۆمەڵگە لەسەر تاك و یەکێکە لە پێنج شتە زەرورییەکە لە ئیسلام و لە ئامانجەکان (مقاصد)ی شەریعەتی ئیسلامیدا، چونکە مرۆڤبە عەقڵ لە باقیی گیانلەبەرانیتر جیا دەکرێتەوە و مرۆڤ دەبێتە جێنشینی خوا و ئەهلی تەکلیف و بەرپرسیارێتی. قورئان لە ٤٩ ئایەتدا جەختی لە گرنگیی عەقڵ و پێویستیی بەکارهێنانیلە خزمەتی کۆمەڵگەدا کردوە و بەکارهێنانی هەر شتێکی

حەرام کردوە کە کێشەی تێ بخا، هەربۆیە بەچەند قۆناغێك سەرجەم جۆرەکانی مەستکەر و سرکەرەکانی حەرام کرد. ئەو قۆناغبەندیەیش بۆ ئەوە بوو تا کاردانەوەی نەرێنی لێ نەکەوێتەوە، لەبەرئەوەی کاتێ ئیسلام هات بینی ئەم دەردە کۆمەڵایەتییە بەبڵاوە کاریگەرییمەترسیداری لەسەر عەقڵی مرۆڤ و هەستکردنی بە بەرپرسیارێتی لەبەردەم خوا و کۆمەڵگەدا، کردوە. هەربۆیە ئەم نەخۆشیەی بە چوار قۆناغ قەڵاچۆ کرد:

لە قۆناغی یەکەمدا: مرۆڤی ئاگەدار کردەوە لەوەی مەستکەر رزقێکی دزێوە و فەرموی: ﴿وَمِنْ ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ وَالْأَعْنَابِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا﴾[1]. رزقی باشی عەتف کرد لەسەر سەرخۆشی. عەتفیش بۆ جیاوازبوونە و بەڵگەی ئەوەیە (مەعتوف عەلەیهی)دزێوە. بەڵگەنەویستیشە شەرع و یاسا رێگە بە دزێزە نادەن، لەبەرئەوەی بنچینەی دزێوی زیانی تاك یان کۆمەڵگە یان هەردووکیانە. هەموو زیانێکیش رەتکراوەیە.

لە قۆناغی دووەمدا: قورئان ویژدانی مرۆڤی بزواند و عەقڵی بێدار کردەوە، تا بیر بکاتەوە لەوەی مرۆڤی ژیر و هۆشیار کارێك ناکا زیانی لە سوودی زیاتر بێ، فەرموی: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِنْ نَفْعِهِمَا﴾[2]. مەبەست لە (اثم) لەم ئایەتەدا زیانە، کە بەرانبەر سوودە.

لە قۆناغی سێیەمدا: قۆناغی بەرتەسککردنەوەی کات و دەرفەت بوو لە ئالودەبووان و خووگرتووان بە بەکارهێنانی مەستکەرەکان، بەوەی داوای کرد لەنزیکی کاتی نوێژەکاندا بەکاریان نەهێنن و دەفەرموێ:﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقْرَبُوا

---

[1] النحل: ٦٧.

[2] البقرة: ٢١٩.

الصَّلَاةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى حَتَّى تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ﴾[1].

قۆناغی چوارەم و کۆتاییش قۆناغی ناچارکردن و پابەندکردن بوو بە دابڕانی یەکجاری لە بەکارهێنانی هەموو مەستکەر و سڕکەرێك. خوا دەفەرموێ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾[2].

ئەم ئایەتە لەگەڵ ئایەتەکانیتر هەریەکەیان دەلالەتێکی بنبڕی هەیە لەسەر حەرامکردنی هەموو مەستکەر و سڕکەرێك کێشە لە عەقڵی مرۆڤدا دروست بکا کە مولْکی کۆمەلگەیە و پێویستە پەك نەخرێ و لە خزمەتی بەرژەوەندیی گشتیدا بەکار بێ. بەلگەیئاماژە بۆ ئەوەیش ئەمانەی خوارەوەیە:

أ- دانانی مەستکەرەکان لە ریزی بتپەرستیدا.

ب- مەستکەر (یان سڕکەر)ی بە شتێکی پیس داناوە، واتە پیسیەك پاکبوونەوەی نیە.

ج- کارێکە لە کارەکانی شەیتان، هەموو کارەکانیشی دزێون لەبەرئەوەی سەرچاوەی شەڕە.

د- سەرخۆشی،بەهۆی لاوازکردنی بۆ عەقڵ،سەرچاوەی خراپە و دوژمنایەتی و رق و کینەیە لەنێو خەلْکدا.

هـ- بەرگرتنە لە عەقڵ و رێلێگرتنیەتی لەوەی بەو ئەرکە هەستێ کە لەسەر خاوەن ژیریەکانە لەبەردەم خوا و کۆمەلگەدا و پەکخستنی ئەو شتەی مرۆڤی پێ لە گیانلەبەرەکانیتر جیا کراوەتەوە.

و- بەکارهێنانی فەرمانی (واجتبنوە)، واتە لێی دووربکەونەوە، بەلگەی

---

[1] النساء: ٤٣.

[2] المائدة: ٩٠.

مەترسیداریەتی، چونکە ئەم دەستەواژەیە زۆر بەهێزترە لە هەندێ دەستەواژەی وەك (حرمت) و ئەو شتانە.

ز- ئەو پرسیارە سەرکۆنەئامێزەی لە کۆتایی ئایەتەدا هاتووە کە دەفەرموێ ﴿فَهَلْ أَنْتُمْ مُنْتَهُونَ﴾[1]، بەڵگەی ئەوەیە پەکخستنی عەقڵ و بەکارنەهێنانی لە ئەدای ئەو پەیامەی خراوەتە سەر شانی مرۆڤ بۆ خزمەتکردنی تاك و کۆمەڵگە، لە بابەتە مەترسیدارەکانە لەسەر ژیانی کۆمەڵگە و پەرەپێدانی. کەواتە پاراستنی عەقڵ لە مافەکانی کۆمەڵگەیە.

**١٠- مافی موڵکایەتی:**

خاوەندارێتی یاخود ملکایەتی (الملکیة) لە ئیسلامدا جیاوازە لە ملکایەتی لە هەردوو رژێمی شیوعی (کۆمۆنیزم) و سەرمایەداری (کاپیتالیزم)دا. لە سیستمی شیوعیدا رەگەزەکانی بەرهەمهێنان بەدەست دەوڵەتەوەن و ئەو کەسەی بۆ وەبەرهێنانی ئەو خاوەندارێتیە بەکار دەهێنرێ وەك ئامێرێکە لەژێر رەحمەتی دەوڵەتدا. لە سیستمی سەرمایەداریشدا خاوەندارێتی رەها و بێسنوورە، پیرۆزە و نابێ دەستی لێبدرێ، لەبەرئەوە بووەتە بایسی سەرهەڵدانی سیستمی چینایەتی ناقۆڵا کە دژ بە بەرختەوەریی تاك و کۆمەڵگەیە. بەڵام لە شەریعەتی ئیسلامیدا جیاواز لەمانە خاوەندارێتی نە هی دەوڵەتە و نە هی تاکە بەو دوو تێگەیشتنەی پێشوو، بەڵکو هی خوای گەورەیە و خاوەنی راستەقینەی شتەکان خوایە و خاوەنی رواڵەتی بریکار و جێنشینی خوایە. قورئانی پیرۆز لە زۆر ئایەتدا ئەمەی بەدەق باس کردوە، وەك دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ﴾[2] و

---

[1] المائدة: ٩١.

[2] المائدة: ١٨.

دەفەرموێ: ﴿لِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا فِيهِنَّ﴾[1].

رۆڵی ملکداری رواڵەتی رۆڵی بریکار و جێنشینی خوایە، خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَنْفِقُوا مِمَّا جَعَلَكُمْ مُسْتَخْلَفِينَ فِيهِ﴾[2]. کەواتە ملکایەتی لە ئیسلامدا وەزیفەیەکی کۆمەڵایەتیە پێویستە رەگەزەکانی بەرهەمهێنان لە زەوی و پارە و خاوەن ملك خۆی، بۆ خزمەتی کۆمەڵگە بەکار بێن. بۆرکردنی پارە بە یەکێك لە تاوانەکانی دەستدرێژیکردنە سەر مافی کۆمەڵگە دادەنرێ. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلَا يُنْفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾[3]. مەبەست لە ﴿فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ بەرژەوەندیی گشتی و بەرژەوەندیی کۆمەڵگەیە.

سەبارەت بە رەگەزی زەوی، هەرکەس زەویەکی کشتوکاڵی هەبێ، ئەگەر بۆ ماوەی سێ ساڵ بەبێ عوزر دەستی لە وەبەرهێنانی هەڵگرت، دروستە وەلی ئەمر (سەرۆکی دەوڵەت) لێی بسەنێتەوە و بیداتە دەست کەسێك کە بۆ بەرژەوەندیی خۆی و کۆمەڵگە بیهێنێتە بەر. هەر کەسیش بەشێوەیەکی دروست زەوی وەبەر بێنێ خوای گەورە لە بەندە ساڵحەکان و بە میراتگری زەوی دادەنێ، وەك دەفەرموێ ﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِنْ بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ﴾[4].

خوای گەورە کۆمەڵێ کۆت و مەرجی بەسەر خاوەن ملکی رواڵەتی –کە بریکار و جێنشینە– سەپاندوە تا پێیانەوە پابەند بێ و لە وەبەرهێنانی ملکەکەیدا رەچاویان بکا، ئەم کۆتانە هەندێکیان ئەرێنین واتە (کردن)ن و پێویستە خاوەن ملك بیانکا، هەندێکیشیان نەرێنین، واتە (نەکردن)ن و پێویستە خاوەن ملك نەیانکا، بەم شێوەیە:

---

[1] المائدة: ١٢٠.

[2] الحديد: ٧.

[3] التوبة: ٣٤.

[4] الانبياء: ١٠٥.

أ- لە کۆتە ئەرێنییەکان:

١- پێویستە ملکدار رەگەزەکانی بەرهەمهێنان لە زەوی و پارە و کۆشش بەئامانجی گەشەپێدانی ئابووری و کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگەدا وەبەربێنێ، بۆیە بۆرکردنی پارە و پەکخستنی زەویی کشتوکاڵی لێ حەرام کردوە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (ليس لمحتجر حق بعد ثلاث سنوات)[1]. ئیحتیجار-یش دەستگرتنە بەسەر زەویی مردوودا بەمەبەستی هەوڵدان بۆ زیندووکردنەوە و ئاوەدانکردنەوەی. عومەری کوڕی خەتاب- خوا لێی رازی بێ- لە خیلافەتەکەیدا گوتی (من احيا ارضاً ميتةً فهي له، وليس لمحتجر حق بعد ثلاث سنين)[2].

٢- پابەندکردنی ملکدار بە دەرکردنی زەکاتی ماڵەکەی ئەگەر ماڵەکەی لەو شتانە بوو کە زەکاتیان تێدا واجبە.

٣- پابەندکردنی بە خەرجکردنی ئەوەی لە پێویستیی خۆی و خێزانەکەی زیادە لەپێناو بەرژەوەندیی گشتی و پڕکردنەوەی ئاتاجی هەژار و نەدارانی کۆمەڵگە. خوا دەفەرموێ: ﴿لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ﴾[3]. واتە ئەو نیعمەتانەی لە پێویستیی خاوەنەکانیان زیادن.

٤- ئەگەر بەرژەوەندیی گشتی خواستی، دروستە خاوەنداریّتی لە خاوەنەکەی بسەنرێتەوە با رازیش نەبێ. وەلی ئەمر بۆی هەیە لەبەر بەرژەوەندیی گشتی

---

[1] بڕوانە: نصب الراية، للزيلعي، تحقيق محمد يوسف البنوري، دار الحديث، مصر: ٤/٢٩٠. واتە: ئەوەی دەست بەسەر زەویەکی مردوودا دەگرێ بۆ زیندوکردنەوەی، دوای سێ ساڵ مافی نامێنێ.

[2] بڕوانە: نصب الراية للزيلعي: ٤/٢٩٠. واتە: ئەوەی زەویەکی مردوو زیندوو بکاتەوە زەویەکە هی ئەوە، پاش سێ ساڵیش مافی نامێنێ.

[3] التكاثر: ٨.

دەست بەسەر ئەو ملّكانەدا بگرێ كە هی تاكەكەسن لەبەرانبەر قەرەبوویەكی دادپەروەرانەدا. ئەم بیرۆكەیە لە سەردەمی پێغەمبەر و خەلیفە راشیدەكاندا جێبەجێ كراوە[1].

**ب- كۆتە نەرێنیەكان:**

١- پێویستە ملّكدار بەشێوەیەك ملّكەكەی بەكار نەهێنێ كە زیان بە كەسانیتر لە دەرودراوسێ و خەڵكیتر بگەیەنێ. هەروەك بۆی نیە لە بەكارهێنانی هەقدا ستەم بكا.

٢- خۆلادان لە برەودان بە ماڵەكەی بە گزی و قۆرخكاری. پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: (المحتكر ملعون)[2]، وقال: (لا يحتكر الا الخاطئ)[3]، وقال: (من غشنا ليس منا)[4].

٣- خۆلادان لە برەودان بە ماڵەكەی لەرێی سووەوە. خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا﴾[5].

٤- خۆلادان لە دەستبلاّوی و هەروەها لە چروكیش. خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَى عُنُقِكَ وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَحْسُورًا﴾[6].

---

[1] بروانە: فلسفة الشريعة، للمؤلف، ص ٩٢ وما بعدها.

[2] صحيح مسلم: ١٢٢٨/٣ برقم (١٦٠٥).واتە: قۆرخكار نەفرەتلێكراوە.

[3] رواه مسلم: سبل السلام: ٣٢/٣.واتە تەنها كەسێكی هەڵە قۆرخ دەكا.

[4] واتە: هەركەس گزیمان لێبكا لە ئێمە نیە. پێغەمبەرﷺ بەلای كۆمە خواردنێكدا تێپەری، دەستی خستە ناوی دەستی تەڕ بوو. گوتی: ئەمە چییە خاوەنی خواردن؟ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا باران لێی داوە! ئەویش گوتی: ئەی نەدەكرا بیخەیتە سەرەوە تا خەڵك بیبینن؟! هەر كەس گزی بكا لە من نیە. بروانە: سبل السلام: ٣٧/٣.

[5] البقرة: ٢٧٥.

[6] الاسراء: ٢٩.

# بەشی سێیەم

## مافی تاك لەسەر تاك

دەكرێ مافەكانی تاك بكرێن بە سێ بەشەوە:

مافە كۆمەڵایەتیەكان، مافە داراییەكان و مافە خێزانیەكان.

## یەکەم: مافە کۆمەڵایەتیەکان:

ئەوانە مافگەلێکن پەیوەندیی برایانە و کۆمەڵایەتی و نیازپاکی و خۆشرەفتاری لە حاڵەتی لێکخشانی تاکەکانی کۆمەڵگە لەگەڵ یەکتر، دەیخوازێ. لەوانە:

١- مرۆڤ ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ برا مرۆڤەکەیشی پێی خۆش بێ، ئەم پێوەرەیش گشتی و سەرتاپاگیرە و سەرجەم پێویستیەکانی ژیان دەگرێتەوە سەرچاوەی ئەو ئەرك و مافەیش بریتییە لە فەرمودەی:(لا یؤمن احدکم حتی یحب لأخیە ما یحب لنفسە)[1]. .

٢- لە مافەکانی تاك لەسەر تاك ئەوەیە راستگۆ بێ لەوەی دەیڵێ، ئەگەر گفتی بەکەسێکدا گفتەکەی بباتەسەر. گفتدان (بەڵێندان) هێندە گەورەیە خوا لە قورئاندا خستویەتیە پێش پەیام و پێغەمبەرایەتی. خوا دەفەرموێ: ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِسْمَاعِيلَ إِنَّهُ كَانَ صَادِقَ الْوَعْدِ وَكَانَ رَسُولاً نَّبِيّاً﴾[2]. هەروەها ناپاکی لەو ماڵ و قسە و نهێنیانەی لەلاینی نەکا. ئەگەر دژایەتیی کەسێکیشی کرد سنووری ماقوڵ و پێویست تێنەپەڕێنێ. سەرچاوەی ئەم ئەرك و مافانەیش بریتییە لە فەرمودەی:(آیة المنافق ثلاث: أذا حدث کذب، واذا وعد اخلف، واذا أؤتمن خان)، لە ریوایەتێکدا: (واذا خاصم فجر)[3]. دووڕوو

---

[1] صحیح البخاري: ١٤/١، برقم (١٣)، وصحیح مسلم: ٦٨/١و برقم (٤٥).واتە: کەسێکتان باوەڕ ناهێنێ تا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەیشی پێی خۆش نەبێ.

[2] مریم : ٥٤

[3] سبل السلام: ٢٤٦/٤.(واتە: نیشانەی مونافیق سیانە: ئەگەر قسەی کرد درۆ دەکا، ئەگەر بەڵێنیدا دەیشکێنێ، ئەگەر راسپاردەی درایە ناپاکی لێدەکا). (ئەگەر دژبەری کرد لە سنوور دەردەچێ).

(موونافیق) ئەو کەسەیە بەڕواڵەت ئیمانداره و بەناواخن کافره. هەموو کەسێکی دوودیو رواڵەتی لە ناواخنیجیاوازه.

٣- زماندرێـژی بەسـەردا نـەکا بـە جـوێن و بوهتـان و تحـریم (لەعنـەت). خـوا دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾[١]..

٤- گومانی خراپی پێ نەبا. خوا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ﴾[٢]. پێغەمبەر فەرمویەتی: (أیـاکم والظـن، فـأن الظـن اکذب الحدیث)[٣]. گومان (الظن): ئەو شتەیە بەخەیاڵدا دێ لـە ئەگـەرێك کـە رێی تێدەچێ راست بێ یـان درۆ، جـا پشـت بـەوە ببەسـتێ و لـە روانگەیـەوە حوکم بدا.

٥- ستەمی لێنەکا. لە حەدیسی قودسیدا[٤]هاتووە، پێغەمبـەر لەسـەر زاری خـوای گەورە دەفەرموێ: (یاعبادي! أنـي حرمـت الظلـم علـى نفسـي وجعلتـه بیـنکم محرماً، فلا تظلموا)[٥]. ستەم (الظلم): تەسەڕوفکردنە بە ملکی کەسانیتر بەبێ پاساوێکی شەرعی و تێپەڕاندنی سنوور. ستەم بە عەقڵ و شەرع ناشیرینە.

٦- چاوپۆشی لـەو کەسـە بکـا سـتەمی لێکـردوە. خـوا وەسـفی تـەقواداران دەکـا بەوەی ﴿الَّذِينَ يُنْفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾[٦]. بـەڵام ئـەم مافـە ئیلزامـی نیـە بـەڵکو چـاکە و

---

[١] النور: ٤.

[٢] الحجرات: ١٢.

[٣] سبل السلام: ٢٤٨/٤.

[٤] ئەو حەدیسەیە وشەکانی هی پێغەمبەرن بەڵام ناوەرۆکەکەی لە خواوەیە.

[٥] سبل السلام: ٢٥٣/٤.

[٦] ال عمران: ١٣٤.

پیاوەتییە، هەموو ستەمکارێك شایستەی بەخشین نیە. پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (وما زاد عبد بعفو الاّ عزاً، وما تواضع أحد لله الاّ رفعه الله تعالى)[1].

٧- لە پاشملە بەشێوەیەك باسی نەکا کە پێی ناخۆشە، ئەمە پێی دەوترێ غەیبەت. خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَجَسَّسُوا وَلَا يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضًا﴾[2]. پێغەمبەرﷺ لە یارانی پرسی: ئایا دەزانن غەیبەت چییە؟ گوتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن. گوتی: ئەوەیە بەشێوەیەك باسی براکەت بکەیت کە پێی ناخۆشە. کەسێك گوتی: ئەی ئەگەر براکەم ئەو شتەی تێدا بوو باسم دەکرد؟ گوتی: ئەگەر ئەو شتەی تێدا بوو تۆ دەیڵێیت ئەوە غەیبەتت کردوە، خۆ ئەگەر تێیدا نەبوو ئەوە بوهتانت بۆ کردوە"[3].

لە ئەرکەکانیتری تاك لەسەر تاك دەستباری ئابووری و کەلتوری و کۆمەڵایەتی و هاوکاریکردنە لەسەر خێر و خواناسی، هاوکات هاوکارینەکردنە لەسەر گوناح و دەستدرێژی.

زۆر مافیتری تاك لەسەر تاك لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا هەن، کە بواری باسکردنیان نیە.

## دووەم: مافە داراییەکان:

لەوانە:

١- پابەندییە داراییەکانی بەرانبەر ئەو کەسەی شتێکی لەئەستۆی ئەودایە جێبەجێ بکا، جا چ سەرچاوەی ئەو پابەندییە گرێبەستێك یان ویستێکی تاکەکەسی

---

[1] سبل السلام: ٢٧٤/٤.واتە: مرۆڤ بە لێخۆشبوون سەربەرز دەبێ، هەرکەسیش بۆ خوا لەخۆبوردە بێ خوا بەرزی دەکاتەوە.

[2] الحجرات: ١٢.

[3] أخرجه مسلم، سبل السلام: ٢٥٤/٤، البهت: بفتح الباء والهاء. البهتان.

(ڕەفتارێکی تاکەکەسی) بێ وەك وەسێت و دیاری و گفتی پاداشتکردن، یان فەوتاندنی ماڵی کەسیتر یان هەر جۆرە پابەندیەکیتری دارایی بێ، خوا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ﴾[1]. واتە پابەند بن بە ناوەرۆکی گرێبەستە دروستەکان و لە قەرەبووی زیانەکان. پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: (لا ضرر ولا ضرار)[2].

٢- گزی لەو کەسە نەکا کە مامەڵەیەکی دارایی لەتەکدا دەکا. ڕێگەکانی گزیکردنیش زۆرن: یەکێکیان پێی دەوترێ النجش (بەفەتحی نون و سکونی جیم) کە بریتییە لە زیادکردنی کاڵا نەك بۆ ئەوەی بیکرێ بەڵکو بۆ فریودانی ئەوانەی دەیانەوێ بیکڕن، ئەوەیش بە تێوەگلانی بفرۆشیش دەکات و هەردوو لە گوناحەکەدا بەشدارن. لە ئیبن عومەرەوە- خوا لێی ڕازی بێ- (پێغەمبەر نەهی لە نەجش کرد)[3]. زانایانی ئیسلامیش یەکدەنگن لەسەر ئەوەی ناجش بەو کارەی سەرپێچی خوا دەکا.

٣- بەسەر فرۆشتنی براکەیدا شت نەفرۆشێ (واتە نرخ زیاد یان کەم نەکا تا سوودەکە بۆ خۆی بێ نەك براکەی-وەرگێڕ). پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی (لايبيع احدكم على بيع اخيه، ولا يخطب على خطبة أخيه الا ان يأذن منه)[4].

---

[1] المائدة: ١.

[2] أخرجه احمد واصحاب السنن والحاكم في مستدركه، وقال عنه: صحيح الاسناد على شرط مسلم ولم يخرجاه، ووافقه الذهبي.واتە: نە زیان بگەیەنیت و نە زیانت پێ بگا.

[3] نيل الاوطار: ٥/١٨٨.

[4] صحيح البخاري: ٢/٧٥٢، وصحيح مسلم: ٢/١٠٣٣. واتە: با کەستان بەسەر مامەڵەی براکەیدا مامەڵە نەکا، داخوازی ژن بەسەر داخوازی براکەیدا نەکا مەگەر خۆی مۆڵەتی پێبدات.

٤- لەکاتی کڕین و فرۆشتندا براکەی چەواشە نەکا، چەواشە و فریودانیش بریتییە لە بەرکاهێنانی فێڵ و تەڵەکە تا کەسێك بخرێتە هەڵەوە، یان بۆ ئەوەی لەسەر ئەو هەڵەیەی تێی کەوتووە بەردەوام بێ، تا بیخاتە ناوی. جۆرێك لە چەواشەکردن پێی دەوترێ (التصرية)، کە لە رووی زمانەوانییەوە بەمانای: ئاوکۆکردنەوە دێ. مەبەست لێرەدا کۆکردنەوەی شیرە بە راکێشانی گوانی ئاژەڵێك و نەدۆشینی بۆ ماوەیەك تا بکڕوا بزانێ ئاژەڵەکە شیری زۆرە و پارەی زیاتری پێ بدا. پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: (لا تصروا الابل والغنم، فمن ابتاعها بعد ذلك فهو بخير النظرين بعد أن يحلبها: أن رضيها أمسكها، وأن سخطها ردها وصاعاً من تمر)[1].

## سێیەم: چەند نموونەیەک لە مافە خێزانیەکان:

### ١- مافەکانی هاوسەری:

ئەگەر گرێبەستی هاوسەرگیری بەشێوەیەکی دروست کرا و جێبەجێ بوو، بەپێی شەرع کۆمەڵێ مافی لەسەر پەیدا دەبێ، هەندێکیان دارایی و هەندێکیان نادارایین، هەندێکیان تایبەتن بە یەکێك لە دوو هاوسەرەکە و هەندێکیان هاوبەشن. مافی هەریەکەیان ئەرکە لە گەردنی ئەویتریاندا. خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾[2].

---

[1] نیل الاوطار: ٢٤١/٥.واتە بەفێڵ گوانی مەڕ و وشتر پڕ شیر پیشان مەدەن، هەرکەس کڕی پاش دۆشینی، دوای سێ رۆژ ئەگەر بەدڵی بوو گلی دەداتەوە و ئەگەر بەدڵی نەبوو و زانی ساختەیە لەگەڵ ساعێك خورمادا دەیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی.

[2] البقرة: ٢٢٨.

أ- مافە نادارابیە هاوبەشەکانی نێوان ژن و مێرد:

**١- مافی چێژوەرگرتن:** بۆ هەریەکەیان حەلاڵە لەو چوارچێوەیەی لە شەریعەتدا کێشراوە چێژ لەویتریان وەربگرێ. لەسەر هەریەکەیان پێویستە بەدەم حەزی ئەویتریانەوە بچێ مەگەر بەربەستێکی تەندروستی هەبێ وەك نەخۆشی، یان بەربەستێکی شەرعی وەك رۆژووی رەمەزان یان بێنوێژی (سوڕی مانگانە) یان زەیسانی (نیفاس). خوا دەفەرموێ: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّى يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللَّهُ﴾[١].

دروست نیە مێرد بۆ ماوەی زیاتر لە چوار مانگ لە ژنەکەی بتۆرێ یان نەچێتە لای. خوا دەفەرموێ: ﴿لِلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِنْ فَاءُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ وَإِنْ عَزَمُوا الطَّلَاقَ فَإِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾[٢]. ئەگەر پیاوەکە تا تەواوبوونی ئەو ماوەیە لە بەجێهێشتن و نەچوونەلای ژنەکەی بەردەوام بوو، بەلای ئیمامی ئەبوحەنیفەوە تەلاقی دەکەوێ، لەبەر ئەو ئایەتەی دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ عَزَمُواْ الطَّلَاقَ﴾. الایلاو لێبڕانە بۆ تەلاق. بەلای جمهورەوە تەلاقەکەی ناکەوێ بەلام ژنەکەی مافی هەیە داوای جیابوونەوە بکا. بەلای ئیمامی و زاهیریەکانەوە ئەو پیاوە بەند دەکرێ تا سەرجێیی لەگەڵ ژنەکەی دەکا، یان داوای تەلاق دەکا یان لە زینداندا دەمرێ.

**٢- هاوسەریکردنی باش:** پێویستە هەریەکەیان رێزی ئەویتریان بگرێ و دڵی رابگرێت و لە هەرا و زنا و ناکۆکی دوور بکەونەوە. لەبەرئەوەی خوا دەفەرموێ:

---

[١] البقرة: ٢٢٢.

[٢] البقرة: ٢٢٦-٢٢٧.

﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾[1]. دۆستایەتی و خۆشەویستی و ئۆقرەیی لە گرنگترین بەرهەمەکانی هاوسەرایەتین. خوا دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾[2].

٣- **زیان پێنەگەیاندنی مەعنەوی** وەك سووكایەتی و جوێن و بەگوێنەکردنی یەکتر سەبارەت بەو مافی ژن و مێردایەتیەی لە گەردنیاندایە. خوا دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا...الخ﴾[3] بە مێردەکانیش دەڵێ: ﴿وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا﴾[4].

**ب- مافەکانی مێرد:**

١- مافی گوێڕایەڵیکردنی لەسەر ژنەکەی هەیە لە هەر شتێکدا بەرهەمی هاوسەریکردنەکە بێ، مەگەر ئەوەی سەرپێچیی خوای تێدا بێ.

٢- **دەسەڵاتی تەمێکردن**:ئەگەر گوێڕایەڵ بێ مێردەکەی نابێ دەستی لێ بەرز بکاتەوە، خوا دەفەرموێ ﴿فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا﴾. تەمێکردن بە ئامۆژگاریکردن، پشتتێکردن لە شوێنی خەوتندا دەبێت و لە حاڵەتی لادانی رەوشتی و ئەنجامدانی تاوانی بێڕەوشتیدا نەبێ لێدان دروست نیە. بەرزکردنەوەی سکاڵا دژی ژنەکەی زیان بە سومعەی خێزانەکە دەگەیەنێ، جیابوونەوەیشیان زیان بە هەردووکیان و منداڵەکانیان دەگەیەنێ، لەبەرئەوە تەمێکردنی لەلایەن مێردەکەیەوە بۆ ئەوە چارەسەرە. لەم حاڵەتەدا پێویستە

---

[1] النساء: ١٩.
[2] الروم: ٢١.
[3] البقرة: ٢٣١.
[4] الروم : ٢١

لێدانەکە ئازاربەخش نەبێ، خوا دەفەرموێ: ﴿وَاللَّاتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ﴾[1]. پێغەمبەرﷺ لە حەجی ماڵئاواییدا گوتی (الا استوصوا بالنساء خيراً، فأنما هنّ عوان[2] عندكم، ليس تملكون منهنّ شيئاً غير ذلك، ألاّ ان يأتين بفاحشة مبينة، فأن فعلن فاهجروهنّ في المضاجع واضربوهنّ ضرباً غير مبرح، فأن أطعنكم فلا تبغوا عليهنّ سبيلاً)[3].

**ج- مافە ناداراییەکانی ژن:**

١- زیان پێنەگەیاندنی، ئەویش بەوە دەبێ مێردەکەی دادپەروەرانە مامەڵەی لەگەڵدا بکا، بەو شێوەیە لەگەڵی بجوڵێتەوە کە پێویستەو مافەکانی بەبێ زیاد و کەم بپارێزێ. پێغەمبەرﷺ: (خيركم خيركم لأهله، وأنا خيركم لأهلي)[4].

٢- ئەگەر پتر لەژنێکی هەبوو پێویستە لە مامەڵەکردنیانٰ یەکسان بێ، چ لە شەو مانەوە بێ یان لە نەفەقە و پێویستییەکانیتری ژن و مێردایەتی، لەبەرئەوەی یەکێك لە مەرجەکانی فرەژنی دادپەروەرییە لەنێوان ژنەکاندا. قال تعالى:﴿فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً﴾[5]. هەروەها رەچاوکردنی مافی هەریەکەیان و نۆرەی خۆی لە مانەوەی شەو نەك رۆژ.

---

[1] النساء: ٣٤.

[2] جمع عانية، واتە دیل.

[3] سنن ابن ماجة: ٥٩٤/١، وسنن الكبرى، للبيهقي: ٣٧٢/٥.واتە: ئەها بەباشی لەگەڵ ئافرەتان بجوڵێنەوەلەبەرئەوەی ئەوان دیلن لای ئێوە، جگە لەوە هیچیترتان لەسەریان نیە مەگەر بێرەوشتیەکی ئاشکرا بکەن، ئەگەر کردیان جێگەیان لێ جیا بکەنەوە و بەسوکی لێیان بدەن، ئەگەر گوێڕایەڵیان کردن ئیتر دەستیان لێ بەرز مەکەنەوە.

[4] صحيح ابن حبان: ٤٨٤/٩. واتە: باشترینتان باشترینتان بۆ خێزانی خۆی، منیش باشترینتانم بۆ خێزانی خۆم.

[5] النساء: ٣.

**د- مافه داراییه‌کان:**

ئه‌مه‌یان ته‌نها مافی ژنه به‌سه‌ر مێرده‌وه، ته‌نها ئیبن حه‌زم نه‌بێ که ده‌ڵێ: له‌سه‌ر ژنی ده‌وڵه‌مه‌ند پێویسته نه‌فه‌قه‌ی مێردی هه‌ژاری بکێشێ، له‌به‌رئه‌وه‌ی میراتگریه‌تی، قورئانیش نه‌فقه‌ی به‌ستووه‌ته‌وه به میراته‌وه و ده‌فه‌رموێ: ﴿وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ﴾[1]. له مافه داراییه‌کان:

١- ماره‌یی دیاریکراو (المهر المسمی): ئه‌وه‌یش مافێکی دارایی ژنه که شه‌رعساز له گرێبه‌ستی هاوسه‌رگیری دروستدا له‌سه‌ر پیاوی پێویست کردوه. ئه‌و ماره‌ییه دیاریکراوه هه‌ر به ئه‌نجامدانی گرێبه‌سته‌که واجب ده‌بێ.خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێ: ﴿وَأُحِلَّ لَكُمْ مَا وَرَاءَ ذَلِكُمْ أَنْ تَبْتَغُوا بِأَمْوَالِكُمْ﴾[2].

٢- ماره‌یی هاوشان (مهر المثل): له‌م حاڵه‌تانه ئه‌م جۆره ماره‌ییه بۆ ژن واجب ده‌بێ:

أ- ئه‌گه‌ر هاوسه‌رگیریه‌که به‌تاڵبێ.

ب- ئه‌گه‌ر ماره‌ییه‌که به‌تاڵ بێ به‌هۆی ئه‌وه‌ی ماڵه‌که ناجێگیر(غیر متقوم) یان ماڵی که‌سێکیتر بێ به‌بێ ئیزنی خۆی.

ج-ئه‌گه‌ر ماره‌ییه‌که خراپ و بێئه‌ندازه نه‌ناسراو (مجهول) بێ.

د- ئه‌گه‌ر ماره‌ییه‌که له گرێبه‌ستی هاوسه‌رگیریه‌که‌دا دیاری نه‌کرابێ. خوا ده‌فه‌رموێ: ﴿فَانْكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ وَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾[3] وبعد قوله تعالى: ﴿فَمَا اسْتَمْتَعْتُمْ بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً﴾[4].

---

[1] البقرة: ٢٣٣.

[2] النساء: ٢٤.

[3] النساء: ٢٥.

[4] النساء: ٢٤.

### ٢- مافی منداڵ و باوان (الاباء) و خزمان:

منداڵان مافی شیردان و دایەنیکردنیان لەسەر دایکانیانە، بەڵگەی ئەمەیش فەرمایشتی خوایە کە دەفەرموێ ﴿والوالداتُ يرضعنَ أولادهنَّ حولين كاملين لمَنْ أرادَ أنْ يُتِمَّ الرضاعةَ وعلى المولودِ لهُ[1] رِزْقُهنَّ وكسوتُهنَّ[2] بالمعروفِ لا تُكَلَّفُ نفسٌ الاّ وسعها ولاتضارَّ[3] والدةٌ بولدها ولا مَوْلودٌ له بولده وعلى الوارث مثلُ ذلكَ فإن أرادا فصالاً[4] عن تراضٍ منهما وتشاورٍ فلا جناحَ عليهما وإن أردتُّم[5] ان تسترضعُوا أولادكمْ فلا جناحَ عليكمْ إذا سلَّمْتُمْ ماَ ءاتيتمْ بالمعروفِ واتقوا اللهَ واعلموا أنَّ الله بما تعملونَ بصير﴾[6].. ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژەیە بۆ ژمارەیەك حوكمی شەرعی، هەندێکیان راشكاوانە دەربڕاون، هەندێكیشیان بە ئاماژە دەخوێنرێنەوە. وەك لە خوارەوە وردی دەكەینەوە:

---

[1] واتە: باوك. هاء–ەكە بۆ (ال)ی موصولە دەگەڕێتەوە، بەمانای: ئەو كەسەی (الذي)، واتە: لەسەر ئەو كەسەی دایك منداڵەكەی بۆ دەبێ (كە باوكە) پێویستە..

[2] واتەئەو كرێیەی لەبەرانبەر شیردان وەریدەگرێ و خواردن و خواردنەوە و پۆشاكی پێدەكرێ.

[3] لای هەندێ كەس (تاء)ەكە مەرفوعە لەسەر ئەو بنچینەیی رستەیەكی خەبەرییە بەمانای نەهیكردن. شیمانەیش هەیە فاعل و مفعول بە دروست بكات و بنچینەكە تضارر (كەسری رای یەكەم) یان تضارر (فەتحی را– كە) بێ. بەپێی یەكەمیان ئافرەت بكەری زیانگەیاندن (ضرر)ەكەیە و لەرێی زیانگەیاندن بە منداڵەكەوە زیان بە باوكەكە دەگەیەنێ. بەپێی دووەمیان مێردەكە لەرێی منداڵەكەوە زیان بە ژنەكە دەگەیەنێ.

[4] واتە: لە شیربڕینەوە بەر لە دوو ساڵ. پێی وتراوە (فصام) لەبەرئەوەی منداڵ لە خواردنی شیری دایكی دەبڕێتەوە بۆ خواردنیتر.

[5] قسەكە روو لە باوكانە.

[6] البقرة: ٢٣٣.

أ- ئەو حوکمانەی ڕاشکاونە دەربڕاون:

١- پێویستە -یان واباشە- دایکان شیر بە منداڵەکانیان بدەن، ئەو کارە لە حاڵەتی بەردەوامیی هاوسەرایەتیدا واجبە مەگەر عوزرێك هەبێ، لە حاڵەتی جیابوونەوەیشیاندا واپەسەندە، بە ئاماژەی ئەو فەرمایشتەی خوا کە دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾[1]. لەبەرئەوەی وەرگرتنی کرێ لەسەر واجب دروست نیە. ئەم حوکمەیش ڕاشکاوانە لەم ئایەتەدا دەربڕاوە کە دەفەرموێ ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَادَهُنَّ﴾[2]، لەبەرئەوەی لە ڕووی ماناوە ڕستەی داخوازییە[3] ئەگەرچی لە ڕووی لەفزەوە خەبەرییە.

٢- واباشە ماوەی شیردان دوو ساڵی تەواوبێ نەك نزیکەی دوو ساڵ، ئەم دیاریکردنەیش شتێکی حەتمی و مولزیم نیە، لەبەرئەوەی ئایەتەکە ڕاشکاوانە دەڵێ ﴿حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ﴾[4]. تەواوکردنی دوو ساڵەکەی بەستووە بە ویستی دایك و باوکەوە، ئەویش بە قەرینەی ئەوەی دەفەرموێ﴿فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا﴾[5]،واتە ئەگەر باوك و دایك ویستیان بەر لە تەواوبوونی دوو ساڵەکە منداڵەکە لە شیر ببڕنەوە، دەتوانن بەو مەرجەی زیانی نەبێ. کەواتە حوکمی ماوەکە پەسەندبوونە نەك واجب.

---

[1] الطلاق: ٦.

[2] البقرة: ٢٣٣.

[3] ڕۆژنامەی (الجمهورية)ی عێراق لە ژمارە ٨٤٣٧ لە ١٩٩٥/٢/٢٩ بابەتێکی لەژێر ناونیشانی (مختصون يأكدون اهمية الرضاعة الطبيعية) بڵاو کردەوە تێیدا هاتووە: "توێژینەوە و ڕاپۆرتەکانی ڕێکخراوی یونیسێف سەلماندویانە شیردانی سروشتی منداڵ لە زۆر نەخۆشی دەپارێزێ".

[4] البقرة: ٢٣٣.

[5] البقرة: ٢٣٣.

٣- پێویستە لەسەر باوکی منداڵ خەرجی، واتە نەفەقە و پۆشاکی شیردەرەکە بدا چ بە شمەك (عین) بێ یان بە نەخت لەبەرانبەر شیرپێدان و دایەنیکردنی. ئەم حوکمەیش بەڕاشکاوی لە ئایەتی ﴿وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ﴾[1] دەربڕاوە. لەبەرئەوەی (علی) بۆ ئیلزامە. مەبەست لە (الوالدات) ئەو ژنە تەڵاقدراوانەن منداڵیان لە مێردەکانیان هەیە، بەم بەڵگانەی خوارەوە:

أ- ئەم ئایەتە دوای ئەحکامی تەڵاق هاتووە و تەواوکەری ئەو حوکمانەیە. یەکێك لە ئاسەوارەکانی تەڵاق واجببوونی نەفەقەی تەڵاقدراوە لەبەرانبەر شیردانی بە منداڵەکەی. بەڵام لە حاڵەتی بەردەوامیی هاوسەریدا شیردان واجبە لەسەری لەبەرئەوەی ژن و دایکە، نەفەقەیش لەسەر باوکی منداڵەکە واجبە لەبەرئەوەی مێردە، کەواتە نەفەقە بۆ ژنە نەك بۆ شیرپێدان.

ب- شتێکی سروشتییە پاش جیابوونەوە رق و دژایەتیکردن بکەوێتە نێوان ژن و مێردەکە، لەوانەیە ئەوەیش وا لە ژنەکە بکا ئەزیەتی منداڵەکە بدات لەو رووەوە ئەو کارە ئەزیەتدانی ناڕاستەوخۆی مێردەکەیەتی. یان لەوانەیە حەز بکا شوو بکاتەوە و منداڵەکەی پشتگوێ بخا.

لەبەر ئەم هۆیانە و هیتریش خوای گەورە فەرمانی بەو دایکانەی تەڵاقی بائن دراون کردوە لەبەرانبەر وەرگرتنی کرێیەکی عەینی یان نەقدی بۆ بژێویی ژیانیان، بەباشی شیری منداڵەکانیان بدەن. بەڵام ئەوانەی بەشێوەیەکی رەجعی تەڵاق دراون هەروەك ژنی راستەقینە پێویستە لەسەریان شیر بە منداڵەکانیان بدەن.

٤- واجبی نەفەقە و پۆشاك بەگوێرەی باری دارایی و بوون و نەبوونی مێردەکە دەبێ، لەبەرئەوە شتێکی باش و دادپەروەرانە نیە کەسێکی نەدار و دەستکورت

---

[1] البقرة: ٢٣٣.

زیاتر له توانای خۆی بخرێته سەر شان. ئەمەیش بەڕاشکاوی له ئایەتی ﴿لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا﴾[1]دا دەربڕاوە.

٥- حەرامە هەریەك له باوك و دایك بەهۆی منداڵە شیرەخۆرەکەیان و لە جێبەجێکردنی ئەحکامی شیرداندا زیان بە یەکتر بگەیەنن. نابێ دایك بەمەبەستی زەبردان له باوکی منداڵەکە شیرپێدانی رەت نەکاتەوە، دروستیش نیه پتر له کرێی هاوشانی خۆی داوا بکا. بۆ باوکیش رەوا نیه رێگە لە دایکەکە بگرێ شیر بە منداڵەکەی بدات ئەگەر حەزی لێ بوو، نابێ لەو ئەرکەی لەسەریەتی چروکی بکا، بەڵکو پێویستە هەموو ئەوانە بە چاکە بەڕێوە بچن. هەروەك بۆی نیه بەبێ هۆیەکی شەرعی منداڵەکەی لێ زەوت بکا. ئەمە لە ئایەتی﴿لَا تُضَارَّ وَالِدَةٌ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوْلُودٌ لَهُ بِوَلَدِهِ﴾[2] بە راشکاوی دەربڕاوە.

٦- ئەگەر باوکەکە مرد یان نەیتوانی خەرجی ژنە تەڵاقدراوە شیردەرەکە بکێشێ، ئەرکەکە دەچێتە سەر شانی وەرەسەی منداڵە شیرەخۆرەکە. ئەمەیش لە ئایەتی ﴿وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ[3]﴾[4] بە راشکاوی دەربڕاوە.

٧- دروستە دایك و باوك بە رەزامەندیی هەردوولا رێك بکەون بەر لە تەواوبوونی دوو ساڵەکە منداڵەکە لە شیر ببڕنەوە بەو مەرجەی زیانی بۆ منداڵەکە نەبێ، لەبەرئەوەی دانانی تەاوکردنی ئەو ماوەیە زیاتر لەبەر پەسەندییە نەك حەتم و

---

[1] البقرة: ٢٣٣.

[2] البقرة: ٢٣٣.

[3] البقرة: ٢٣٣.

[4] هەندێ زانا -وەك رازی له التفسیر الکبیر: ١٣١/٦: دەڵێن: مەبەست میراتگری باوکە، بۆیە پاش مردنی باوکی چی لەسەر باوکەکە واجب بوو لەسەر ئەویش واجب دەبێ. بەڵام ئەمە لەگەڵ رواڵەتی ئایەتەکە ناکۆکە کە ئاماژە بەوە دەدا ئەمە لە بابی ئەرکەوەیە، چونکە نەفەقەی منداڵ لەسەر میراتگر دەبێ، ئەو کەسەی ئەگەر ئەو منداڵە مرد و ماڵی هەبوو دەبێتە میراتگری.

ئیلزام. ئەمەیش لە ئایەتی﴿فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا﴾[1] بەراشکاوی دەربڕاوە.

٨- دروستە باوکان بەدوای شیردەر بۆ منداڵەکانیان بگەڕێن جگە لە دایکیان، بەو مەرجەی ئەو مافەی لەسەری رێك دەکەون یان بەپێی عورف دیاری کراوە، بەبێ دەستی دەستی پێکردن یان نوقسانی بیاندەنێ، لەبەرئەوەی دابیننەکردنی کرێکەیان وایان لێدەکا کەمتەرخەمی لەگەڵ منداڵەکەدا بکەن. بەڵام رێگەدان بە شیردانی جگە لە دایك، مەرجدارە بەوەی زیان بە دایکەکە نەگەیەنرێ، وەك خوا دەفەرموێ ﴿لَا تُضَارَّ وَالِدَةٌ بِوَلَدِهَا﴾[2]. حوکمی شیردانی جگە لە دایکان بەراشکاوی لە ئایەتی ﴿وَإِنْ أَرَدْتُمْ أَنْ تَسْتَرْضِعُوا أَوْلَادَكُمْ﴾[3] دا دەربڕاوە.

**ب- ئەو حوکمانەی بە ئاماژە دەربڕاون:**

**١- نەسەبی منداڵ بۆ باوکیانە نەك دایکیان:**

رووی دەلالەتکردنی: لام لە (لە) لە خاوەندارێتیدا راستەقینەیە، لەبەرئەوەی ناکرێ بە مانا راستەقینەکەی وەربگیرێ، بە نزیکترین مانا لە خاوەندارێتی وەردەگیرێ کە دەکاتە نەسەب[4]، پاشان پیتی (ال) لە (المولود لە) بەمانای

---

[1] البقرة: ٢٣٣.

[2] البقرة: ٢٣٣.

[3] بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی ئەم حوکمانە، دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ ئەم تەفسیرە باوەڕپێکراوانە:التفسير الكبير،للرازي :١٢٤/٦ ومابعدها، تفسير النسفي :١١٧/٢ وما بعدها ، تفسير القرطبي :١٦٠/٣ وما بعدها ، أحكام القرآن ،للجصاص:١٠٤/٢، أحكام القرآن ، لأبن العربي :٢٠٢/١ ومابعدها.

[4] في فواتح الرحموت، شرح مسلم الثبوت: ٤٠٧/١: ئایەتەکە بۆ واجبکردنی نەفەقەیە لەسەر پیاو، بەڵام خوای گەورە بە (المولود له) گوزارشتی لێکردوە و ئەوەی لەدایك بووە بۆیان بە پیتی لام دراوەتە پاڵیان. بەوە نەسەبی منداڵ دەداتە پاڵ باب، بەخاوەنکردن بەهیچ شێوەیەك نەهاتووە، بۆیە ئەو بەتەنهایە و هیچیان لەسەر دایك پێویست نین).

(الذي)[1] دیَ كە ماناكەی دەبێتە (وعلى الذي يولد له). (واتە ئەوەی منداڵەكـەی بۆ دەهێنرێتە دنیا). ئەمەیش ئاماژەیە بەوەی منداڵیان بۆ ئەوان بـووە، ئەمەیـە نهێنی هەڵبژاردنی (المولد له)ـە لەباتیی باوك.

٢- **نەفەقەكێشانی كوڕ و كچە ناكامـەكان تـەنها لەسـەر باوكـە تـا لەژیانـدا بـێ.**

نەفەقەكێشـانی دایـەنی شـیردەریش لـە مـاوەی شـیرداندا نەفەقەكێشـانی ناڕاسـتەوخۆی منداڵـە شـیرەخۆرەكەی خۆیـەتی، ئـەوەیش دیسـان واجبـە لەسەری.

ڕووی دیلالەتكردنی ئەوەیە: تەنها باوك تایبەتمەندیی نەسەبی هەیـە. لەبەرانبـەر ئەم دەستكەوتەدا، بەپێی ڕێسای (الغرم بالغنم)[2] باری نەفەقەكێشانی لەسەرە.
واتە ئەوەی سوودی شتێك بەدەست دێنێ دەبێ بەرگەی زیانەكەیشی بگرێ.

٣- **شـیری دایـك لـە هـیتر بەباشـتر دەزانـرێ** لەبـەر ئـەو كاریگەرییـەی لەسـەر تەندروستی و ڕەفتاری منداڵ هەیەتی.

ڕووی دیلالەتكردنی ئەوەیە: سەرەتا فەرمان بە دایكان بكرێ شیر بدەن، پاشان ئەگـەر لەبەرچـاوگرتنی بەرژەوەنـدیی منداڵەكـە وای خواسـت، چاوپۆشـی لـەو ئەسـڵە دەكـرێ و دەكـرێ پـەنا بـۆ شـیردەرانیتر جگـە لـە دایكـی بـبرێ. خـوا دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ أَرَدْتُمْ أَنْ تَسْتَرْضِعُوا أَوْلَادَكُمْ﴾[3].

---

[1] لەبەرئەوەی ئەگەر (ال) چووە سەر فاعل یان اسمی مفعول دەبێتە مەوصولە بەواتای (الذي و التي)، لەوەیشدا نێر و مێ و تاك و كۆ یەكسانن. ئیبن مالك لە ئەلفیەكەیدا دەڵێ:
(ومن وما وأل تساوي ما ذُكر وهكذا ذو عند طيِّيء شهر).

[2] مجلة الاحكام العدلية، م١٨٧. أو (الغنم بالغرم) أو النعمة بالنقمة أو النقمة بالنعمة.

[3] البقرة: ٢٣٣.

**٤- تەنها باب بۆی هەیە بەبێ مۆڵەتی خۆیان دەست بخاتە ماڵی منداڵەکانی[(١)]**، ئەمەیش وەك هەڵاوێرانێك لە بنەمای حەرامکردنی خواردنی ماڵی کەسانیتر بەبێ ڕەزامەندی و حەزی دڵی خۆیان وەك خوا دەفەرموێ﴿أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلَّا أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ﴾[(٢)]، وقال الرسول ﷺ: (لا يحل مال امرئٍ الاّ بگيبه نفس)[(٣)].

**٥- ئەگەر باب بەئەنقەست و بەدەستدرێژی منداڵەکەی خۆی کوشت، تۆڵەی شەرعی لەسەر واجب نیە**، بەڵکو سزایەکی تەمێکارانە (تعزیری) دەدرێ وەك بەندکردن، دایکیش بەهەمان شێوە.

ڕووی دیلالەتکردن: لەبەرئەوەی باوك هۆی بوونی منداڵەکەیەتی، بۆیە نابێ ئەو -یان کوشتنی- ببێتە هۆی کوشتنی. لەم ڕوانگەوە زانایانی ئوسوڵ گوتویانە "باوکایەتی ڕێگرە لە قیساس"[(٤)]. بەهەمان شێوە ئەگەر بوهتانی بۆ منداڵەکەی کرد، سزای قەزفی بەسەردا جێبەجێ ناکرێ کە لە دەقدا بڕیار دراوە، بەڵکو

---

[(١)] لە المغني، ابن قدامة ٥/٦٧٨دا هاتووە: "باوك بۆی هەیە چی دەوێ لە ماڵی منداڵەکەی بیبات و بیکاتە هی خۆی، جا باوکەکە پێویستی بە بردنی ئەو شتە هەبێ یان پێویستی نەبێ، منداڵەکە بچوکبێ یان گەورەبێ، بە دوو مەرج: یەکەمیان: ستەم لە کوڕەکە نەکات و زیانی پێ نەگەیەنێت و شتێك نەبات خۆی پێویستی پێی بێ. دووەم: ماڵی منداڵەکەی نەبات و بیداتە کەسێکیتر".

[(٢)] النساء: ٢٩.

[(٣)] رواە مسلم.

[(٤)] عمر الخباز لە (اصولەکەیدا - دەستنووسە لە کتێبخانەی ئەوقاف لە بەغدا- دەڵێ: (وعلى المولود لە رزقهن وكسوتهن، بریتییە لە واجبکردنی نەفەقە لەسەر باوك وەك ئاماژە بۆ ئەوەی نەسەبی منداڵەکە دەدرێتە لای ئەو، مافی بەسەر ماڵ و نەفسیدا هەیە و بەهۆیەوە سزا نادرێ، هەروەها لەڕێی (لامی تەمەلوك)ەوە دەریدەخا باوك بەتەنیا نەفەقەی دەکێشێ، کوڕی دارایش نەفەقەی باوکی).

تەمێ دەکرێ.

٦- **واجبیی نەفەقەی خزمان تەنها خزمایەتیی فەرزەندی** (البنوة)[1] یان میراتگری خاوەن رەحم ناگرێتەوە وەك هەندێ گوتویانە[2]، بەڵکو هەموو خزمێکی میراتگر دەگرێتەوە.

رووی دیلالەتکردن: وشەی (الوارث) لە ئایەتی ﴿وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ﴾[3] کە (ال)ی تەعریفی ئیستیغراقی لەپێشە، گشتیبوون دەگەیەنێت و هیچ بەڵگەیەك نیە تایبەت کرابێ. پاشان حوکمی واجببونی نەفەقە بەستراوە بە وەسفی (الوارث)ەوە، بەسترانی حوکمیش بە داتاشراوەوە بەڵگەی بوونی عیللیەت - هۆبەندی-یەك دەکا کە هۆی داتاشینە، کەواتە هۆکە میراتگرە و لە بوون و نەبوونیدا لەگەڵی دەسوڕێ.

٧- **دایك بۆ دایەنیکردنی منداڵەکەی لەپێشترە:**

رووی دیلالەتکردن: خوا فەرمانی پێکردوە بە شیردان و ئەوەیش بەشێکە لە دایەنی[4]. دایەنیش وەك شیردان سیفەتێکی دووسەرەی هەیە، هەردووکیان و پابەندین. لەو رووەوە کە پابەندییە، مافی نیە بەبێ عوزرێکی رەوا دەست لە

---

[1] وەك شافیعی، کە دەڵێ: (نەفەقە لەسەر دایك و باوك و لەدایکبووان نەبێ پێویست نیە).، کشف الاسرار: ٥٣٢/٢.

[2] وەك حەنەفیەت، سەرچاوەی پێشوو، ئیبن ئەبی لەیلا دەڵێ: نەفەقە لەسەر هەموو واریسێك واجبە، ئەویش لەبەر زاهیری ئایەتی:(وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ).

[3] البقرة: ٢٣٣.

[4] ئیبن ئەلعەرەبی لە (احکام القران: ٢٠٤/١دا دەڵێ: زانایانمان گوتویانە: ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەیە دایەنی بۆ دایك و سەرخستن بۆ باوکە، لەبەرئەوەی دایەنی لەگەڵ شیردانداپە. ئەوەی لە(م١/٥٧)ی یاسای باری کەسایەتی عێراقی کارپێکراودا هاتووە کە دەڵێ (دایك لەکاتی بەردەوامیی هاوسەریدا بۆ دایەنی و پەروەردەکردنی منداڵ لەپێشترە، هەروەها پاش جیابوونەوەیش، بەو مەرجەی زیان بە منداڵەکە نەگا)، لەسەر ئەمە بینا کراوە.

هیچکامیان هەڵبگریّ ئەگەر ئەو دەستهەڵگرتنە زیان بەبەرژەوەندیی منداڵەکە بگەیەنیّ. هەروەها ئەگەر کەسێك نەبوو نەفەقەی بکێشیّ بۆی نیە شیری نەداتیّ، وەك چۆن پابەندبوونی بە عیددە بەوە هەڵناوەشێتەوە کە کەسێك نەبیّ لە ماوەی عیددەدا نەفەقەی بکێشیّ.

حیکمەتی لەپێشتربوونی دایك بۆ دایەنیکردن، ئەو سۆز و ناز و ئارامییە دەروونییەیە کە هەیەتی و کاریگەری لەسەر رەفتاری منداڵ دەبیّ ئەگەر هاتوو خۆی راستەوخۆ سەرپەرشتی دەکرد.

**٨- ژنی دەوڵەمەند پێویستە نەفەقەی مێردی هەژاری بکێشیّ:**

رووی دیلالەتکردن: ژن میراتگری پیاوە[١]. خوا گەورەیش خەرجیکێشان و میراتی بەیەکەوە بەستووە ﴿وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ﴾[٢]. ئەمە بەڵگەی ئەوەیە بەرپرسیارێتیی مرۆڤ لە خەرجیکێشانی کەسانیتر لەسەر ئەو بنچینەیە کە میراتگریەتی. لەو رووەوە ژن میراتگری مێردەکەیەتی ئەگەر پێش لەو مرد، بۆیە ئەگەر مێردەکەی هەژار و دەستکورت بوو و ئەو دەوڵەمەند بوو، پێویستە خەرجی مێردەکەی بکێشیّ. لەم روانگەوە رێژەی بەرپرسیارێتی لە خەرجیکێشاندا بەگوێرەی رێژەی بەشە میراتیەتی لە میراتی ئەو کەسەدا ئەگەر فرەمیراتگر بوو. ئەو هەژارەی خوشکێك و برایەکی هەقی یان باوکیی هەیە، ئەرکی نەفەقەکێشانی لەسەریان بە سیّ-یەکانە دەبیّ، لەبەرئەوەی بەشیان لە

---

[١]ئیبن حەزم لە (المحلی: ١٠/٩٢)دا دەڵیّ: "ئەگەر مێرد نەیتوانی خۆی بژێنێت و ژنەکەی دەوڵەمەند بوو، نەفەقەی دەخرێتە سەر ئەو و ئەگەر باری گوزەرانیشی باش بوو هیچ لەو خەرجەی بۆ ناگێڕدرێتەوە. بەڵگەی ئەمەیش بریتییە لە ئایەتی (وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ). عەلی دەڵیّ: ژن میراتگرە، بۆیە بەدەقی قورئان پێویستە نەفەقەی بکێشیّ".

[٢]البقرة: ٢٣٣.

میراتەکەیدا بەپێی ڕێسای نێرینەیەك بەشی دوو مێینەی هەیە دەبێ. ﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حظِّ الأُنثَيَيْنِ﴾[1].

لە مافە نادارایییەکانیتری منداڵان لەسەر باوانیان مافی پەروەردە و هۆشیارکردنەوە و فێرکردن و ڕاهێنانیانە لەسەر ئاکار و ڕەفتاری ڕێکوپێك و جوان و دوورخستنەوەیان لە بەدڕەفتاری و ئاکاری خوار و خێچ، بەتایبەت کاتێ نەوجەوان و هەوێرن و ئامادەن بۆ قاڵبگرتن لەتەك هەموو شێوەکانی ئەندازەی ڕەفتارکردندا، چ چاك چ خراپ.

بەڵگەنەویستە کە لادانی نەوجەوانان دیاریدەیەکی کۆمەڵایەتیی نەتابایە لەگەڵ بنچینەی سروشتی ئەو ڕەفتارەی پێویستە هەر مرۆڤێك لەسەری بێ. ئەم دیاردەیەیش بۆ فەرامۆشکردنی منداڵان لەلایەن باوانیان، یان بوونی کێشەیەکلەناو یان دەرەوەی خێزان دەگەڕێتەوە.

**لە گرنگترین هۆکارەکانی کێشەکانی خێزان:**

أ- لەدەستدانی باوك یان دایكی منداڵ بەهۆی مردن یان تەڵاقەوە. تەڵاق ئاسەواری خراپی لەسەر ڕەفتاری منداڵانی ژنی تەلاقدراو هەیە. لەبەرئەوەیە پێغەمبەر بە درێوترین حەڵاڵ لای خوا ناوی بردوە و فەرمویەتی: (ابغض الحلال

---

[1] لە کتێبی: کشف الاسرار: ٢/٥٣٢دا هاتووە: (ئاماژەی تێدایە بەوەی نەفەقەکێشان بەئەندازەی میرات واجب دەبێ، لەبەرئەوەی هۆی واجببوونی میراتە، بۆیە پێویستە حوکمەکە لەسەر ماناکەی بینا بکرێ کە میراتە، حوکمیش بەپێی هۆکە جێگیر دەبێ، لەبەرئەوەی بار لەبەرانبەر دەسکەوتە (کورد وتەنی: ڕەنج بەرانبەر گەنج-وەرگێڕ). ئایەتی (لَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِنْ طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ )البقرة/٢٣٦، بەئاماژە بەڵگەیە لەسەر دروستیی هاوسەرگیری بەبێ مارەیی. هەروەها ئایەتی :(أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَائِكُمْ)البقره/١٨٧، بەڵگەیە لەسەر دروستیی ڕۆژوو بەبێ خۆشتن پاش جووتبوون لەبەرئەوەی دەشێ لە دووا ساتی شەودا بکرێ و کات بۆ خۆشتن نەمابێ".

الى الله الطلاق)[1].

تـەڵاق زۆر هـۆی هەیـە کـە پێویسـتە دوور بخرێنـەوە، لەوانـە هۆکـاری ئـابووری، دەسـتێوەردانی خزمـان، جیـاوازیی تەمـەن، جیـاوازی لـە ئـاین و بـەها و رەوشـتی بەدەسـتهاتوو لـە ئاینـەوە. پێغەمبـەر ﷺ فەرمویـەتی: (تخـيروا لـنطفكم فـأن العـرق دسـاس)[2]. لـەم قسـەیە و هـیترەوە دەردەکـەوێ پێغەمبـەر سـەدان سـاڵ بـەر لـە دۆزینەوە زانستیە نوێکان کاریگەریی بۆماوە لەسەر رەفتاری مرۆڤ زانیوە.

ب- لەوانە ناتەبایی دایـك و بـاوك لـەناو مـاڵ و نـەبوونی پابەنـدیی دووسـەرە، جـوێن بەیەکدان و بەکارهێنانی وشەی سوك و نەشیاو بەیەکتر لەبەردەم منداڵەکاندا.

ج- لەوانـە رەفتـاری خراپـی یـەکێك لـە بـاوك و دایـك، منـداڵان لـە رەفتاریانـدا بەشێوەیەکی ناویستانە لاسایی باوك و دایکیان دەکەنەوە، وەك چۆن بەبێ فێرکردن، لە فێربوونی زماندا لاساییان دەکەنەوە، لەبەرئەوە شاعیر دەڵێ:

أذا كان رب البيت بالدف ناقراً        فشيمة اهل البيت كلهم الرقص

بۆیە پێویستە باوکان و دایکان سەرمەشقێکی باش بن بۆ منداڵەکانیان و لەوانـە نـەبن خوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرموێ: ﴿أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنْسَوْنَ أَنْفُسَكُمْ﴾[3].

د- یەکێك لەو هۆکارانەی کاریگەریی خراپی لەسەر رەفتاری منداڵ هەیـە، نازپێـدانی لە سنووربەدەر و رەقبوونی لەسنووربەدەرە لە مامەڵەکردن لەگەڵیدا. پێویستە بـاوك کە لە پەروەردەکردنی منداڵەکانی بەرپرسە، دانا بـێ و لـەناو ماڵـدا ژیرانـە مامەڵـەیان

---

[1] رواه ابو دلوود في سننه: ٢/٢٥٥، برقم (٢١٧٨)، وابن ماجة في سننه: ١/٦٥٠، برقم(٢٠١٨).

[2] دەیلەمی لە کتێبی (الفردوس بمأثور الخطاب) ئەم حەدیسەی هێناوە، بەڵام نەك هەمووی، لە خاتوو عائیشەوە – خوا لێی رازی بێ- (٢/٥١ ، بە ژمارە ٢٢٩٥) لە زاری پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە:(تخيروا لنطفكم:) لە ئەنەسیشەوە – خوا لێی رازی بێ- (٢/٥١، بە ژمارە ٢٢٩١) حەدیسی: (.... فان العرق دساس) دەگێڕێتەوە.

[3] البقرة: ٤٤.

لەتەکدا بکات و لە ڕێنمایی و پەروەردەکردنیاندا ڕێڕەوێکی مامناوەند لەنێوان نازپێدان و ڕەقیدا، بگرێ.

لە کێشە ناخێزانیەکانیش کێشەی قوتابخانەیە. مامۆستا تەنها لە فێرکردن بەرپرس نیە، بەڵکو لە مامەڵەکردنی لەگەڵ کەسانیتر لە ناوەوە و دەرەوەی قوتابخانە، لە پەروەردە و هۆشیارکردنەوە و ڕێنوێنیکردنیش بەرەو ڕۆیشتن لەسەر ڕێچکەیەکی ڕاست و دروست بەرپرسە، چونکە فێرکەر سەرمەشقی فێرخوازە، بۆیە پێویستە نموونەیەکی جوان بێ بۆ بەها باکان و ئەخلاقە جوانەکان تا فێرخواز چاوی لێ بکا. پێویستە فێرکردن و ئاراستەکردنی ڕاست و دروست ئاوێتە بکا.

لە گرنگترین ئەو هۆکارانەی کار لە ڕەفتاری نەوجەوان دەکا ئەو کەسانەن لە دەرەوەی ماڵ و دەرەوەی قوتابخانە تێکەڵیان دەبێ، لە منداڵانی گەڕەکەکەی. بۆیە دەبێ باوکان بەوردی و قووڵی و بەبەردەوامی چاودێریی ئەم تێکەڵبوونە بکەن بەر لەوەی ڕۆڵەکانیان تووشی نەخۆشییە ئەخلاقییە درمەکان ببن، ئەویش لەڕێی ئەو کەسانەوە بەهۆی پەروەردەبوونیان لە ناوەندێکی خراپدا بەو نەخۆشیانەوە گرفتار بوون.

لەو هۆیانەیتر کە کاریگەرییان لەسەر ڕەفتاری نەوجەوانان هەیە، هۆیەکانی ڕاگەیاندنی خوێنراو و بیستراو و بەتایبەت بینراوە. باوك و دایکان لە کاریگەریی ئەو هۆیانە لەسەر ڕۆڵەکانیان بەرپرسن. بۆیە بەر لەوەی کار لە کار بترازێ پێویستە ڕێگە نەدەن فیلمی بێئابڕوویی و ترس و تۆقاندن ببینن.

سەرچاوەی پابەندیی دایکان و باوکان بەرانبەر ڕۆڵەکانیان لەمەی باس کرا، قورئان و سوننەتی پێغەمبەرە. لەو ئایەتانەی قورئان لەم بارەوە قسە لەگەڵ باوکان دەکا: ﴿قُوا أَنْفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا﴾[1].

---

[1] التحريم: ٦.

لەئـەنجامی پەرەسـەندنەکانی ژیـان کۆمەڵگـە و میللـەتان گـۆڕاون بـۆ دەوڵـەت و سیستمی سیاسی، کە ماف و ئەرکیان لەنێواندایە و میساقی نەتـەوە یـەکگرتووەکان حوکمی دەکات و یاسای نێودەوڵەتیی گشتی و عورفە نێودەوڵەتیەکان رێکـی دەخـا. ئەم ماف و ئەرکانە بەرژەوەندیی هاوبەش و مامەڵەی هاوشێوە و عورفی نێودەوڵەتی و رێکەوتنامـەکانیان لـە یاسـای نێودەوڵـەتیی گشـتیدا دامەزرانـدوە. ئـەم بنچـینانە جیـاوازن لـە بنچـینەی پەیوەندییـە نێودەوڵەتیـەکان و پەیوەنـدیی نێـوان گـەل و نەتەوەکان لە ئیسـلامدا. ئـەو دەسـتوورە ئیلاهییـە سـەدان سـاڵ پـێش دەسـتوورە وەزعیەکان و جارنامەکانی مافی مرۆڤ کەوتووە لە پەسـەندکردنی بنـەمای یەکسـانیی ئادەمیزادەکـان لـە هـەموو زەمـان و زەمینێکـدا. دەسـتووری خـوا ئـەم یەکسـانییە مرۆییـــەی لەســـەر زۆر بنچـینە بنیـات نـاوە. بنچـینەکانی مـــاف و پابەندییـــە نێودەوڵەتیەکان لە ئیسلامدا بریتین لەمانە:

**بنچینەی یەکەم: هاوڕەچەڵەکی (وحدە النسب):**

هەموو تاکەکانی خێزانی مرۆڤایەتی لە رابردوو و ئێستا و ئایندەدا خوشـك و بـران لەبەرئـەوەی رۆڵـەی یـەك بـاب (ئـادەم) و یـەك دایـك (حـەوا)ن. رەوشـتی برایـەتیش بریتییـە لـە مامەڵـەکردنی یەکسـانە لەگـەڵ ئـەویتر بـەبێ جیاکـاری، خـوای گـەورە دەفەرموێ ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾[1] .. "اتقاکم" واتە ئەوەتان نزیکترینتان

---

[1] سورة الحجرات الآية (١٣)

له خواوه بۆ ژیانی ئاخیرەت و بەکەڵکترینتان بۆ مرۆڤایەتی بۆ ژیانی دنیایی وەك پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (أفضل الناس أنفعهم للناس).

**بنچینەی دووەم: هاوکانزایی:**

هەموو مرۆڤێك لە کانزایەك دروست کراوە و دەکرێ کە خاکە، لەبەرئەوەی هەموو مرۆڤێك لە سپێرمی نێرینە و هێلکەی مێینە خەلق دەبێ، کە کرۆك و پوختەی خوێنن. خوێنیش کرۆك و پوختەی ئەو مادە خۆراکیانەیە مرۆڤ بۆ بەردەوامیی ژیانی دەیانخوات. مادە خۆراکیەکانیش کرۆك و پوختەی خاکن. لەم روانگەیەوە هەموو مرۆڤێك بە ناراستەخۆ لە خاك خەلق کراوە و دەکرێ. کانزای هەندێ کەس بۆ نموونە ئاڵتون نیە و هی هەندێکیتر مس بێ تا پۆلی یەکەم فەزڵیان بەسەر دووەمەوە هەبێ. خوا دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ إِذَا أَنْتُمْ بَشَرٌ تَنْتَشِرُونَ﴾ الروم/٢٠.

پێغەمبەرﷺ لە حەجیماڵئاواییدا جەختی لەم دوو بنچینەیە کرد و فەرموی: (كلكم من ئادم وئادم من تراب لا فضل لعربي على أعجمي ولا لأبيض على أسود الا بالتقوى).

**بنچینەی سێیەم: هاوبەدیهێنەری:**

بەدیهێنەری سەرجەم مرۆڤایەتی خوایە. مرۆڤ وەك کاڵا نیە کە بەپێی جۆری ئەو کۆمپانیایانەی بەرهەمیان هێناوە لە چاکی و خراپیدا جیاواز بێ. هەموو مرۆڤێك لە رابردوو و ئێستا و ئایندەدا تەنها دروستکراوی خوایە. خوا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾[1].

---

[1] سورة البقرة الآية (٢١)

**بنچینەی چوارەم: هاوڕێزی:**

خوا ڕێزی لە مرۆڤ ناوە بەوەی بە باشترین شێوە خەلقی کردوە و بەبێ جیاوازی نیعمەتی بەسەردا ڕشتوە. ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا﴾ الاسراو/٧٠.

**بنچینەی پێنجەم: هاوئاینی:**

دەستووری خوا جیاوازی لەنێوان شەریعەت و ئایندا کردوە. یەکەمیان (واتە شەریعەت) بەپێی جیاوازیی گەل و نەتەوەکان جیاوازە لەبەرئەوەی ژیانی دنیا ڕێك دەخات و مرۆڤ بواری ئەوەی هەیە بەپێی پەرەسەندنی پێداویستیەکانی ژیانی ئیجتیهادی تێدا بکا.

بەڵام دووەمیان (واتە ئاین) بەپێی جیاوازیی نەتەوەکان ناگۆڕێ، لەبەرئەوەی ئاین یەکێکە، چونکە باوەڕێکی سوور و نەگۆڕ و دەقاودەقی واقیعە بە خوا و بەو غەیبیاتانەی لێی دەبنەوە و بواری جیاوازی و ئیجتیهادی تێدا نیە. خوا دەفەرموێ: ﴿شَرَعَ لَكُمْ مِنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ كَبُرَ عَلَى الْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ اللَّهُ يَجْتَبِي إِلَيْهِ مَنْ يَشَاءُ وَيَهْدِي إِلَيْهِ مَنْ يُنِيبُ﴾[١].

**بنچینەی شەشەم: یەکێتیی بەرژەوەندی و خاوەنداریتیی خێروبێرەکانی زەوی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَوَاتٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾[٢]. هیچ سنوورێك لەنێوان هەرێم و وڵاتەکاندا نیە، خاوەنداریتی تەنها هی خوایە و بەبێ جیاکاری بۆ مرۆڤی ڕەوا بینیوە.

---

[١] سورة الشورى الآية (١٣)

[٢] سورة البقرة الآية (٢٩)

پێویسته زیادەی خێروبێری زەوی لای هەر گەل یان نەتەوەیەك بدرێتە گەل یان نەتەوەیەكیتر كە پێویستی پێیەتی. ئەم خاوەندارێتییە هاوبەشە لەسەر بنچینەی بیرۆكەی شیوعیەت نیە، بەڵكو ئەو رێپێدانە بنچینەییەیە، كە پێش ئەوە كەس خاوەنی هیچ نەبووە.

**بنچینەی حەوتەم: هاوچارەنووسی:**

خەڵك هەموو لەم چارەنووسەدا یەكسانن ئەویش مردن و بەجێهێشتنی ژیانی دنیایە، جا ئەو مردنە چ لە كوخێكدا بێ یان لە كەلاوەیەكدا یان كۆشكێكی قایم و رازاوەدا. خوا دەفەرموێ: ﴿أَيْنَمَا تَكُونُوا يُدْرِكْكُمُ الْمَوْتُ وَلَوْ كُنْتُمْ فِي بُرُوجٍ مُشَيَّدَةٍ﴾[1].

**بنچینەی هەشتەم: هاوبەرپرسیارێتی:**

هەر كەسێك لە ئاكامی كارەكانی بەرپرسە، ئەگەر باش بن پاداشتەكەیان باش و ئەگەر خراپیش بن پاداشتیان خراپ دەبێ. ﴿فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ ، وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ﴾[2]

**بنچینەی نۆیەم: هاوپەرستراوی:**

ئەندامانی خێزانی مرۆڤایەتی ئەوانەیان باوەڕیان بە بوونی خوایەك هەیە، لەوەدا هاوبەشن كە هەموو ملكەچی ئەو تاكە خواوەندەن، كڕنووشی بۆ دەبەن و هەریەكەیان بەشێوەی تایبەتی خۆی و لەژێر تیشكی رێنماییەكانی ئاینەكەیدا دەیپەرستن. لە ئاینەكاندا دوو خواوەند نین كە بپەرسترێن. لە فەرمایشتی خوای

---

[1] سورة النساء الآية (٧٨).

[2] سورة الزلزلة الآية (٧-٨).

گەورە ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾دا کە نوێـژوان ڕۆژانـە چـەندین جـار لـە نوێژەکەیـدا دووبـارەی دەکاتەوە، بەرکار (اياك) خراوەتە پێش فەرمان و بکەرەکەی. ڕێسایەکی ڕەوانبێژیش هەیـە کـە ئـەو شـتەی خـۆی دەبـێ دوابخـرێ، ئەگـەر پـێش خـرا ئـەوە بەڵگەیـە لـە قەتیسکردن. واتـە بەندایـەتیکردنی مـرۆڤ تـەنها لـە یـەك پەرسـتراودا قـەتیس دەبـێ ئەویش خوای گەورەیە.

**بنچینەی دەیەم: هاومەرجەعی:**

مەرجەعی هەموو بونەوەرە زینـدووەکان بـە مـرۆڤ و هـیترەوە لـە جێبـەجێکردنی پێویسـتیەکانیاندا تـەنها خوایـە. خێزانـی مرۆڤایـەتی لـەم مەرجەعیەتـەدا هاوبەشـە، ئەویش لەبەر کۆکبوونی هەموو ئاینەکان و ژیریی ژیران لەسەر ئەوەی جگە لـەو هـیچ مەرجەعێکیتر نیە، وەك خوای گەورەیش دەفـەرموێ ﴿وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾. لەمەیشـدا هاوشێوەی "اياك نعبد" داوای کۆمەکیکردنەکە قەتیس کراوە لە خوادا.

**دەرەنجامی ئەم بنچینانەی باس کران:**

ئەو بنچینانەی مافی مرۆڤ و ئەرکەکانی لە ئیسلامدا کە لەسەرەوە باس کران، ئەم دەرەنجامانەیان لێ دەکەوێتەوە:

**یەکەم: لە ئیسلامدا ئەسڵ لە پەیوەندیەکانی نێوان گەل و نەتەوە و دەوڵەتاندا ئاشتییە و جەنگ ریزپەڕە:**

ئەمەیش لە زۆر ئایەتی قورئانی پیرۆزدا بەدەق باس کراوە، لەوانە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ادْخُلُوا فِي السِّلْمِ كَافَّةً وَلَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ﴾[1]، هەروەها دەفەرموێ:: ﴿وَإِنْ جَنَحُوا لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ﴾[2]. ئەمانـە و

---

[1] البقرة: ٢٠٨.

[2] الانفال: ٦١.

دەیان ئایەتیتر کە فەرمان بە شوێنکەوتنی رێگەی ئاشتی دەکەن و ئامـاژەن بـەوەی پەنابردن بۆ بەکارهێنانی هێز لە چارەسەری ناکۆکیەکاندا شـوێنکەوتنی شـەیتانە کـە دوژمنی مرۆڤە.

جگە لەمە، بەڵگەیەکیتر لەسەر ئەوەی ئەسڵ لـە ئیسـلامدا ئاشـتییە ئەوەیـە وشـەی ئاشـتی (السـلام) و داتاشـراوەکانی (١٣٣) جـار لـە قورئـانی پـیرۆزدا هـاتوون، وەك ئەوانەی سەرەوە و هەروەها ئەوەی دەفەرموێ ﴿وَاللَّهُ يَدْعُو إِلَى دَارِ السَّلَامِ﴾[1].

پاشان ئیسلام فەرمانی کردوە سڵاوی بەیانیان و ئێوارانی خەڵك لە یەکتر بریتی بێ لە (السلام علیکم) و (علیکم السلام) واتە پەیامی ئاشتی دەگۆڕنەوە. هەروەها پێویسـتە نوێژوان لە نوێژەکەیدا بڵێ: (السلام علیکم ورحمة الله وبرکاتـه.. السـلام علینـا وعلـى عباد الله الصالحین). ئیسلام خۆی لە وشەی ئاشتی (سلام) داتاشراوە.

**دووەم: جەنگە رەواکان:**

لە ئیسلامدا هیچ جەنگێك رەوا نیە لە دوو حاڵەتدا نەبێ:

– حاڵەتی یەکەم: حاڵەتی مافی بەرگریکردنی رەوا. ﴿فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾[2].

– حاڵەتی دووەم: بۆ لادان و نەهێشتنی فیتنە. ﴿وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلَّهِ﴾[3].

---

[1] یونس: ٢٥.

[2] البقرة: ١٩٤.

[3] البقرة: ١٩٣.

**بنەما و راسپاردەکانی جەنگە ڕەواکان:**

ئەگەر لە ئیسلامدا جەنگ شتێکی نائاساییە، بەڵام لەو حاڵەتە نائاساییەدا بەرەهایی بەجێ نەهێڵراوە، بەڵکو بەم بنەما و راسپاردانەی خوارەوە سنووردار کراوە:

**أ- لە راسپاردەکانی قورئان:**

دەبێ بەرگریکردن بەئەندازەی دەستدرێژی بێ، ئەگەر لەوە تێپەڕی بەرگرییەکە دەبێتە دەستدرێژی. خوای گەورە ئەمەی بەدەق باس کردوە و دەفەرموێ: ﴿فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾[1]، لەبەرئەوەی جەنگ بۆ زەرورەتە، زەرورەتیش بەگوێرەی پێویستی دەستنیشان دەکرێ.

**ب- لە راسپاردەکانی پێغەمبەر:**

"غەدر مەکەن، زیادەڕۆیی مەکەن و منداڵ مەکوژن، پیاوانێک دەبینن لە پەرستگەدا گۆشەگیر بوون لە خەڵک دەستیان بۆ مەبەن، ئافرەت و منداڵ و گەورەیەکی بەسەرچوو مەکوژن، دارخورما مەسوتێنن و درەخت مەبڕنەوە و ماڵ مەڕوخێنن"[2].

**ج- لە راسپاردەکانی خەلیفەی یەکەم ئەبوبەکری سدیق ( خوا لێی رازی بێ ):**

"خیانەت مەکەن، غەدر مەکەن، نە منداڵێکی بچوک، نە پیرێکی بەساڵاچوو و نە ئافرەتێك مەکوژن، دارخورمایەك نەزۆك مەکەن و مەیسوتێنن، درەختێکی بەردار مەبڕنەوە، نە مەڕێك و نە مانگایەك و نە وشترێکسەرمەبڕن"[3].

---

[1] البقرة: ١٩٤.

[2] تاريخ بغداد، للخطيب البغدادي: ٢٩٦/٤، وتاريخ الطبري:٢٤٦/٢، والبداية والنهاية، للحافظ ابن كثير: ٢٢٠/٥.

[3] تاريخ بغداد، للخطيب البغدادي: ٦٧/١٣، والبداية والنهاية، للحافظ ابن كثير: ٢٢٠/٥.

**د- له راسپاردەکانی خەلیفەی دووەم عومەری کوڕی خەتاب ( خوا لێی رازی بێ ):**

"من فەرمان بەخۆت و سەربازەکانت دەکەم بەوەی لە هەموو بارێکدا لە خوا بترسن، لەبەرئەوەی لەخواترسان باشترین کەرەستەیە دژی دوژمن و بەهێزترین پیلانە لە جەنگدا. فەرمان بە تۆ و ئەوانەی لەگەڵتن دەکەم زیاتر لە خۆپاراستنتان لە دوژمن خۆتان لە گوناه بپارێزن، چونکە گوناهەکانی سوپا لە دوژمنەکەیان مەترسیدارترە بۆیان. موسڵمانان بەسەرپێچیکرنی دوژمنەکەیان لە خوا سەردەکەون، ئەگەر وانەبوایە دەرەقەتیان نەدەهاتین، چونکە نە ژمارەمان وەك ژمارەیانە و نە کەرەستەی جەنگمان وەك هی ئەوانە. جا ئەگەر لە سەرپێچیشدا یەکسان بووین، ئەوان لە رووی هێزەوە لە ئێمە باشتر دەبن"[1].

**هـ- له راسپاردەکانی خەلیفەی چوارەم عەلی کوڕی ئەبوتالیب ( خوا لێی رازی بێ ):**

"دەخیلت بم لە خوێنرشتنی بەناهەق، چونکە هیچ شتێك نیە وەك بەناهەق رشتنی خوێن لە تووڕەیی نزیکتر و بەرپرسیارێتی گەورەتر و بۆ نەهێشتنی نیعمەت شایستەتر بێ، بۆیە دەسەڵاتی خۆت بە خوێنرشتن بەهێز مەکە، چونکە ئەو کارە (دەسەڵات) لاواز و کز دەکا، بگرە نایهێڵێت و دەیگوێزێتەوە".

**سێیەم: ئەو کانزانەی لە ناخ و دەرەوەی زەویدان لە فلزی و نافلزیەکان خوا بۆ هەموو نەوە لەدوای یەکەکانی دروست کردوون.**

بۆیە هەر نەوەیەك دەبێ بەئەندازەی پێویستی خۆی لێیان ببات. هەر زیادەڕەوییەك لە دەرهێنان و بەکارهێنانیدا دەستدرێژیکردنە بۆ سەر مافی نەوەکانی ئاییندە و سەرپێچییە لەو گوتارەی خوای گەورە ئاراستەی هەموو نەوەکانی کردوە و دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذي خَلَقَ لَكُمْ ما في الأَرضِ جَميعاً﴾ .

---

[1] تاريخ بغداد، للخطيب البغدادي: ١٣/٦٧، والبداية والنهاية، للحافظ ابن كثير: ٥/٢٢٠.

**چوارەم: زیادەی هەر گەلێك پێویستە بۆ گەلانیتری هەژار بگوێزرێتەوە:**

ئەمیش بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی خوا کە دەفەرموێ ﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾[1] کرێنی چەك لەلایەن مرۆڤەوە بۆ بەرکارهێنانی دژی برا مرۆڤەکەی، هاوکاریکردنە لەسەر گوناه و دەستدرێژی.

خوای گەورە ئێمەی کردوە بە کۆمەڵێ گەل و هۆز بۆ یەکتر ناسین و هاوکاری و هەرەوەزی و دۆستایەتی. وەك خوا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا﴾[2] . یەکترناسییش هاوکاریکردنە لەسەر چاکە و تەقوا.

---

[1] المائدة: ٢.

[2] الحجرات: ١٣.

کەسانی مافخوراو و ماف زەوتکراو وەك بەڵگەنەویشت و بەبەرچاو و گوێی دنیاوە ئەوەیان بۆ ساغ بووەتەوە، کە گەرەنتیی مافەکانی مرۆڤ نە جاڕنامەکانی مافی مرۆڤ و نە میساقی نەتەوە یەکگرتووەکان و نە دەستووره وەزعیەکانی دەوڵەتانی دنیا و نە ڕێبازە فەلسەفییە کۆن و نوێکان و نە تیۆرە یاساییەکان و نە ئەو کۆنگرە و سیمینارانەی ساڵانە بەناوی مافی مرۆڤەوە دەبەسترێن و نە ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکانن، لەبەرئەوەی ئەم ئامرازانە تائێستا بەشێکی کەم نەبێ لەو مافانەیان بەدینەهێناوە. هێشتا مافەکانی چەوساوانی سەر زەوی لە تاك تاكە و گەلان لەژێر پێی بەهێزەکاندا دەشێلرێن و هێشتا یاسا وەك سوقرات دەڵێ "ئەوەیە کە بەدڵی بەهێزترینە".

چەند ماف بەناوی یاساوە زەوت دەکرێ و چەند ماف بەناوی بەرگری لە مافەکانی مرۆڤەوە بەفیڕۆ دەدرێ وەك ڕۆژانە لە جیهاندا دەیبینین و دەیبیستین. ڕەفتارە نامرۆڤانەکانی هەندێ دەوڵەتی بەهێز دژی چەوساوانی سەر زەوی بەناوی بەرگریکردن لە مافی مرۆڤ و بەدیهێنانی دیموکراسیەوە پاساو دەدرێ. ئەگەر مرۆڤایەتی نەگەڕێتەوە بۆ بەکارهێنانی وزەی ڕۆحی بۆ گەرەنتیکردنی مافەکان و پابەندبوون بە ئەرکەکان، دۆخی نێودەوڵەتیش بەم شێوەیە دەمێنێتەوە و دۆخی مافەکانی هەندێ گەل ڕۆژانە لە خراپەوە بۆ خراپتر پەرە دەسێنێ. وزە ڕۆحیەکان تاکە ئامرازن کە دەستەبەری مافەکانی مرۆڤ دەکەن و ویژدانی بەرەو جێبەجێکردنی خۆویستانەی پابەندیەکانی بەرانبەر کەسانیتر دەبزوێنن، بەبێ ئەوەی وزەی مادی بۆ ناچارکردنی بەو کارە، بەکار بهێنرێ.

کەواتە وزەی ڕۆحی چییە و قۆناغەکانی بەدەستهێنانی چین، سەرچاوەکانی چین و ڕۆڵی لە دەستەبەرکردنی مافەکانی مرۆڤدا چییە؟ لەم چوار باسەی خوارەوەدا وەڵامی ئەم چوار پرسیارە دەدەینەوە.

# باسی یەکەم:
# وزەی رۆحی

ئەگەر مرۆڤ بەم گەردوونە مەزنە بەراورد بکەین، کە بەشێکی زۆر بچوکی پێکدێنێ، لە قەبارەدا بچوك دەبینین بەڵام لە بیرکردنەوە و لێبڕان و پلاندانانی بۆ رێبازی ژیانی مرۆڤایەتیدا گەورەیە، لە بنیاتە جەستەییەکانیدا لاوازە، بەڵام لە بەرهەمهێنانی پێویستیەکانی بەرگریکردنی لە مانەوە و بەردەوامبوونی ژیانیدا، بەهێزە.

ئەگەر لە رووی خود و پێکهاتەی کەسیەوە تەماشای مرۆڤ بکرێ، دەردەکەوێ وەك دەوڵەتێکی سەربەخۆی خاوەن سەروەریی تەواو و لەسەر پێی خۆ وەستاو وایە، سەرۆکێکی هەیە ئەویش عەقڵە، دەزگای ئاسایش و موخابەراتی هەیە کە پێنج هەستە دیارەکەن، سوپا و هێزێکی بەرگری هەیە کە دەست و پێکان و زمانە، کۆگایەك زانیاریی وێنایی و تەسدیقی هەیە بەمەبەستی بەدەستهێنانی نەزانراوی وێنایی و تەسدیقی لەرێگەی سەرنجدان وبیرکردنەوەی دروستەوە.

ئەم سەرۆکە (عەقڵ) دوو راوێژکاری هەیە یەکێکیان نەزعەی شەڕخوازانەیە کە لە دەروونی خراپخوازدا خۆ دەنوێنێ، دووەمیشیان نەزعەی خێرخوازیی فریشتانەیە. کاری نەزعە شەڕخوازەکە ئەوەیە عەقڵ هەڵبنێ تا دەوڵەتەکەی بەرەو رێڕەوی شەڕ و رەفتاری تاوانکارانەدا ببات، لەکاتێکدا کاری نەزعە خێرخوازیەکە هاندانی عەقڵە بۆ ئەوەی دەوڵەتەکەی بەرەو رێبازی بەدیهێنانی سوودی گشتی و تایبەت ببات و

بەختەوەریی تاك و كۆمەڵگە دەستەبەر بكا. بەم شێوەیە ئەم دوو نەزعەیە لە ململانێدا دەبن تا یەكێكیان بەسەر ئەویتریاندا زاڵ دەبێ. سەركەوتنی نەزعەی خێر بەسەر نەزعەی شەڕدا پێی دەوترێ "وزەی ڕۆحی" كە قورئانی پیرۆز ناویناوە "تەقوا"، خوای گەورە ئاماژە بەم ڕاستییە دەكا كاتێ دەفەرموێ: ﴿وَالْأَرْضِ وَمَا طَحَاهَا، وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا، فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا، قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا، وَقَدْ خَابَ مَنْ دَسَّاهَا﴾[1]. مەبەست لە (الفجور) ئاماژەدانە بۆ نەزعەی شەڕ، مەبەست لە (التقوى)یش نەزعە خێرخوازانەكەیە.

فەیلەسوف و بیرمەندان بیروڕای جیاوازیان لەبارەی ئەوەی ئایا مرۆڤ بەسروشت خێرخوازە یان شەڕخواز، هەیە؟ هەندێكیان هاوڕان لەگەڵ ئەوەی لە قورئاندا هاتووە، لەوانە فەیلەسوفی فەرەنسی (لیفی بریل) كە دەڵێ: "ئەو مەیلە جوان و ناشیرینانەی لەكاتی لەدایكبوونماندا دەیانهێنین بۆ ئەم دنیایە، سروشتمانە". هەیشیانە دەڵێ "سروشتی مرۆڤ لەسەر خێر سازاوە، بەڵام بەهۆی فاكتەرگەلی سەرهەڵداو ڕەفتاری خراپ هەڵدەبژێرێ، وەك فاكتەرە مادییە (سروشتی)، یان ئەنسرۆپۆلۆژی (تاكەكەسی)، كۆمەڵایەتی یان بۆماوەكان یان هیتر كە دەیخەنە ژێر دێوەزمەی شەهوەتەكان و ملكەچی دەسەڵاتی ئارەزووەكانی دەكەن. یەكەم كەس ئەم رایەی دەربڕی فەیلەسوفی یۆنانی سوقرات[2] بوو.

هەندێ فەیلەسوفیش پێچەوانەی ئەو ئاراستەیان گرتووە، وەك یەسوعیەكان، كە پێیان وایە فیترەتی مرۆڤ لەسەر شەڕ و خراپە سازاوە و بەسروشت خراپە. خۆ ئەگەر ڕێگەی خێری گرتەبەر ئەوە لەبەر هۆی دەرەكییە.

لەڕاستیدا مرۆڤ بە سروشت نە خێرخوازە و نە شەڕخواز، بەڵكو ئەوان لەنێوان جیهانی فریشتە (مەلائیكە) و ئاژەڵدایە، كە یەكەمیان تەنها هەڵگری وزەی خێرن و

---

[1] سورة الشمس / ٧-١٠.

[2] ٤٦٩-٣٩٩ق.م.

شایستەی پاداشت نین لەبەرئەوەی لەسەر ئەوە خولقاون، ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنْفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾[1]. هەرچی دووەمیانە جێی بەرپرسیارێتی نیە کە عەقڵە و تەنها هەڵگری نەزعەی شەڕە، وەك گورگ کە لەسەر خراپەکانی سزا نادرێ لەبەرئەوەی بە شەڕ ناچار کراوە.

لەم روانگەوە مرۆڤ بەسروشت و بەپێی خیلقەتی، وزەیەکی مەلەکوتی هەیە کە هەمیشە بەرەو خێر پاڵی دەنێ، هاوکات دەروونێکی ئاژەڵانەی شەڕخوازیشی هەیە کە فەرمانی بە خراپە پێ دەکا. کاتێك مرۆڤ لەدایك دەبێ ئامادەیی بۆ خێر و شەڕیشی لەگەڵ لەدایك دەبێ. فاکتەرە سەرهەڵداوەکانن کە تای لایەکیان بەسەر ئەویتریاندا زاڵ دەکەن. کاتێك مرۆڤ وزەی رۆحی هەبێ، نەزعەی خێر تێیدا بەسەر نەزعەی شەڕدا سەردەکەوێ.

---

[1] سورة التحريم/٦.

# باسی دووەم:
# قۆناغەکانی بەدەستهێنانی وزەی رۆحی

ئەوە روونە کە مرۆڤ لە سەرەتای دروستبوونیەوە تا کۆتای ژیانی بە چوار قۆناغدا تێدەپەڕێ، قۆناغی دروستبوون، قۆناغی شیرەخۆری، قۆناغی دایەنی و قۆناغی پاش باڵقبوون و پێگەیشتن.

## قۆناغی دروستبوون (التكوين):

یەکەمین سەرەتاگە بۆ دروستبوونی مرۆڤ هاوسەرگیرییە، کە پەیمانێکە نەك گرێبەستێك، بگرە پەیمانێکی قورسە وەك خوا دەفەرموێ ﴿وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُ وَقَدْ أَفْضَى بَعْضُكُمْ إِلَى بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنْكُمْ مِيثَاقًا غَلِيظًا﴾[1] . بەگوێرەی ئەم پەیمانە ژن و مێرد کۆمپانیایەکی رۆحی دادەمەزرێنن کە سەرمایەکی خۆشەویستی و رێزگرتنی دووسەرە و ئۆقرەیی و رەحم و دۆستایەتیە، وەك خوا دەفەرموێ ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾[2]. قازانجی ئەم کۆمپانیایە بەرهەمهێنانی نەوەیەکی نوێی چەکدار بە وزەی رۆحییە بۆ بەشداریکردن لە پێکهێنانی شارستانێتیەك خزمەتی تاك و کۆمەڵ بکا.

---

[1] سورة النساء/٢١.

[2] سورة الروم/٢١.

دیاره هەر هەڵبژاردنێك پێوەرێكی هەیە، پێوەری هەڵبژاردنی شەریكی ژیان لەلایەن پیاوێكەوە و قبوڵكردنی ئەو شەریكە لەلایەن ئافرەتەكەوە، بەزۆری یان ماڵ و سامانە لەبەرئەوەی سامان ئامرازی بەدەستهێنانی پێویستیەكان و تێركردنی حەزەكانە، یان رەچەڵەكە لەبەرئەوەی خەڵك خۆیان بە شانازیەكانی باوباپیرانیانەوە هەڵدەكێشن، یان جوانییە لەبەرئەوەی جوانی لە هەموو شتێكدا داواكراوە بەتایبەت لە هاوسەرگیریدا. یان ئەخلاقە، لەبەرئەوەی گەلان رەوشت (اخلاق)ـە و ئەگەر رەوشتیان نەما خۆیشیان نامێنن.

كەواتە دەبێ لەكاتی هەڵبژاردندا كار بە چ پێوەرێك بكرێ؟ كام لەم چوار پێوەرە لەتەك بەدەستهێنانی وزەی رۆحیدا دەگونجێ؟ پێغەمبەری مەزنﷺ وەڵامی ئەمەی داوەتەوە و دەفەرموێ:(تنكح المرأه لاربع، لمالها، ولحسبها، ولجمالها، ولدينها، فاظفر بذات الدين تربت يداك)[1]. فەرمانی كردوە دەست بە پێوەرە ئەخلاقیەكەوە بگیرێ كە لە ئاین و عەقیدەی راستەوە هەڵقوڵیوە و فەرموی پێویستە خاوەن ئەخلاق و دینەكە هەڵبژێریت ئەگینا دەستت خۆڵین دەبێ، واتە بەخۆڵ پیس دەبێ. ئەم قسەیەیش ئامازەیە بۆ زەبونی لە ژیانی هاوسەریدا ئەگەر هاتوو لەپێناو ماڵ یان جوانی یان رەچەڵكدا قوربانی بە ئەخلاق درا.

### قۆناغی شیرەخۆری:

خوای گەورە روو بە دایكان دەفەرموێ: وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا لَا تُضَارَّ وَالِدَةٌ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوْلُودٌ لَهُ بِوَلَدِهِ وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا

---

[1] متفق عليه بين الشيخين مسلم والبخاري. واتە ئافرەت لەبەر چوار شت دەخوازرێ: لەبەر سامانەكەی، لەبەر رەچەڵەكەكەی، لەبەر جوانیەكەی، لەبەر ئاینەكەی، كەواتە خاوەن ئاینەكە هەڵبژێرە دەستت خۆڵین ببێ.

عَنْ تَرَاضٍ مِنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا وَإِنْ أَرَدْتُمْ أَنْ تَسْتَرْضِعُوا أَوْلَادَكُمْ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُمْ مَا آتَيْتُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾[1] .

فەلسەفەی ئەم داوایە ئەوەیە دایك ئەگەر عوزرێكی مەشروعی نەبوو خۆی شیر بداتە منداڵەكەی، نەك تەنها بۆ چاودێریكردنی لایەنی تەندروستی، بەڵكو وەك پزیشكەكان دەڵێن بۆ لایەنی رۆحیش گرنگە، تا دایك لە دانانی بەردی بناغەی تەلاری وزەی رۆحیدا بەشدار بێ.

رووی بەشداریكردن: ئەوەیە كاتێك دایك منداڵەكەی لە كۆشیدا دادەنێت تا شیری خۆی بداتێ و مەمكی دەخاتە ناو دەمی، رووبەڕووبوونەوەی رۆحیی نێوانیان تیشكی سۆز و ناز و خۆشەویستی دایكەكە بەسەر منداڵەكە پەخش دەبێ. وەك چۆن خۆراك دەداتە جەستەی تا خانە مادیەكانی دروست ببن، بە وزەی رۆحی خۆراك دەداتە رۆحیشی و لێرەوە ناوكی ئەو وزەیە دروست دەبێ. كاتێك ئەم منداڵە هەراش دەبێت و پێ دەنێتە شەڕی ژیانەوە و لەگەڵ هاوجۆرەكانی كارلێك دەكا، بەرهەمی ئەم وزەیە لە ناز و سۆز و بەزەیی و خۆشەویستیدا بۆ ئەوانیش دەگوێزرێتەوە، بەو هۆیەشەوە هاوكاری و هەرەوەزی و دەستبار لەنێوانیاندا دێتە كایە لەپێناو خێر و خۆشیی هەموولادا. هەربۆیە هەمووان بەراستگۆیی و ئەمانەت و دڵسۆزی بەشداری لە پەرەپێدانی ژیان و شارستانێتییان و جێبەجێكردنی ئەركەكانیان بەرانبەر ئەویتر و كۆمەڵگە دەكەن.

بەپێچەوانەوە، ئەو منداڵەی شیری دایكی خۆی نادرێتێ و لە پەنایەكدا دوور لە نازی دایكی بەتەنیا بەجێدەهێڵرێ، هەست بە نەهامەتی و بێبەشبوون دەكات و خۆی بە كەسێكی چارەنەویستراو دێتە پێش چاو. لێرەوە ناوكی ئەوەی پێ دەوترێ گرێی دەروونی تێدا دروست دەبێت و كاتێك لەگەڵ كەسانیتر تێكەڵ دەبێ، دەرەنجامە

---

[1] سورة البقرة/٢٣٣.

نێگەتیڤەکانی بەسەر ژیانی کۆمەڵگەدا ڕەنگ دەداتەوە. ئەمە ئەسڵە و هەمو ئەسڵ و ڕێسایەکیش هەڵاوێردراوی هەیە.

## قۆناغی دایەنی:

ئەمە مەترسیدارترین قۆناغە مرۆڤی پێدا تێدەپەڕێ، لەبەرئەوەی لەم قۆناغەدا وەك هەویر وایە هەموو شێوە ڕەفتارێك لە چاك و خراپ وەردەگرێ. لەم قۆناغەدا تۆوی خێر و شەڕ، خۆشەویستی و ڕق، خۆشی و خەم، ئاسایش و ترس، حەزلێکردن و هەڵاتن و.. هتد لە دڵی منداڵدا دەچێنرێ. لەم قۆناغەدا منداڵ توانای بیرکردنەوە و شیکاری و هۆسازی و ئەنجامگیری و هەڵبژاردنی باشەی نیە، بەڵکو ڕۆڵی تەنها لاساییکردنەوە و شوێنپێهەڵگرتنە لەناو خێزان و گەڕەك و قوتابخانە و ئەو شوێنانەدا.

بەرپرسیارێتیی چارەنووسی ئەو منداڵەیش لە چاك یان خراپبوونی، لەوەی ببێتە توخمێکی بەسوود لە کۆمەڵگەکەیدا، یەکەم دەکەوێتە ئەستۆی دایك و باوکی، بەپلەی دووەمیش ئەستۆی مامۆستاکەی. دەبێ ئەوان سەرمەشقێکی باش بن بۆی. خێزان ناوکی کۆمەڵگە و خانەیەکە لە خانەکانی پێکهاتنی، ئەگەر باش بوو کۆمەڵگەیش باش دەبێت و خێر و چاکە زاڵ دەبن، خۆ ئەگەر خراپ بوو کۆمەڵگەیش خراپ دەبێت و خراپە و بەدکاری زاڵ دەبن. خوای گەورە بە باوك و دایکان دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنْفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾[1]. ئاگری وێرانبوونی وزەی ڕۆحی تەنها تاك و خێزانەکەی ناگرێتەوە، بەڵکو تەواوی کۆمەڵگە و بگرە ئۆمەتیش دەگرێتەوە. پێویستە مامۆستا لە قوتابخانە بەر لەوەی فێرکەر بێ پەروەردەکەر بێت و نموونەیەکی جوان بێ بۆ قوتابیەکانی. پێویستە بەر لەوەی بۆ گرتنەئەستۆی پیشەی فێرکردن ئامادە بێ، خاوەنی وزەی ڕۆحی بێ.

---

[1] سورة التحريم/٦.

## قۆناغی پاش باڵقبوون و پێگەیشتن:

لەم قۆناغەدا مرۆڤ پێدەنێتە دۆخی بێنیازبوون لە دەسەڵات و سەرپرسیی کەسانیتر و ئیتر پشت بەخۆی دەبەستێ و ئەنجامی تەواوی رەفتارە رەوا و ناڕەواکانی دەگرێتە ئەستۆ. لەبەرئەوە پێی دەوترێ بەرپرس (مکلف) و ئیتر داوای شاندانە ژێر جێبەجێکردنی ئەو پەیامەی لێدەکرێ کە لەپێناویدا خەلق کراوە، ئەویش ئەو ئەمانەتەیە کە خرایە بەردەم ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان، بەڵام ئەوان سەرباری هێز و قایمی و گەورەیی قەبارەیان رازی نەبوون شانی بدەنە ژێر، ئەویش لەبەر قورسی ئەمانەتەکە و مەترسیداریی ئەو بەرپرسیارێتییە، بەڵام مرۆڤ هەڵیگرت وەك خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَنْ يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الْإِنْسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا﴾[1]..

دیارە مەبەست خستنەبەردەمی راستەقینە نیە لەبەرئەوەی بونەوەرە بێگیانەکان ئەهلیەتی ئەوەیان نیە ئەو داوایەیان لێ بکرێ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە ئەگەر عەقڵ و دەرك و ئیرادەیان هەبووایە رازی نەدەبوون هەڵیبگرن. مەبەست لە (فأبین)ەیش (واتە: رەفزیان کرد) یاخیبوون نیە، بەڵکو مەبەست رازینەبوونی عوزرخوایی و ترسانە لە جێبەجێکردنی ئەمانەتەکە بەهۆی مەترسیداریەوە. مرۆڤیش ئەمانەتەکەی هەڵگرت لەبەرانبەر رێزلێنانی بە پێبەخشینی تایبەتمەندیی عەقڵ کە بەهۆیەوە لە سەرجەم بونەوەرەکانیتر تاکی دەکاتەوە و بەسەر باقیی مەخلوقاتدا هەڵیدەبرێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا﴾[2].

---

[1] سورة الاحزاب/٧٢.

[2] سورة الاسراء/٧٠.

**مەبەست لە ئەمانەت چییە؟**

وشەی ئەمانەت لەم ئایەتە پیرۆزەدا مانایەکی گشتی و هەمەگیری هەیە، هەموو پیشەیەك ئەمانەتە، وەك پیشەی فێرکردن و پزیشکی و ئەندازە.. وەك پیشەی درومان و دارتاش و ئاسنگەر و بەڵێندەر و هیتر. هەموو دەسەڵاتێك ئەمانەتە وەك دەسەڵاتی سەرۆکی دەوڵەت و سەرۆکی فەرمانگەکان و دەزگا و دامەزراوە گشتیەکان و دەسەڵاتی قەزا و دەسەڵاتی باوکایەتی و دەسەڵاتی دایکایەتی و هاوشێوەکانیان. راستبێژی لە قسەکردندا ئەمانەتە، دڵسۆزی لە کاردا ئەمانەتە، هاوکاری و هەرەوەزی و دەستبار لەگەڵ کەسانیتر ئەمانەتە. هەرچی بچێتە خانەی پەرەپێدانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و تەندروستی و کەلتوری ئەمانەتە. هەرچی بەشداری لە بەدیهێنانی بەختەوەریی مرۆڤ و پەرەپێدانیدا هەبێ ئەمانەتە. هەرچی بانگەشە بۆ ئاشتی و ئاسایشی جیهانی بکات ئەمانەتە و...هتد.

هەروەها دوورکەوتنەوە و خۆلادان لە هەر ئەزیەتدانێکی تاك و کۆمەڵگە و لە هەر رەفتارێکی تاوانکاری کە زیان بەویتر بگەیەنێ ئەمانەتە. دەستدرێژینەکردن بۆ سەر سەروەری و مافی ئەویتر ئەمانەتە، پابەندبوون بە پەیماننامە و رێکەوتنامەکانی نێوان دەوڵەتان ئەمانەتە و پێویستە هەموو ئەمانەتپارێزێك پێیانەوە پابەند بێ، لەبەرئەوەی ئەوە فەرز و ئەرکێکی ئاینی و مرۆڤیی و ویژدانییە، وەك خوای گەورە فەرمانی کردوە ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ أَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُمْ بِهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾[1].. ئەگەر هەر کەسێك لەجێگەی خۆیەوە بەشێکی کەم لە ئەمانەتی گەردنی جێبەجێ بکردایە، خێزانی مرۆڤایەتی لە هەموو کات و شوێنێکدا لە ئامێزی شارستانێتی و ئاسایش و سەقامگیری و لوتکەی بەختەوەریدا دەژیان. تاکە بزوێنەریش کە پاڵ بە مرۆڤەوە بنێ بۆ جێبەجێکردنی ئەمانەت بریتییە لە وزەی رۆحی.

---

[1] سورة النساء /٥٨

**بۆچی خوای گەورە مرۆڤی بە ستەمكار و نەزان ( ظلوم وجهول ) وەسف كردوە بەهۆی هەڵگرتنی ئەو ئەمانەتەوە؟**

وەڵام روونە، ئەویش ئەوەیە مرۆڤ ستەم لە خۆی و خێزان و كۆمەڵگە و تەواوی ئوممەت دەكا ئەگەر هاتوو كەلێنی خستە پابەندبوونی بە بەجێگەیاندنی ئەمانەتەكەی. هاوكات جاهیلە و نازانێ لەئەنجامی پابەندنەبوونی بە ئەمانەتپارێزیەكەی لە ئایندەدا چ بەدبەختی و نەهامەتی و كۆست و نەگبەتیەك تووشی خۆی و كەسانیتر دەبێ.

# باسی سێیەم:
# سەرچاوەكانی وزەی رۆحی

سەرچاوەكانی وزەی رۆحی بریتین لە لەو بیروباوەڕ و عیبادەتانەی خراونەتە سەر شانی مرۆڤ و پێیان دەوترێ مافەكانی خوا، لەبەرئەوەی سوودیان گشتییە بۆ هەموو مرۆڤایەتی بەچاوپۆشین لە جیاوازیی ئاین یان مەزەب یان رەنگ یان كات و شوێن. بەستنەوەی ئەم مافانەیش بە خواوە لەبەر گشتیبوونی سوودیانە بۆ هەموو مرۆڤ لەبەرئەوەی خوا لەم مافانە و سوودلێبینینیان رەهایە. ئەو خالقەی گەردوونێكی خەلق كردوە هێشتا عەقڵی زانایانی بۆشایی ئاسمان حەیرانە كە لە كوێ دەست پێدەكات و لەكوێ كۆتایی دێ، پێویستی بەو مافانە نابێ. ئەگەر مرۆڤایەتی هەموو كاتی خۆی تا ئەوكاتەی هەسارەی زەوی ماوە لە پەرستن و كڕنوشبردن بۆ خوادا بەسەر ببات، تۆسقاڵێك لە مەزنیی خوا زیاد ناكا. بەپێچەوانەیشەوە ئەگەر لە زەندەقە و ئیلحاد و گومڕاییدا بەسەری ببات تۆسقاڵێك لە مەزنیی خوا كەم ناكا.

مافەكانی خوا كە سەرچاوەی وزەی رۆحین، هەندێكیان بیروباوەڕ (معتقد) و هەندێكیان عیبادەتن، عیبادەتەكانیش هەندێكیان جەستەیی رووت و هەندێكیشیان

دارایـی رووتـن، هەیشـیانە جەسـتەیی و داراییـە پێکـەوە. وەك لـە خـوارەوە روون کراوەتەوە:

### أ- بیروباوەڕەکان:

بیروباوەڕ بریتییە لە باوەڕ بەخوا و ئەو لقانەی لێی دەبنـەوە لـە بـاوەڕ بـە بـاقیی شتە غەیبییەکان. ئیمان یەکـەمین سـەرەتاگەی مرۆڤـە بـەرەو گەشـە و پێشـکەوتن و پەرەسەندن لە هەردوو بواری رۆحی و مادیدا. جەستە بـەبێ ئیمـان وەك پەیکـەرێکی بێگیانە. ئەوەی ئیمـانی نیـە پابەنـدی نیـە و ئـەوەیش پابەنـدی نیـە ئەمانـەتی نیـە، ئەوەی ئەمانەتی نیە بۆ ئەوە ناشێ نە ئەندامی کۆمەڵگە بێ و نە شایانی ئەوەیە هـیچ بەرپرسیارێتیەك بگرێتە ئەستۆ.

ئیمانی راسـت و دروسـت لـە وزەیـەکی رۆحـی پێکـدێ کـە چـاودێری کرێکـار لـە کارگەکـەی، جوتیـار لـە مەزراکـەی، فەرمانبـەر لەسـەر کارەکـەی، مامۆسـتا لـە قوتابخانەکەی، سەرباز لـە گۆڕەپـانی شـەڕ، دایـك لـە ماڵەکەیـدا، دەسـەڵات لـەکاتی مومارەسەکردنی بەرپرسیارێتیەکانیدا، دەکا.

### ب- لە عیبادەتە جەستەییە رووتەکان نوێژ و رۆژووە:

١- پەیوەندیی نوێژ بە وزەی رۆحیەوە: نوێژ قوتابخانەیەکـە بـۆ رێکخسـتنی کـات. کاتیش پـاش ژیـان بـەنرخترین شـتی مرۆڤـە. رێکخسـتنی کـات و دابەشـکردنی بەسەر کارەکاندا و نەفەوتاندنی لـە گرنگرتین هۆکارەکـانی سـەرکەوتنی تـاك و کۆمەڵگەن لە هەموو سـەردەمێکدا. پێشـکەوتنی شارسـتانیی هەنـدێ دەوڵـەتی پێشکەوتوو بۆ رێکخستنی کات دەگەڕێتەوە.

نوێـژ کارگـەی بەرهـەمهێنانی وزەی رۆحییـە، بـەهێزترین ئـامرازی بـەهێزکردنی پەیوەندیی نێوان بەندە و پەروەردگاری و گرنگترین هۆکاری پێکهاتن یان بەهێزکردنی وزەی رۆحیە کاتێ مرۆڤ رۆژانە پێنج جار پەیمانی خۆی لەگەڵ خوا تـازە دەکاتـەوە،

که ملکەچی دەستوورەکەی و پەیڕەوی لە فەرمانەکانی دەکا کە بۆ خێری سەرجەم مرۆڤایەتی هاتوون دوور لە قەدەغە و سەرپێچیەکان، کە زیان بە تاك و کۆمەڵگە دەگەیەنن. نوێژ پارێزێکە مرۆڤ لە هەموو رەفتارێکی تاوانکارانە دەپارێزێ وەك خوا دەفەرموێ ﴿إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنْ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ﴾[1].

نوێژ بە گرنگترین رێگەی خۆپاراستن لە رەفتاری تاوانکارانە دادەنرێ بەو مەرجەی بە رۆح و کرۆك و مەغزا و ترس و ملکەچیی خۆیەوە جێبەجێ بکرێت و نوێژوان بچێتە ناو کاکڵەی ئەوەی لە هەر رکاتێکدا بە پەروەردگاری دەڵێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ، إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ، اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ، صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ﴾[2]. بەڵام لەڕاستیدا زۆر لە نوێژوانان وەك لاساییکردنەوە بۆ باوك و دایکیان ئەم ئەمانەتە بەجێدەگەیەنن وەك خووگرتنیان بە جگەرەکێشانەوە، کە بەشکڵ و توێکڵ و خاڵی لە کاکڵە و جوڵەی خاڵی لە مەغزا ئەنجامی دەدەن، هەربۆیە دەبینین نوێژ بەزۆری نوێژوان لە گزی و ناپاکی و درۆ و چاوچنۆکی و پەیداکردنی قازانجی ناڕەوا لەسەر حسابی کەسانیتر ناگێڕێتەوە.

**٢- پەیوەندیی رۆژوو بە وزەی رۆحیەوە:** رۆژوو خولێکی ساڵانەیە بۆ ماوەی مانگێك لەسەر هەموو کەسێکی باڵقی عاقڵ کە بتوانێ هەموو ساڵێك پەیوەندی بەو خولەوە بکات بۆ شەحنکردنەوەی وزەی رۆحیی خۆی و خۆڕاهێنان لەسەر چۆنێتی و چەندێتیی ئەو ئەمانەتەی پێویستە بۆ خۆی و خێزانەکەی و کۆمەڵگەکەی و ئومەتەکەی و تەواوی مرۆڤایەتی جێبەجێی بکا.

رۆژوو تەنیا خۆگرتنەوە نیە لە خواردن و خواردنەوە و سەرجێیکردنی هاوسەری وەك لای زۆر لە رۆژوانان باوە، بەڵکو هەموو ئەندامێك و هەموو غەریزەیەکی ناوەکی

---

[1] سورة العنكبوت/٤٥.

[2] سورة الفاتحة.

رۆژووی خۆی هەیە:

ڕۆژووی زمان خۆگرتنەوەیە لە هەر قسەیەك ئەویتر ئەزیەت بدات، رۆژووی دەست دەستنەبردنیەتی بۆ مافی ئەویتر، رۆژووی پێ، پێنەڕۆیشتنیەتی بۆ ئەنجامدانی تاوان، ڕۆژووی چاو گرتنەوەیەتی لە سەیرکردنی ناموس و ئابڕوی خەڵك. ڕۆژووی غەریزە ناوەکیەکان بەستنەوەیانە لە بەدکاری لە شێوەی خۆپەرستی و لەخۆدەرچوون و ئیرەیی و رق و کینە و جیاکاری. کاتێ خوای گەورە دەفەرموێ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾[1]. مەبەستی ئەم خۆلادان و خۆگرتنەوانەیە. واتە هاوشێوەی ئەوانەی پێش ئێوە ڕۆژووتان لەسەر فەرز کراوە بۆ ئەوەی وزەی رۆحی بەدەست بێنن. تەقوا بریتیە لە وزەی رۆحی. ئەگەر رۆژوان ڕۆژووەکەی بەراستی گرت، وزەیەکی رۆحی لێ بەدەست دێنێ کە پاڵی پێوە دەنێ بۆ ئەوەی پابەندی و مافەکانی گەردنی، چ دارایی بن یان نادارایی جێبەجێ بکا.

## ج- زەکات لە عیبادەتە رووت داراییەکان:

**زەکات و پەیوەندی بە وزەی رۆحیەوە:** زەکات دەرکردنی ڕێژەیەکی سەدییە[2] لە ماڵی دارایی کە بەمەبەستی پڕکردنەوەی پێویستیی هەژار و نەداران لەسەر

---

[1] سورة البقرة/ ١٨٣.

[2] ئەو ماڵانەی زەکاتیان تێدا واجبە و ڕێژەی سەدی زەکاتیان بەم شێوەیە:

١- ئەم بەروبومە کشتوکاڵیانەی دەکرێ قوت بدەن و مرۆڤ پێیان بژی. زەکاتیان دە-یەکە ئەگەر بە کەرەستە ئاودەدران، ئەگینا نیو دە-یەکە.

٢- دراوی کانزایی و کاغەز و پارەی دانراو بۆ گەشەکردن، ڕێژەی (٢.٥٪)ە.

٣- خشڵ و دەفر و پارچەی زێڕ و زیو و هەموو ئەو شتانەی لێیان دروست دەکرێن کە لە کەرەستەی جوانکاری و ماڵی بازرگانی و پشکی کۆمپانیان و ڕێژەی زەکاتیان (٢.٥٪)ە.

٤- سەرمایەی کارگەکان و قازانجەکانیان لە کۆتایی هەر ساڵێکدا، ڕێژەی (٢.٥٪)ە.

←

دەوڵەمەندان فەرز کراوە و ئەگەر هاتوو بە ویستی خۆیان نەیاندا پێویستە دەوڵەت ناچاریان بکا بیدەن، وەك چۆن خەلیفەی یەکەم ئەبوبەکری سدیق هێزی دژی زەکات نەدەران بەکارهێنا و شەڕی لەگەڵ کردن، بگرە بە هەڵگەڕاوە لە دینی دانان. دەسەڵات لە هەموو کات و شوێنێکدا بەرپرسە لە کۆکردنەوەی زەکات و دابەشکردنی بەشێوەیەك ئامانجەکانی بەدیبێنێ. ئەسڵ وایە لە هەموو دەوڵەتێکی ئیسلامیدا وەزارەتی زەکات هەبێ، لەبەرئەوەی لە وەزارەتی ئەوقاف گرنگترە لەم رووانەوە:

**یەکەم**: هەژاری و تاوانە ئابوورییەکان لەناو دەبات یان کەمیان دەکاتەوە، ئەویش لەڕێی تەرخانکردنی بڕێکی باش پارە بۆ هەر هەژارێك کە بتوانێ وەك دەسمایەیەك بۆ بژێویی خۆی و خێزانەکەی وەبەری بێنێ، بەو مەرجەی ئەو وەبەرهێنانە لەژێر چاودێریی دەوڵەتدا بێ. ئەگەر دەوڵەمەندەکان ئازاد بکرێن لە دابەشکردنی زەکاتەکەیاندا، ئەوا زەکات ئامانجی خۆی ناپێکێ، لەبەرئەوەی بڕێکی کەمی ئەوانەی زەکاتیان لەسەر واجبە دابەش دەکرێ بەشێوەیەك سکی برسییان تێر ناکا، لەوانەیشە دەوڵەمەند ئەمین نەبێ لە دابەشکردندا و ئەو هەقەی داواکەران (السائل) و بێبەشان کە لە ئەستۆیدا بەتەواوی دەرینەکا.

**دووەم**: زەکات ئەگەر بەدروستی بدرێ وردە وردە سیستەمی دزێوی چینایەتیی لە کۆمەڵگەدا لەناو دەبات، ئەویش بە بەرتەسککردنەوەی جیاوازیی گەورەی نێوان باری ژیانی دەوڵەمەندان و هەژاران. دەوڵەمەند دادەبەزێت و هەژار بە پلیکانەی ژیانی ئابووریدا هەڵدەزنێ.

---

٥– ئۆتۆمبیل و ئەو کەرەستە و ئامێرانەی بۆ بازرگانی و وەبەرهێنان بەکار دێن لەسەر بنچینەی کەمترین نرخیان لە ماوەی ساڵێکدا و رێژەی (٢.٥٪)ـە.

٦– کرێی عەقارات لە خانوبەرە و هۆتێل و شتی لەو شێوە، رێژەی (٢.٥٪)ە.

٧– ئاژەڵ لە مەڕ و بزن و مانگا و حوشتر کە ساڵیان بەسەردا بێ و بە لەوەڕگا بژین و ئالف نەدرێن و کارنەکەن. زەکاتی ئەمانە بە چەند رێژە و مەرجێکی دیاریکراو وەردەگیرێ، کە لە کتێبەکانی فیقهی ئیسلامیدا روون کراوەتەوە و لێرەدا بواری باسکردنی نیە..

**سێیەم:** جێبەجێکردنی زەکات بەشێوەیەکی دروست وردە وردە بەسەر ملهوڕیی ملهوڕانی دەوڵەمەندا زاڵ دەبێ کە دووچاری نەخۆشی و دەردی بوغرایی بوون وەك خوا دەفەرموێ: ﴿كَلَّا إِنَّ الْإِنْسَانَ لَيَطْغَى أَنْ رَآهُ اسْتَغْنَى﴾[1]. زەکات دڵی دەوڵەمەندان لەم سیفەتە نزمە پاك دەکاتەوە وەك خوا دەفەرموێ: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا﴾[2].

**چوارەم:** کاتێك هەژار هەست دەکا ئەویش پشکێکی لە سامانی دەوڵەمەند هەیە کە لەسەری فەرزە بیدات نەك خێر و پیاوەتی، خۆی بە شەریکی دەوڵەمەند دەزانێ لە ماڵ و سامانەکەیدا کە زەکاتی تێدا فەرز کراوە، بۆیە لەبری ئەوەی ئاواتەخوازی فەوتانی سامانەکەی بێ ئاوات دەخوازێ زیاد بکا. لەباتیی ئەوەی حەسودی پێ ببات و رقی لێی بێ خۆشی دەوێ، لەباتیی ئەوەی دەستدرێژی بکاتە سەر ژیان و ماڵی، هاوکاری لەگەڵ دەکا.

لەم کورتەباسە لەبارەی زەکات ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە ئەم واجبە رۆڵێکی گەورەی هەیە لە راهێنانی مرۆڤ لەسەر جێبەجێکردنی پابەندیەکانی. هەروەها دەردەکەوێ بڵاوبوونەوەی هەژاری و تەشەنەسەندنی تاوان لە هەر کۆمەڵگەیەکدا لە دیمەنەکانی دواکەوتنی کۆمەڵایەتی و شارستانی و ئەخلاقیی ئەو کۆمەڵگەیەن.

## د- حەج و پەیوەندی بە وزەی رۆحیەوە:

حەج پسولەی لێخۆشبوون و کارتی چوونە بەهەشت نیە وەك زۆر کەس گومان دەبەن، بەڵکو کۆنگرەیەکی جیهانییە و نوێنەرانی گەلانی موسڵمان لە سەرتاسەری جیهانەوە بەشداری تێدا دەکەن، بەمەبەستی چارەسەرکردنی کێشە ناوخۆیی و هاوبەشەکانیان لە بواری بەرگری و ئابووری و کەلتوری و تەندروستی و سیاسی و

---

[1] سورة العلق/٦-٧

[2] سورة التوبة/١٠٣.

ئیداری و باقیی پێویستیەکانی ژیان، هەروەها تاوتوێکردنی ئەو کێشانە بە یەك دڵ کە بە وزەی رۆحی دەبزوێ و پاشان چارەسەری گونجاویان بۆ دەخاتە روو و بڕیاری دەستەجەمی لەبارەی بەشداریکردنی هەمووان لە چارەسەریدا هەریەکە و بەپێی توانا و تاقەتی خۆی، دەدرێ. ئیسلام لەپێناو دەستبار و هاوکاری و هەرەوەزیدا سێ کۆبوونەوەی داناوە:

* کۆبوونەوەیەکی رۆژانە بۆ دانیشتوانی هەر گەڕەك یان گوندێك لە نوێژی جەماعەتدا، لەپێناو ئاگەداربوونی هەریەکەیان لە کێشەکانی ئەوانیتر، تا هەموویان پێکەوە بۆ چارەسەرکردنیان هاوکاریی یەکتر بکەن.
* کۆبوونەوەیەکی هەفتانە بۆ دانیشتوانی شار لە مزگەوتێکدا ئەگەر بکرێ، بۆ نوێژی جومعە، تا هەمووان لە کێشەکانی دانیشتوانی شارەکە ئاگەدار بن. پێویستە وتاربێژ لە خوتبەکەیدا بابەتەکانی رۆژ باس بکات و داوا لە هەموولا بکا دەستی هاوکاری و بەشداریکردن لە چارەسەری ئەو کێشانە درێژ بکەن، لەبەرئەوەی جومعە تەنها بۆ یادخستنەوەی ژیانی ئاخیرەت فەرز نەکراوە، بەڵکو پێویستە وتاربێژ هەرچی پەیوەندی بە ژیانی دنیا و ئاخیرەتەوە هەیە باس بکا. یەکەمیشیان (واتە دنیا) پێش دووەمیان (واتە ئاخیرەت) خراوە لە کاتدا لەبەرئەوەی مرۆڤ بەرپرسە وا کار بۆ دنیای بکا وەك ئەوەی هەتاهەتایە دەژی، وایش کار بۆ ئاخیرەتی بکا کە سبەی دەمرێ. ئەمە فەلسەفەی نوێژی هەینییە.
* کۆبوونەوەیەکی ساڵانە لە شاری مەککەی پیرۆز، ئەم کۆبوونەوەیە هەموو گەلانی ئیسلامی بەشداری تێدا دەکەن. لەبەر گرنگیی ئەم کۆبوونەوە (یان کۆنگرە جیهانییە) زێدی دابەزینی وەحی ئیلاهی و هێمای یەکێتیی مرۆڤایەتی (ماڵی خوا) بۆ شوێنی بەستنی دەستنیشان کراوە، بەو مەرجەی هەموو بەیەك پۆشاکەوە بێن ئەویش ئیحرامە کە زۆر لە کفنی مردووان دەچێ، تا بەوە هیچ

جیاوازیەکی چینایەتی یان ڕواڵەتێك لە ڕواڵەتەکانی زنجیرەبەندیی هەرەمی لەنێوان گەورە و بچوك و سەرۆك و خوارۆکدا نەمێنێ.

لەم کەشە بارگاوی بە وزە ڕۆحیەدا، هەموو جیاوازییە نەژادی و چینایەتی و ڕەگەزی و ڕەنگی و مەزهەبی و تایفیەکان لە بۆتەی وزەی ڕۆحیدا دەتوێنەوە، تا بڕیارەکانی کۆنگرەوانان ئیجابی و یەکگرتوو و سەرکەوتوو و تەواو و بۆ هەموو دەوڵەتانیان پابەندکار بێ، بەشێوەیەك هەموو ببنە یەك دەست دژی ئەوەی خراپە لە زەویدا بڵاو دەکاتەوە و دەستی ملهوڕان بەسەر چەوساواندا درێژ دەکا. ئەمە جگە لە هاوکاریکردن لە بوارەکانیتردا، لەپێشیانەوە کێشە ئابووریەکانی گەلانی هەژار، بەوەیش هەرکەسێك ئەمانەتی سەرشانی کە لەپێناو جێبەجێکردنی و وابەستەبوون بە پابەندیەکانی بەرانبەر ئەویتر خولقاوە، رادەپەڕێنێ. ئەمە فەلسەفەی حەج و حیکمەتی واجببوننیەتی. پێغەمبەری مەزنیش هەر بەم شێوەیە ساڵانە فەریزەی حەجی بەجێ دەگەیاند.

# باسی چوارەم:
# وزەی ڕۆحی و
# جێبەجێکردنی خۆویستانەی پابەندیەکان

سـەرەڕای پەرەسـەندنی شارسـتانی و پێشـکەوتنی سیسـتمی نێودەوڵـەتی و پێگەیشتنی یاسادانانە وەزعیەکان و گۆڕانی جیهانی سـەر زەوی بـۆ گونـدێکی بچوك بـەهۆی ئـامرازە تەلـدار و بێتـەل و ئاسمـانی و وشـکانی و دەریاییـەکان و مانگـە دەسـتکردەکان، هێشـتا دیـاردەی نەهامـەتی و چارەڕەشـی و دادڕان و نـاکۆکی و دووبەرەکی و دەستدرێژیی بەهێز بۆ سەر لاواز بەسەر زۆر بەشی جیهاندا زاڵە.

سەلماوە یاسا چەندە پێش بکەوێت و پەرە بسەنێ ناتوانێ دەست بەسـەر دڵـی ئەو مرۆڤەی ملکەچیەتی بگرێ، بەشێوەیەك وابکات ناوەوەیشی وەك دەرەوەی بێ و دووری بخاتـەوە لـە سـیمای نیفـاق و دووڕوویـی، بەشـێوەیەك بـە ویسـتی خـۆی پابەندیەکانی بەرانبەر خێزان و کۆمەڵگە و ئوممەتەکەی و گەلانی دنیا جێبەجێ بکـا. هەروەها سەلماوە سزادان مرۆڤ چاك بەشێوەیەك ناکا، کە بـە ویسـتی خـۆی دڵگـەرم بێ بۆ جێبەجێکردنی پابەندیەکانی بەرانبـەر کەسـانیتر، بـەڵکو سـزادان و بەتایبـەت بەندکردن بۆ ماوەیەکی درێژ کاردانەوەی نەرێنی دەبێت و وا لە بەندکراو دەکا ڕقی لە کەسـانیتر بێتـەوە، بەشـێوەیەك کـاتێ مـاوەی بەندکردنەکـەی تـەواو دەکـا، ئەگـەر دەرفەتی بۆ بڕەخسێتەوە هیچ دوودڵ نابێ لە پەنابردن و گەڕانەوە بۆ سـەر ڕەفتـارە تاوانکاریەکانی. ئەمە بەپێچەوانەی وزە ڕۆحیەکان کە بەشێوەیەکی لاشعوری پاڵ بـە مرۆڤی پابەندەوە دەنێن پابەندیەکانی جێبەجێ بکا.

وزەی رۆحی گرنگیـەکی گـەورەی لـە ژیـانی کرداریـدا هەیـە و کۆمـەڵێ ئـەنجامی ئەرێنی هەیە، گرنگترینیان ئەمانەن:

١- خۆڕازاندنەوە بەو سیفەتە باشانەی پێویستە لە مرۆڤدا هـەبن و دوورکەوتنـەوە لەو سیفەتە خراپانەی پێویستە لێیان دوور بێ. بەوە کۆمەڵگەیەکی چاك و پـاك پێکدێ کە ئاکاری بریتی دەبـێ لـە هاوکـاریکردن لەسـەر چـاکە و هـەرەوەزی و دەستبار و خۆشەویستی و لەیەکترپرسینەوە و یەکگرتوویی.

٢- ملکەچکردن بۆ یاسا و پێوەپابەندبوونی وەك رێزگرتن لە سیستم نەك تـرس لـە سـزادان، بـەوەیش زیادەڕەویـەکان بـۆ سـەر گیـان و مـاڵ و ناموسـی بێتاوانـان نامێنن.

٣- پتەوکردنی پەیوەندیی نێوان گفتار و کردار، هەر قسەیەك لـە کەسـانی خـاوەن وزەی رۆحیەوە دەربچێ، کردەوەشیان بەرجەستەی دەکا.

٤- یەکخستنی کەسایەتیی مرۆڤ و بەسـتنەوەی رواڵـەتی بـە نـاواخنی و بێگـەردیی ناخی و رزگاربوون لە خووی خراپی دووڕوویی کە پێی دەوتـرێ نیفـاق، چـونکە دوودیویی تـاك لـە کۆمەڵگـەدا لـە دوژمنـی ئـەو کۆمەڵگەیـە مەترسـیدارترە. بـۆ نموونە هۆی شکانی موسڵمانان لە شەڕی ئوحود لە سەردەمی ئیسـلامدا بـوونی کەسانی دووڕوو بوو لە ریزی یارانی پێغەمبەردا ﷺ.

٥- دامەزراوی و راساڵی و سەقامگیری لەسەر ئەو پرنسـیپانەی خزمـەتی کۆمەڵگـە دەکەن و بەشداری لە بنیاتنانی شارستانێتی و بەدیهێنانی بەختەوەریدا دەکەن. لە گرنگترین سیفەتەکانی پیاوەتی دامەزراوییە. مرۆڤی دواکەوتوو لەڕووی ئاکـار و شارسـتانیەوە وەك پـەڕە مریشـکێکە بـەدەم رەشـەباوە، کـە بـەدوای بەرژەوەندییە کەسیەکانیدا رارکەیەتی بەبێ ئەوەی هیچ حسابێك بـۆ بـەهاکان و بەرژەوەندیەکانی کۆمەڵگەکەی بکا.

٦- سەروەریی یاسا و چاودێریکردنی دادپەروەری و یەکسانی لە کۆمەڵگەی ساڵحدا لەگەڵ بەرانبەری لە رەخسانی دەرفەتی کار بۆ هەر کەس لـە بـواری شـارەزایی

خۆیدا. بنچینەی هەموو ئەوەیش وزەی رۆحییە. بەهۆی وزەی رۆحیەوە یاسا سەروەر دەبێت و دادپەروەری پەیرەو دەکرێ کە بریتییە لەوەی هەر کەس مافی خۆی پێبدرێ و یەکسانی بەدیبێ، کە بریتییە لە هاوسەنگی لەنێوان ماف و پابەندیەکاندا.

٧- یەکئامانجی و دەرکەوتنی گیانی هەرەوەزی و دەستبار و یەکگرتوویی لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵگە و دووربوون لە ناکۆکی و دووبەرەکی و رزگاربوون لە نیشانەکانی پەرتەوازەیی و توانەوەی دەمارگیریی نەژادی و رەگەزی و رەنگی و مەزەبی و تایفی لە بۆتەی وزەی رۆحیدا.

٨- هاوکاریکردنی نێوان وزەی رۆحی و وزەی مادی بۆ بنیاتنانی ئەو شارستانێتیەی خزمەتی مرۆڤایەتی دەکا، بەختەوەری بۆ تاك دەستەبەر دەکات و یەکگرتوویی بۆ کۆمەڵگە بەدیدێنێ.

٩- وزەی رۆحی پاراستنی مافی خەڵکە، کە بۆ جێبەجێکردنی پابەندیەکانیان دەیانبزوێنێت و لە یەك کەسایەتیدا جۆشیان دەدات، بەشێوەیەك هەریەك هەست بە ئازارەکانی ئەویتر دەکا، وەك پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (مَثَلُ المؤمنين في توادِّهم وتراحُمهم وتعاطُفهم، مَثَلُ الجسدِ، إذا اشتكَى منه عضوٌ، تداعَى له سائرُ الجسدِ بالسَّهرِ والحُمَّى)[1]..

١٠- وزەی رۆحی هەڵگرەکەی دەگۆڕێ بۆ مۆمێك، کە خۆ دەسوتێ تا رێگەی راستی و بەختەوەری لەبەردەم ئەوانیتردا روناك بکاتەوە.

---

[1] صحيح، رواه مسلم، صحيح مسلم (٢٥٨٦). واتە: نموونەی باوەڕداران لە دۆستایەتی و سۆز و بەزەیی نێوانیاندا، وەك جەستە وایە، ئەگەر ئەندامێکی تووشی ئازار بوو، تەواوی جەستەکە لەتاودا شەونخونی دەکێشن و تا دایاندەگرێ.

## پەیوەندیی نێوان وزەی رۆحی و وزەی مادی:

وزەی رۆحی و وزەی مادی دوو پایەن شارستانێتیی مرۆڤایەتیان لەسەر بنیات دەنرێ، دوو جۆرن هەریەکەیان ئەویتریان تەواو دەکات و مرۆڤایەتی بەبێ ئەم دوو پایە بنچینەییە ناتوانێ بەختەوەریەکی راستەقینە بەدیبێنێ.

هەموو شارستانێتیەك کە لەسەر یەکێك لەوانە نەك هەردووکیان بنیات بنرێ چارەنووسی شکست و تێکشکان و وێرانبوونە. قورئانی پیرۆز جەخت لەم راستییە دەکات و پەیوەندیی پتەوی نێوان هەردوو وزەی رۆحی و مادی روون دەکاتەوە و دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِنْ بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ﴾[1] واتە بڕیارماندا و مەزەندەمان کرد کە بەندە سالحەکانم، کە ئەهلی چاکە و چاکسازی و وەبەرهێنان و خاوەن وزەی رۆحین، زەوی بەمیرات دەگرن و ئاوەدانی دەکەنەوە و وەبەری دێنن و پەرەی پێدەدەن و پێکهاتەکانی بۆ سوودی گشتی بەکار دێنن. بێئاگایی موسڵمانان لە دەستور و رۆحی شەریعەتەکەیان بووەتە هۆی جیاکردنەوەی وزەی رۆحی و مادی پاش ئەوەی دینیان لە دەوڵەت جیا کردەوە. ئەوان نازانن یان خۆیان نەبان دەکەن لەوەی ئیسلام ئاینی سروت و کەهەنوت نیە، بەڵکو ئاینی کارە بەر لەوەی ئاینی قسە بێ. قورئان پاش وشەی (الله) هیچ وشەیەکی زیاتر لە وشەی (عمل) و داتاشراوەکانی دووبارە نەکردۆتەوە، کە (٣٥٤) جار لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون.

جا لێرەدە ئەو پرسیارە سەرهەڵدەدا: ئەگەر وزەی رۆحی ئەو گرنگیەی لە بەدیهێنانی مافەکانی مرۆڤ و بەجێگەیاندنی پابەندیەکان و دەستەبەرکردنی بەختەوەریی مرۆڤایەتدا هەیە، ئەی بۆچی جیهانی ئیسلامی لە کاروانی پەرەسەندنی

---

[1] سورة الانبياء /١٠٥

شارستانیی مرۆڤایەتی دواکەوت لەکاتێکدا دەوڵەتانی ناموسڵمانی دنیا و بەتایبەت جیهانی خۆرئاوا و جیهانی خۆرهەڵات تێیدا دەرکەوتن؟

**وەڵامی بەشی یەکەمی پرسیارەکە:**

**بۆچی جیهانی ئیسلامی دواکەوت؟**

کاتێک لای پێشینانی پیاوچاکی ئوممەتی ئیسلامی هاوکاری لەنێوان هەردوو وزەی رۆحی و مادیدا هەبوو، بەیداخی شارستانێتیی ئیسلامی لە سەرتاسەری دنیادا بەرز کرایەوە و حوکمی ئیسلامی لە ماوەیەکی کەمدا جێگەی حوکمی دوو زلدەوڵەتی ئەوکاتەی دنیای گرتەوە، ئەوانیش ئیمپراتۆریەتی رۆمانی و ئیمپراتۆریەتی فارسی بوون، کە هێشتا عەقڵی زانایانی مێژوو لەئاستِ ئەوەی چۆن ئەو موعجیزەیە لەو ماوە کەمەدا بەدیهات، دۆش داماوە. بەڵام کاتێک پاشینان دینیان لە دەوڵەت جیا کردەوە و بەوە وزە رۆحیەکەیان لە وزە مادیەکە جیا کردەوە و موسڵمانان لە پیادەکردنی دەستوورەکەیاندا تەنها نوێژ و رۆژوو و زەکات و حەجیان پەیڕەو کرد، تا خەڵک وایان گومان برد ئیسلام هەر ئەم چوار دروشمەیە، لەکاتێکدا ژمارەی ئایەتەکانی قورئان لە شەش هەزار ئایەت زیاترە و ئەو ئایەتانەی باسی ئەو چوار دروشمە دەکەن لە ژمارەی پەنجەکان تێناپەڕێ (٥٪). بەم شێوەیە ئەو دەستوورە مەزنە وای لێهات لەباتیی ئەوەی بەسەر ژیانی کرداریی زیندووەکاندا جێبەجێ بکرێ، لە مەجلیسی تازیە و لەسەر گۆڕی مردووان دەهۆنرێتەوە. پاشان وزە رۆحییە تاقانەکەیش لای هەموو ئەوانەیش نیە کە لە ناسنامەکەیدا نووسراوە موسڵمان، بەڵکو جەوهەری ئیسلام زیاتر لە جیهانی نائیسلامی جێبەجێ دەکرێ تا جیهانی ئیسلامی.

شێخ محەمەد عەبدە (رەحمەتی خوای لێبێت) کە لە گەورە زانایانی سەردەمی نوێیە دەڵێ "لە ئەوروپا ئیسلامم بینی بەڵام موسڵمانم نەبینی، لەکاتێکدا لە جیهانی خۆماندا موسڵمان دەبینم بەڵام ئیسلام نابینم".

